میهرداد بەهار

# ئاینە ئاسیاییەکان

له فارسییه‌وه: هادی عار





لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی مێژوویی جەمیل ڕۆژبەیانی
٢٠١٥

بەڕێوەبەری دەزگا: بەختیار سەعید
بەڕێوەبەری چاپو بڵاوکردنەوە: سیروان حەمەسەعید

ناوی کتێب: ئایینە ئاسیاییەکان
ناوی نووسەر: میهرداد بەهار
ناوی وەرگێڕ: هادی عارفی
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەممەد
زنجیرە: (١٠)
تیراژ: ٧٥٠ دانە
ساڵی چاپ: ٢٠١٥ - چاپی یەکەم
نرخ: ٦٠٠٠ دینار
چاپخانە: چاپخانەی پەنجەرە - تاران

*لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٢١)ی ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە

mobil: 07701549509
email: sirwansaeed80@yahoo.com
facebook: sirwansaeed



# ئایینە ئاسیاییەکان

میهرداد بەهار
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: هادی عارف

# پێڕست

## پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم کتێبە، کە لە دەقی فارسیی چاپی نۆیەمەوە کراوەتە کوردی، باس لە خواوەند، ئایین و ئەفسانە دێرینەکان لە چاخە جیاوازەکانی مێژوو دەکا، کە بەردەوام گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و زۆریان بەپێی سەردەم و لە قالبێکی نوێدا پەیدا بوونەتەوە و لەلایەن داهێنەرانی ئەو ئایین و خواوەندانەوە، لەنێو خەڵک و شوێنە جیاجیاکاندا بانگەشەیان بۆ کراوە.

دیارە لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەمیشە بە پیرۆزییەکانەوە پەیوەست بووەو بە ڕێگەی رزگاری و هەندێک جاریش بە ڕێگەی نەمریی داناوە، ئایینەکان بەردەوام برەویان هەبووە، بۆ نموونە، مرۆڤ، لە سەرەتاوە، رووداوە سروشتییەکانی بەتووڕەیی خواوەند داناوە و زۆر بە ئاسانی، لە بەرانبەر رووداوە سروشتییەکانی هەورەتریشقە، گێژەڵووکە، با و باران بەچۆکداهاتووە و ئەم دیاردانەی، نەک هەر تەنیا وەک خواوەند و ئەفسانە پەسەندکردووە، بەڵکو بۆ رزگاربوون لە پاشهاتی ئەم دیاردە سروشتییانە و تەنانەت بۆ مسۆگەرکردنی ژیانی هەتاهەتایی، پەنای بۆ کردنە قوربانیی ئاژەڵ و تەنانەت سەربڕینی مرۆڤیش بردووە.

لە ئایینی ریگ ڤیدای هیندییەکاندا، کە ١٧٠٠ ساڵ پێش زایین نووسراوە، باسی نەریتی قوربانیکردن بە چەشنێک بڵاو بۆتەوە، کە زێدەڕۆیی تێداکراوە و لە ئەنجامدا ژن و منداڵ و ئاژەڵیش کراون بەقوربانی. کردنە قوربانیی ئەسپ و چوارپێیان، ئەوەندە بەربڵاو بوو، کە گسکی لە خەزێنەی پاشای هیندییەکان داوە.

لەماوەی شەڕەکانی نێوان رۆمییەکان و پاشای پونت لە باکووری ئاسیای بچووک، سەربازە رۆمییەکان لەگەڵ ئایینی "ما" خواوەندی مەزن ئاشنابوون، کە لەلایەن کەسانێکەوە ستایشکراوە، کە خۆیان بە خزمەتکار و کۆیلەی خواوەند داناوە. دواتر پاشا سۆلای سەرەڕۆ و ملهوڕی رۆمییەکان (١٣٨ ساڵ پێش زایین)، کە خەونی بە خواوەندی جەنگاوەرەوە بینیبوو، بەهۆی بیروباوەڕی بێ بنەماوە، خواوەندی جەنگاوەری هێنایە رۆم.

پەیڕەوانی داخ لە دڵی خواوەندی جەنگاوەر، جلی رەشیان پۆشی و بەتەپڵ و زوڕناوە دەهاتنە نێو کۆڵان و بازاڕەوە، بە قژی درێژەوە، خەریکی

زیکرکردن و سەر راوەشاندن و خۆجەزمکردن بوون. کاتێک سەریان گێژی دەخوارد و دەچووە باری سەرخۆشییەوە، بە تەور و تەشوێ و خەنجەر لە گیانی خۆیان بەر دەبوون و کاتێکیش کە خوێن لە جەستەیان دەهات، زیاتر جەزم دەبوون و خوێنەکەی خۆیان بەسەر پەیکەری خواوەندی جەنگاوەردا دەکرد، یان تەنانەت خوێنی خۆیان دەخواردەوە.

هەروەها خەڵکی فریجی بۆ وشکبوونی گژوگیای سروشت بەرگی رەشیان دەپۆشی و بۆ ژیانەوەی گژوگیا شایی و خۆشیان دەکرد و بەکۆمەڵ دەستیان بەکەیف و رابواردن دەکرد. پاش شایی و خۆشییەکی یەکجار زۆر، هەندێک لە پیاوە ئایینییەکانیان خۆیان بریندار دەکرد و خوێنی خۆیان بەسەر پەرستگەکاندا دەرژاند، لە کاتێکدا کە بەهۆی خوێن لەبەرڕۆیشتنەوە تووشی سەرە گێژە دەبوون، خۆیان لەلای خواوەند ئەدیتەوە. هەندێک جار، لەم جۆرە حاڵەتانەدا، چەند کەسێکیان ئەندامی نێرینەی خۆیان دەبڕی.

ئەمانە چەند نموونەیەکی بچووکی قوربانیکردن و لایەنی وێکچووی ئایینەکانن، لە ماوەی چەند چاخێکی مێژوودا، کە لەم کتێبەدا هەتا رادەیەک باسی لێکراوە، کە زۆربەیان هەتا ئێستاش لەنێو ئایینە جیاجیاکاندا، بە ناوێکی دیکەوە، ماونەتەوە.

هەرچەند ئەم کتێبە، زۆر بە وردی، نەچۆتە سەر بنچینەی دروستبوونی ئایین و نەریت، ئەفسانەو خواوەندەکان لەرەوت و چاخە جیاجیاکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا سەریانهەڵداوە، بەڵام دەکرێ تینوێتیی زۆر کەس لە هۆگرانی مێژووی ئایینە ئاسیاییەکانی وەک "زەردەشتی، مەسیحی، مانەوی و مەزدەکی" بشکێنێت.

لەوەرگێڕانی ئەم کتێبە، هەوڵی زۆرمداوە مانای وشە مێژووییەکان بە کوردی و لەنێو کەوانە، یان لانیکەم بەشێوەی پەراوێز، بنووسمەوەو بۆ ئەمەش لە فەرهەنگی عەمید، و ویکیپیدیای پیدیا و فەرهەنگی ئینتێرنێتی farsilookup فارسیلوکئەپ کەڵکم وەرگرتووە و تەنانەت وێنەی چەند پەیکەرێکیش کە لە ئەنجامی گەڕان بەشوێن سەرچاوەی وشەکان دەستمکەوتوون لەم کتێبەم ئاخنیون، چونکە نووسەر زۆر بەکەمی مانای وشەکانی نووسیوەو لە یەک شوێندا نەبێ، دەنا پەراوێزی بۆ هیچ وشەیەک نەکردووە.

## چەند دێڕێک
## لەبارەی نووسەرەوە

میهرداد بەهار، کوڕی شاعیری ناسراوی ئێران "مەلەکوششوعەرای بەهار" ساڵی ١٩٢٩ی زایینی لە باوەشی دایکێکی کورد، لە شاری مەشهەد چاوی بە ژیان هەڵێنا. ئەفسانەناس و زمانناسێکی بەناوبانگ بوو، پاییزی ساڵی ١٩٩٤ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

ساڵی ١٩٥٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە رشتەی ئەدەبیاتی فارسی لە زانکۆی تاران بەدەستهێنا و ساڵی ١٩٥٩ بۆ درێژەدان بە خوێندن رووی لە وڵاتی بریتانیا کرد. ساڵی ١٩٦٥ی زایینی لە خوێندنگەی زمانە رۆژهەڵاتی و ئەفریقاییەکاندا و لە رشتەی مێژووی دێرین و ناوەڕاستی ئێران بڕوانامەی ماستەری وەرگرت و پاشان گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئێران و لە زانکۆی تاران بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێنا و ماوەی چەند ساڵێک وەک مامۆستا لە کۆلێژی ئەدەبیات و خواوەندزانیی زانکۆی تاران وانەی زمانە دێرینەکان، فەرهەنگ، ئەفسانە و ئایینە ئێرانییەکانی وتۆتەوە.

ئەو ئەفسانەناسە، لە ماوەی تەمەنیدا، دەیان کاری توێژینەوەی لەسەر زمانە هیندۆ ئەورووپاییەکان، ئایین و ئەفسانە میزۆپۆتامیاییەکان ئەنجامداوە، کە دەکرێ ئاماژە بە "واژەنامەی بۆندهێش، هەڵبژاردەکانی زادسپەرم، ئەشکانییەکان و ئەفسانە ئێرانییەکان و هتد ..." بکەین، کە بەرهەمەکانی وەک باشترین سەرچاوەی بواری ئەفسانە و زمانناسیی دێرین دادەنرێن.

## سەرنجێك

ئـەم كتێبـە، بەرهـەمی چەنـدین سـاڵ كـاری لێكۆڵینـەوەی نووسـەری بەناوبانگی ئێران "میهرداد بەهار"ە ، كە لە تێكهەڵكێشی سێ وتاری جیاواز، لەبارەی ئایینە ئاسياييەكان، لە چاخە جياجياكانی مێژوو، پێكهاتووە.

ئـەم كتێبـە، پـێش هـەموو شـتێك وەك سـەرچاوەيەك بـۆ خوێنـدكارانی رشتەی مێژووی ئایینەكان تەرخانكراوە، بەڵام بەدڵنياييەوە تینوێتیی هـەموو هۆگرانی فێربوونی مێژووی ئایینە ئاسـياييەكان دەشـكێنێت. هەرچەنـد ئـەم لێكۆڵینەوەيە پتر وەك كتێبێك بۆ خوێندكارانی خوێندنگـەكان تـەرخانكراوە، بەڵام هزر و روانگەی نوێی ئەفسانەناسی بەناوبانگی ئێرانیی تێكەڵ كراوە.

لێـرەدا پێويسـتە بگوترێـت، كـە هـەموو نووسـراو و شـیكردنەوەكان لـە كۆتایی هەر بەشێك و سەرچاوەكانيش لەلايەن نووسەرەوە رێكوپێك كراون و ئەگـەر هەڵەيەكيشـيان تێـدابێت، نووسـەر لێيـان بەرپرسـيار نییـە. هـەروەها بەشی "ئایینی مەسیحی لە ئێران" بە پشتبەستن بە وتەكانی میهرداد بـەهار نووسـراوەتەوە. بەشـێكيش لـە وتـەی سـێيەم - هـەروەك لـە شـێوەی ئاخاوتنەوە دیارە - پێدەچێ بە يارمەتيی يەكێك لە قوتابييـانی بەردەسـتی مامۆستا لە رشتەی مێژووی ئایینەكانی زانكۆی تاران كۆ كرابێتەوە.

يـاد و نـاوی ئـەو مامۆسـتا مـەزن و ئەفسانەناسـە بەناوبانگـە ئێرانییـە، بەرزبێت.

(هەڵەبڕ)ی دەقی فارسیی كتێبەكە

## بەشی یەکەم
## هیند و ئەورووپاییەکان

### خەڵکی خۆجێیی رۆژئاوا و
### ناوەندی ئاسیا و باوەڕە ئایینییەکانیان

ئێمە لەم باسانەدا، کە پەیوەندیی بە تاوتوێ و شیکردنەوەی ئایینەکانی ئێران، لە ماوەی هەزار ساڵی یەکەمی پێش زایین هەتا کۆتایی هاتنی هەزارەی یەکەمی پاش زایینەوە هەیە و ماوەی ٢ هەزار ساڵ دەبێت، بە رێکوپێکی پشت بە بەڵگە مێژووییەکانی وەک: "بەڵگەی نووسراو و دۆزراوە مێژووییەکان" دەبەستین...

جیاوازیی ئەم باسانە، کە تیایدا پشت بە بەڵگەی روون دەبەسترێ، لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە لە کتێبە ئایینییەکانەوە بەدەستدێن، لەوە دایە کە کتێبە پیرۆزەکان، بە پشتبەستن بەخواوەندزانی هەست و نەستی لەخۆ گرتووە، لە کاتێکدا زانستی سەردەم بە پشتبەستن بەو بەڵگانەی کە لەبەردەستیدایە تەنیا دەتوانێ پانتاییەکی کەم بگرێتە خۆ و هیچ کاتێک ناتوانێ جیا لە ئەگەر و گومان، باس لە سەردەمانی رابردوو بکات، لە بارێکی وەهاشدا دەبێ چەندین ئاماژە لەبەردەستدابن.

کەوابوو زانست تەنیا پشت بە بەڵگە دەبەستێت و رەنگە لەو بوارانەدا، کە بەڵگەی بەدەستەوە نەبێت، لە روونبوونەوەی راستییەکان و ئاڵوگۆڕ لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا بێبەش بێت..

بۆ شرۆڤەکردنی مێژووی ئایینەکان، لە هەزارەی یەکەمی پێش هاتنی مەسیح لە ئێران، پێویستە ئاوڕێک لە پێشینەی بیرۆکە ئایینییەکانی ئەو ناوچەیە بدەینەوە.

لەمبارەیەوە، دوو هۆکاری سەرەکی دەخەینە بەرباس:

ئەلیف - چۆنایەتی و تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئایین و فەرهەنگی خۆجێی ئاسیای ڕۆژئاوا.

بێ - چۆنایەتی و تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئایینی هیندۆ ئەورووپایی..

ئەلیف - فەرهەنگی خۆجێیی ئاسیای ڕۆژئاوا:

پانتاییەکی بەرفراوان لە چۆمی سێند، تورکستانی چین و بیابانی پامیر، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە هەتا ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست لە ڕۆژئاواوە دەگرێتەوە، تەنانەت وڵاتانی "یۆنان و میسر"یش، کە دەکەونە دەرەوەی کیشوەری ئاسیاوە، کاریگەریی قووڵی ئەو کولتورەیان لەسەرەو بە پێچەوانەش کاریگەرییان لەسەر ئەو کولتورە هەیە.

کۆنترین ناوەندی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەو شارستانییە لە قەراخ چۆمی نیل، باشووری میزۆپۆتامیا و دۆڵی سێند جێگیر بوو، هاوکات شارستانیی ناوچەی میزۆپۆتامیا باشتر توانیی لە ٢ کولتوری هاوچەرخی خۆی لە وڵاتانی دراوسێی خۆی گەشە بکات.

ئەمڕۆ بەهۆی پێشکەوتنی زانستی شوێنەوارناسییەوە دەتوانین پێشینەی شارستانیی ئەو ناوچەیە، لە کۆتاییەکانی سەردەمی چاخی بەردین (١٢٠٠٠ ساڵ پ، ز) بەملاوە، دروست بکەینەوە.

لەهەزارەی چوارەمی پێش زایین، خەڵکی باشووری میزۆپۆتامیا، بە کەڵک وەرگرتن لە هونەری نوێ، بناغەی بەرهەمهێنان و ئابووریی خۆیان لەسەر کشتوکاڵ لە نزیک چۆمەکان و هەروەها ئاژەڵداریی پێشکەوتوو دانا و بەهۆی ئەنجامەکانی ئەو پێشکەوتنەوە، شارستانیی ناوچەی میزۆپۆتامیا شانبەشانی شارستانیی دۆڵی نیل، کە ئەویش کەڵکی لە هونەری نوێ وەرگرتبوو، زۆر خێراتر لە شارستانیی ئاسیای ڕۆژئاوا و جیهانی ئەو سەردەمە، پێشکەوت.

ئەم پرۆسەیە کاریگەریی بنەڕەتیی لەسەر خەڵکی دەوروبەر دانا، کە هەتا ئەوکاتەش شارستانییەتێکی کۆنیان هەبوو، لەڕاستیشدا لە هەزارەی چوارەم و سێیەمی پێش زایین شارستانییەت و هونەری نوێشی لەگەڵ

خۆیدا بۆهێنان. لە هەمانکاتدا شارستانییەتی میسر بەهۆی گەمارۆی دەشتە کاکیبەکاکییەکانی دەوروبەری نیل، بەسنورداری مایەوە و نەیتوانی سنوورەکانی میسر ببەزێنێت.

هۆکارێکی پێشکەوتنی شارستانییەتی میزۆپۆتامیا بیابانی ئێران بوو لە هەزارەی چوارەمی پێش زاییندا. ئەم شارستانییەتە لەم رێگەیەوە هەتا ناوەڕاستی ئاسیا رۆیشت و لەبەر زۆر هۆ، لە ناوەڕاستی هەزارەی چوارەم و لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زایین، لە رێگەی ئاسیای ناوەڕاستەوە، ئەم کولتورەی سەردەمی چاخی نوێ، تەنانەت هەتا باکووری وڵاتی چین و وڵاتانی دەوروبەریشی، رۆیشتبێ..

کولتوری میزۆپۆتامیا، لەلای باکووری رۆژئاوای میزۆپۆتامیاوە، گەیشتە ئاسیای بچووک و لەوێوە هەتا باڵکان و دۆڵی سەرووی چۆمی دانوب و باشووری روسیای گرتەوە. لە ناوەڕاستی هەزارەی سێیەم، ئاسەوارەکانی ئەم شارستانییەتەی میزۆپۆتامیا، لە رێگەی ناوچەکانی باشووری بیابانی ئێران و کەنداوی فارس و دەریای عومانەوە، ( نزیکەی ٢٣٠٠ ساڵ پ، ز) دۆڵی "سێند"یشی گرتەوە و کولتوری ئەو وڵاتانەی، کە لە هەزارەی چوارەمی پیش زایین، بەهۆی کۆچکردنی ئەو خەڵکەی پێشتر لە بەلووچستان و ناوچەکانی باشووری هیند دەژیان، خستە ژێر رکێفی خۆیەوە و دانیشتوانی ئەو ناوچانە، لەژێر کاریگەریی ئەم فاکتەرانەدا، چوونە قۆناغی شارنشینیەوە، کە بە کولتوری "هەرەپا" ناودێر کراوە.

هەروەها لەلای رۆژئاواشەوە، ( لەهەزارەی چوارەمی پ، ز) کاریگەریی لەسەر شارستانییەتی میسر دانا و لەم سەردەمەدا "مۆر" و "شێوەکانی بەخشت خانوو دروستکردن " کە لە داهێنانەکانی ناوچەی میزۆپۆتامیا دەژمێردران، لە دۆڵی نیل کەڵکی لێ وەرگیرا و هەوێنی جوانی و شێوەکاریی ناوچەی میزۆپۆتامیا لە میسر بڵاو بوەوە.

بەدڵنیاییەوە شێوەی نووسراو لە ناوچەی میزۆپۆتامیاوە گەیشتۆتە میسر و ئەگەری ئەوە هەیە عەریزەنووسی یەکەمین خانەدانی پاشایەتیی میسر، کەسێکی خەڵکی ناوچەی میزۆپۆتامیا بووبێت.

ئەمە بەو واتایە نییە، کە بەهۆی بڵاببوونەوەی شارستانییەتی میزۆپۆتامیاوە، لەو وڵاتانەی ئاماژەیان پێکرا، لە رەهەندی کولتوورییەوە یەکگرتوویییەکی بەهێز هاتبێتە ئاراوە، کە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم شارستانییەتە لە ناوچەی "سێند" و ئاسیای ناوەڕاستەوە هەتا رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەتوانین بڵێین سەرەڕای ئەوەی کە سەرجەم خەڵکی هەر یەکێک لەو ناوچانە، لە رەهەندی کولتوورییەوە، سەربەخۆبوون، بەڵام میراتی فەرهەنگێکی تایبەت و هاوبەشیشیان هەبوو.

خەڵکانی خۆجێی بیابانی ئێران بە شێوەیەکی بەرین کەوتبوونە بن کاریگەریی کولتووری و ئابووریی ناوچەی میزۆپۆتامیاوە. هەرچەند پەیوەندییەکی ئیتنیکی و کولتووریی دێرین خەڵکی ئەو دوو ناوچەیەی لە یەک نزیک دەکردەوە، بەڵام لە سەردەمانی نوێی پێش هەزارەی دووەمی پیش زایین، بەتایبەت لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین، لەگەڵ دامەزرانی حکومەتەکانی ئێران، ئاسەواری ئەو کاریگەرییە شارستانییەتە بەرچاوتر بوو.

پێکهاتەی دانیشتوانی خۆجێی ئێران، لە ماوەی ئەو چەند هەزارەیەی پێش زایین روون نییە، بەڵام زۆر کەس لەو باوەڕەدان کە لە ناوچەکانی باشوور، ناوەند و رۆژهەڵات و تەنانەت لە باکووری رۆژهەڵات و هەتا رێژەیەکی کەم لە دەریای خارەزمیش، تۆرەمەی "دراویدی (خەڵکی خۆجێیی هیند)" ژیاون کە ئەگەرێکی زۆر هەیە ئیلامییەکان، بە رەچەڵەک، بچنەوە سەر ئەو تۆرەمەیە، لە ناوچەکانی رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوا و باکووریش خەڵکی سپی پێستی قەفقازی، لیی نیشتەجێ بووبن.

رەنگە بتوانین بڵێین لە رۆژئاوای بیابانی ئێران، تێکەڵبوونی رەگەزی قەفقازی و دراویدی، بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی ئێران، زۆر پتربێت.

ب - هیندۆ ئەورووپاییە سەرەتاییەکان، هیندۆ ئێرانییەکان و بڵاوبوونەوەیان:

بۆ ناسینی سەرچاوەی هیندۆ ئەورپاییەکان و پێشینەی کەلتور و شارستانییەتەکەیان دوو ئامراز لەبەردەستدان:

یەکەم: زمان و ئەفسانەی هیندۆ ئەورووپاییەکان، کە لایەنی هاوبەشی زمانی و کەلتوری و تارادەیەک بۆ ناسینی کۆمەڵی سەرەتایی هیندۆ ئەوروپاییەکان رێنوێنیمان بکات، کە فاکتەری نێوخۆیی پێدەگوترێت.

دووەم: ئەو شوێنەوارە دێرینانەن کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەی شوێنەوارناسان لەو پەیوەندییەدا بەدەستهاتوون و بۆ ناسینی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و تا رادەیەک مەعنەویی هیندۆ ئەوروپاییەکان لە سەردەمانی کۆن و ناوەڕاستی ژیان و شوێنی نیشتەجێبوونیان یارمەتیدەرمان بێت، کە بە فاکتەری دەرەکی بەناوبانگە.

بەپێی ئەم دوو فاکتە، سەردەمی یەککگرتنی ئیتنیکیی هیندۆ ئەوروپاییەکان بۆ ٤٤٠٠ ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەم دوو تۆرەمەیە لە گیاجاڕەکانی باشووری روسیا، ناوچەکانی رۆژهەڵات و باشووری چۆمی "دنیپر" باکووری قەفقاز و رۆژئاوای چیاکانی ئوراڵ ژیاون. شوێنی نیشتەجێبوونیان ئاووهەوایەکی نالەباری بۆ ژیان هەبوو، بە شێوەیەک وەرزی هاوین یەکجار گەرم و باراناوی و زستانانیش هەوایەکی سارد و بەفرێکی یەکجار زۆری لێ دەباری و هاوکات لەدەریاکانیشەوە زۆر دووربوو. تێگەیشتنی ئێمە لەمڕووەوە ئەوەیە، کە لە زمانی هیندۆ ئەوروپاییدا وشەیەکی یەکدەست بۆ ناوی "دەریا" نییە.

هیندۆ ئەوروپاییەکانی بەرایی، لە رەهەندی ئابوورییەوە، لە قۆناغێکی نێوان چاخی بەردینی نوێ و چاخی "حەوت جۆش"دا ژیاون و تەنیا یەک

جۆر کانزایان ناسیوە، کە ئەویش مس بووە و ئەوەش لەلایەن خۆیانەوە بەرهەم نەهاتووە. ئەوان لە ڕێگەی کشتوکاڵ و وەرزێرییەوە بژێویی ژیانیان دابینکردووە و پێدەچێ کەرەستەی جووت و گاشیان بووبێت و "ئەسپ، مەڕ، بەراز، بزن و مانگا"یان ماڵی و بەخێو کردبێت.

بەخێوکردنی مانگا، سەرچاوەیەکی بژێویی ژیانی هیندۆ ئەورووپاییەکانی بەرایی بووە و زیاتر گرینگییان بە جووت و گا داوە. ئەوان، لە بواری کۆمەڵایەتییەوە، لە سێ چینی جیاواز پێکهاتون و جۆرێک پاشایەتی، کە شێوازەکەی روون نییە، لە نێویاندا هەبووە.

نزیک بە ٣٠٠٠ تا ٣٥٠٠ ساڵ پێش زایین، ئەو کولتورە بەسەر چەندین ناوەندی جۆراوجۆردا بڵاو بوبوەوە و لەو کاتەوە، بە هەموو لایەکدا رەگاژۆبوو، بەشێوەیەک ناوچەیەکی بەرفراوانی، لە ناوەندی ئەورووپاوە تا ناوەڕاستی ئاسیا خستبووە ژێر رکێفی خۆیەوە. پێدەچی لەو قۆناغە بەملاوە شێرازەی یەکریزیی هیندۆ ئەورووپاییەکان، لەڕووی زمانەوە، لێکهەڵوشابێتەوەو چەندین شێوە ئاخاوتنی نوێی هیندۆ ئەورووپایی سەریانهەڵدابێت.

ئەم کولتورە لە رۆژهەڵات، هەتا سەرووی چۆمی "ینیسی" رۆیشت و لە چاخی "حەوت جۆش"یشدا زیاتر گەشەی کرد.

چاخی حەوت جۆش لەلای خەڵکی سەر بە تۆرەمەی هیندۆ ئەورووپایی لە دەورووپشتی چۆمی "ینیسی"، کە بە کولتوری "ئافاناسیوکا" ناودێر کراوە، پێشینەیەکی دێرینەی لەگەڵ پەرستنی هەتاودا هەبووە.

کولتوری "ئاندرۆنۆڤ" جێگە بە کولتوری حەوت جۆش لێژ دەکاو ئەم رەوتە لە کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەم هەتا هەزارەی یەکەمی پێش زایین درێژەی دەبێت و لە دەستپێکیشدا لە ناوەڕاستی ئاسیا و رۆژئاوای سیبریاوە، بە شێوەیەکی پچڕپچڕ، بڵاو دەبێتەوە، بەڵام ناوەندەکەی لە باکووری دەریای خارەزم (ئاراڵ) دەمێنێتەوە.

لەم کولتورەدا جووت و گا برەوی باشی هەبووە و پێدەچێ هاوکات مانگاشیان بەخێو کردبێت. کەوابوو دەتوانین بڵێین کولتوری ئاندرۆنۆڤ یەکەمین کولتوری هیندۆ ئێرانی، یان ئارییایی بووە.

لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین جێگۆڕکێیەکی یەکجار بەرفراوان لەنێوان هۆزە جیاجیاکان روویدا و ئەو هۆزانەش بەرەو باشوور و لای ئەفغانستان، هیندستان و ئێران داکشان، لە ئاکامدا هیندۆ ئێرانییەکان، لە هەر دوو وڵاتی هیند و ئێران نیشتەجێبوون. هەروەها هۆزە هیندۆ ئێرانییەکانی نیشتەجێی باکووری قەفقازیش، لە کۆچکردنێکی هاوشێوەدا، لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین، لە چیاکانی قەفقازەوە تێپەڕین و بەرەو ئاسیای بچووک و باکوری میزۆپۆتامیا ڕۆیشتن و چەند فەرمانڕەواییەکیان پێکهێنا، کە دەکرێ ئاماژە بە (میتانییەکان) بکەین.

لەسەدەی نۆیەمی پێش زایین، ئارییاییەکان، لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە، بە مەبەستی نیشتەجێبوون لە دەشتاییەکانی ئێران، بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێکەوتن و لە میانەی ئەو کۆچکردنەدا هەر یەکەیان لە بەشێک لە پێدەشتەکانی ئێران نیشتەجێبوون، کە بە هۆزی ئێرانی ناوبانگیان دەرکرد.

بەشێکی دیکە لە هۆزە ئێرانییەکان، (سەکاکان)، لە نێوان سەدەکانی هەشتەم و حەوتەمی پێش زایین، لە ئاسیای ناوەڕاستەوە، بەرەو قەفقاز و باکوری دەریای رەش، لە ڕۆژئاواوە هەتا دەشتاییەکانی باشووری سیبریا هەتا نزیک گۆلی بایکاڵ، لە ڕۆژئاوا ڕۆیشتن و بە درێژایی ڕۆژگار لەگەڵ هەخامەنشییەکان و ئەشکانییەکان تووشی تێکهەڵچوون بوون. خێڵێک لەوان توانیی دەوڵەتی "باختەر" تێکبشکێنێت و لە وڵاتی ئەفغانستان و دۆڵی سێند، هەروەها لە زەرەنگ و بابل حەوانەوە و دەوڵەتی "سیستان"یان دامەزراند، کە لە شانامەدا باس لە بەسەرهاتیان کراوە.

## پێکهاتەی بیرۆکە ئایینییەکان
## لە کولتوری ئاسیای رۆژئاواو کولتوری هیندۆ ئەورووپایی

لەم بەشەدا، هەوڵ ئەدەین پێکهاتەی گشتیی ئەفسانە و ئایینەکانی هەریەک لەو دوو گروپە خۆجێیەی هیندۆ ئەوروپایی، کە بەشێوەی جیاجیا دروستبوون، بخەینە بەرباس، بەڵام پێدەچێ لە هەزارەی دووەمی پێش زایین، بەهۆی تێکەڵبوونی ئەم دوو کولتورەوە (لە قەفقاز، ئاسیای بچووک و دوورووبەری باکوری میزۆپۆتامیا و سوریا) کاریگەرییان لەسەر یەکتر دانابێت.

راستییەکەی دەمانەوێ بە باسکردنی ئەم دوو پێکهاتەیە و چۆنییەتیی ئاوێتەبوونیان، لە قۆناغە جیاجیاکانی دواتردا، لێکدانەوەیەک لە بنچینەکانی بیرۆکەی ئایینی لە پێدەشتەکانی ئێران لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین و هەزارەی یەکەمی پاش زایین بخەینەڕوو.

لێرەدا دەبێ سەرنج بدەین کە بەڵگەکان دەیسەلمێنن هەرکام لەو دوو کولتورەی، کە ئێمە باسیان دەکەین، ئەگەر لە یەکتر نزیک ببنەوە، ناتوانن لە کاریگەرییەکانی یەکتر بەری بن. کەوابوو، باس کردن لە وەها تێکەڵییەک و ناسینی توخمەکانی پێکهێنەری هەر یەکەیان، پێویستی بە ناسینی مێژوویەکی جۆراوجۆر و چەمکی کولتوریی هۆزەکان هەیە. هەروەها باشتر وایە بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە بێ هاوتابوونی کولتور، یان بیروباوەڕێک و هەروەها باوەڕمەندبوون بەوەی کە بەدرێژایی رۆژگار هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە، ئەمە لە خۆیدا پێویستی بە بەڵگەی شوێنەوارناسان نییە.

لەم باسەدا، سەرەتا پێکهاتەی گشتیی بیرۆکە ئەفسانەیی ـ ئایینییەکان لە کولتوری هیندۆ ئەورووپایی و هەروەها لە کەلتوری هیندۆ ئێرانییە سەرەتاییەکاندا تاوتوێ دەکەین.

## پێکهاتەی بیرۆکە ئەفسانەیی
## ئایینی لە کولتوری هیندۆ ئەورووپاییدا

بەپێی توێژینەوەکانی توێژەری فەڕەنسی "جۆرج دۆمزیل"، کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی هیندۆ ئەورووپایی، لەسەر بنەمای کشتوکاڵ و جووت و گا،

خاوەنی پێکهاتەیەکی پێشکەوتووی چینایەتی و هەروەها ڕێکخراوەی سیاسی بوون، یان لانیکەم هیندۆ ئەورووپاییەکان لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی خۆیاندا، فەرمانڕەواییان بەسەر هۆزێکی جووتیاردا کردووە. دۆزرانەوەی کۆمەڵێک بەردەنووسی سەربە شارستانییەتی "هیتی" لە "بۆغازکۆی"، لە ئاسیای بچووک، (شارستانییەتی هیندۆ ئەوروپاییەکان ١٣٠٠ تا ١٨٠٠ ساڵ پێش زایین)، پەیوەندیی بە پەیماننامەی نێوان دەوڵەتی "هیتی" و "میتانی"ـەوە هەیە (هۆزێکی نیشتەجێ لە باشووری فەرمانڕەوایی هیتی، ساڵی ١٢٨٠ـ ١٨٠٠ی پێش زایین)، یارمەتیدەرێکی باشی ئەو تویژەرە فەرەنسییە بووە، بەمەش زیاتر روون بۆوە، کە هیندۆ ئەورووپاییەکان لەقۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراویان هەبووە. هاوکات ئەم لێکۆڵینەوەیە دەریخست، ئاڵوگۆڕی ئەفسانەکانی هیندۆ ئەورووپایی، لەژێر کاریگەریی شارستانییەتی پێشکەوتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای رۆژئاوادا بووە.

شێوە لێکۆڵینەوەی "دۆمزیل" لەسەر ئەفسانەکانی هیندۆ ئەورووپایی، شێوەیەکی مێژووییە، کە سودی لە زانستی کۆمەڵناسی، مرۆڤناسی (ئەنترۆپۆلۆژی)، رەگەزناسی وەرگرتووەو لەو باوەڕەشدا بووە، کە گشتی و کارەکانی خۆی و "کاریگەری (فۆنکسیۆن)یەکانی" بەردەست، لەدابونەریتی ئەفسانەی هۆزەکانی هیندۆ ئەورووپاییدا کۆبووەتەوە و هەوڵ ئەدات پێکهاتەی گشتیی ئایدیۆلۆجیی کولتوری سەرەتایی هیندۆ ئەورووپاییەکان، بەرلە جیابوونەوەی هۆزەکانی سەر بەو شارستانییەتە، لە یەکتر جیابکاتەوە.

دۆمزیل لەو باوەڕەدا بووە کە لە نەریتەکانی "هیند و ئێرانی (بەتایبەت هیندی)، رۆمی و ئەڵمانی"دا بەڵگەی پێویست لەبەردەستدان، کە بتوانن ئایدیۆلۆجی و ئەزموونە کولتورییەکانی (کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و ئەفسانەیی) هیندۆ ئەورووپاییە سەرەتاییەکان دروست بکاتەوە.

ئەم ئایدیۆلۆجییە سێ ئەرکی کۆمەڵایەتی، ئاینی و سەرەتایی لەخۆدەگرێت:

١ـ فەرمانڕەواییەکی دوولایەنە، کە ڕەهەندی سیحربازی و ڕەهەندی بەڵێننامەیی، یان قەزایی لەخۆ بگرێت.

٢ـ ڕێکخستنی نیزامی.

٣ـ بەرهەمهێنانی ئابووری.

**هێڵکاریی (١) ئەرکی سێ لایەنەی هیند و ئەورووپاییەکان**

| | هیندی | ئێرانی | ڕۆمی | سکاندیناوی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١. فەرمانڕەوایی دوولایەنە | وروونە، میترە (براهمنە) Varuna Mitra - | ڤەهوومەنە ئەشە (ئاسرەونان) ،Vohumanah Asa | ژۆپیتێر، دیووس فیدیوس Dius Jupiter Fidius | ئۆدین، تیوور /OdinTyor Tyr |
| ٢. ڕێکخستنی نیزامی | ئیندرە و مرووتەکان (کێشەتریە) Indra Maruts | خێشەترە (ئەرتشتاران) Khshathra | مارچ Mars | تۆور Thorr |
| ٣. بەرهەمهێنان، پیت و بەرەکەت | ئەشوین و خواوەندی سەرسوەتی Asvins Sarasvati | ئەمرێتات و هەئێرووتات - گەلاوێژ و بانەمەڕ (واستەریووشان) Ameretat Haurvatat | کیرنیووس، ئۆپس Quirinus Ops | نیوود- فریر واله فرییا Njordr Freyr Ferya |

هەرکام لەم ئەرکانە لە بەستێنی ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی – سیاسی و نیزامی ئایینیدا کۆمەڵێك ئوستوورەی دەستنیشان کردووە، کەلە خشتەی ژمارە (١)دا ئاماژەی پێکراوە.

هەریەک لەم ئەرکانە، لە بواری ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی – سیاسی و سەربازی ئایینیدا کۆمەڵێک ئەفسانەی دەستنیشان کردووە، کە لە خشتەی ژمارە (١)دا ئاماژەیان پێکراوە.

**(هێڵکاریی ژمارە ٢) ئەرمەنی**

**سەڵتی**

**زمانە هیندۆ ئورووپاییەکان**

**هیندۆ ئێرانی**

**ئاڵبانی**

**باڵتیک**

**رۆمی**

**سلاڤی**

**ئاڵمانی**

**هیندۆ ئارياییەکان**

**یۆنانی**

**ئێرانییەکان**

**داردی**

**هیندی**

جۆرج دۆمزیل، بەپێی شیکردنەوەی بەراوردکارانەی پێکهاتەی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی و ئەفسانەیی، کە لە سەردەمی هیندۆ ئەوروپایی چاخە کۆن و سەرەتاییەکاندا بەدی دەکرێت، دەگاتە وەها ئەنجامێک :

١ـ کۆمەڵگەی بنیاتنەری هیند و ئەوروپاییە سەرەتاییەکان، بەرلە جیابوونەوە و بڵاوبوونەوە بەوڵاتە جۆراوجۆرەکاندا، خاوەن ئایدیۆلۆجییەکی سێ لایەنەبوو.

٢ـ میراتگرانی ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییە، هەندێک فاکتەری ئەو ئایدیۆلۆجییەیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەو وڵاتانە برد و دواتر بووە مەڵبەندی ژیانی هۆزەکانی هیندۆ ئەوروپاییەکان.

٣ـ فاکتەرەکانی ئەو ئایدیۆلۆجییە، بەشێوەیەکی بەرین لە ئەدەبیاتی ئەفسانەیی و چیرۆک و حیماسەی هیندۆ ئەوروپاییەکان، لە "ڤیدا"کانی دێرینی هیندەوە هەتا "ئیدا"کانی ئیرلەندا، بەرلە بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیح، بەرچاو دەکەوێت.

(هێڵکاریی ٢ )

سەلتی

میراتگرانی هیند و ئورووپاییە سەرەتاییەکان

فارس

کورد

داردی

هیندی

ئەرمەنی

باڵتیک

ڕۆمی

ئاڵمانی

یۆنانی

ئەسلاوی

هیند و ئێرانی

ئاڵبانی

هیندییەکان و ئارياييەکان

ئێرانییەکان

پەشتوو

بەلووچ

سەرەڕای ئەمانەش، دۆمزیل پێیوایە ئەم ئایدیۆلۆجیایە، چ ئەوەی کە لەقاڵبی ئەفسانە و چیرۆکی ئازایەتیدا گوترابێت و چ بەشێوەی ڕێکخراوە

کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگدانەوەی بووبێت، بەدڵنیاییەوە ئایدیۆلۆجییەکی هیندۆ ئەورووپاییە و لەنێوان شارستانییەتی کۆنی ئاسیای ڕۆژئاوا، دۆڵی نیل، چین و هەر وڵاتێکی دیکە لەم جیهانە دێرینەدا، (پێش کۆچکردن و بڵاوبوونەوەی هیندۆ ئەورووپاییەکان، لە هەزارەی دووەمی پێش زایین)، هاوتای نییە.

هەڵبەت هەندێک ڕەخنە لە ڕوانگە و بۆچوونەکانی گیراون، ڕەنگبێ لە توێژینەوەکانی داهاتوودا ڕوون ببێتەوە، کە بۆچوونەکانی دۆمزیل پێویستە کاری پتریان لەسەر بکرێت.

## بواری هاوبەشی ئەفسانە
## هیندۆ ئەورووپاییەکان

کاری لێکۆڵینەوە لەسەر ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکان، سەرەڕای پێشینەی دوورودرێژی خۆی، هەتا ئێستا هەر لەسەرەتادایەو ئەنجامێکی تۆکمەی لێ بەدەستنەهاتووە..

توێژینەوەکانی دۆمزیل ـ هەروەک ئامارەیان پێدرا ـ پەنجەرەیەکی نوێی بەڕووی تاوتوێکردنی بەراوردکاریی ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکاندا کردۆتەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کە زۆربەی بووچوونەکانی باسی پێکهاتەی ئایدیۆلۆجیی ئەو ئەفسانانە دەکەن، چەندین خاڵی هاوبەشیدیکەشیان لەگەڵ ئەفسانە و باوەڕی هیندۆ ئەورووپاییەکاندا هەیە، کە پێویستە ئامارەیان پێبکرێت :١ـ بنیاتی باوکسالاریی ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکان، خواوەندی هیندۆ "ئێرانی، یۆنانی، ڕۆمی و نۆردی" بەگشتی ڕەگەزیان نێر بووە. گرنگیی خواوەندەکانی "مێ"ی بەهێزی وەک "ئاناهیتا" ی ئەفسانەکانی ئێران و هەروەها "هێرا" و "ئافرۆدیت" لە ئەفسانە یۆنانییەکان، لە ئاستێکی بەریندا، ئاکامی ئاوێتەبوونی ئەفسانەی ئەو هۆزانە لەگەڵ ئەفسانەی هۆزە خۆجێییەکانە، کە خواوەندێکی بەهێز لە نێوان ئایینی ئەو هۆزانەدا هەبووە. هەروەها ئەفسانەی خواوەندەکانی "زاوزێ"ی وەک: باڵدێر نۆردی، باکووس و

دیۆنیووس لە یۆنان، ئەفسانەی سیاوەش لەئێـران و چیرۆکـی "رامایانا"ی هیندستان لە هۆزە جووتیارەکانەوە بۆیان بەمیرات ماوەتەوە.

باوکسالاری لە ئەفسانە هیندۆ ئەوروپاییەکاندا، لەسەر بناغەی شوانی و گاوانیی مانگاوە بووە، چونکە کاری شوانی و گاوانیی مانگا کارێک بووە پتر لە توانای پیاواندا بووە، لە کاتێکدا دایکسالاری لە سەردەمانی زۆر پێشتردا (لە نێوان ١١هەزار هەتا ٤ هەزار ساڵ پێش زایین) لە ئاسیای رۆژئاوا و بەشێکی بەرچاو لە ئەوروپا هەبووەو لەگەڵ سەرەتای جووت و گا لە ناوەڕاستەکانی چاخی بەردین و چاخی بەردینی نوێ، لەو ناوچانە پەرەیسەندووە. بەم پێیە، لە قۆناغەکانی دواتردا، کە بەهۆی ئاڵوگۆڕی باری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، کۆمەڵگەی باوکسالار جێگەی بە کۆمەڵگەی دایکسالار لێژ کردو خواوەندی نێرینە جێگای خواوەندی مێینەی گرتەوە، بەڵام لەپاڵ ئەم خواوەندە نوێ و بەهێزانەدا، چەندین خواوەندی بەهێزی مێینەی نمونەی "ئیشتەر" وەک خۆیان مانەوە، کە "ئاناهیتا"ش خواوەندی مێینەی ئێرانی و فریشتەی پارێزەری ئاو، لەژێر کاریگەرییەکانی ئەو دایە.

٢- "دییوس"ی باوک لە هیند، "زییوس"ی باوک لە یۆنان و هەروەها "ژووپیتێر (ژوو—ی باوک) لە رۆم، کە هەریەکەیان لە سەردەمی خۆیدا، بەخواوەندی بەهێزی یەکێک لە هۆزەکانی هیندۆ ئەوروپایی دادەندرا، نێرینەییان دەرخەری باوکسالارییەکی بەهێزی کولتوری و ئەفسانەیی هیندۆ ئەوروپاییەکانە.

هەبوونی "ئاهورا مەزدا" لە ئێران، "ئەودین" یان ("ئۆتن" نۆردی)یش بەڵگەی سەلمێنەری ئەو نووسراوەی سەرەوەیە، بەڵام لە لایەنی رەچەڵەکناسیشەوە، چەندین بەڵگە لەسەر باوەڕی راستەقینەی هیندۆ ئەوروپاییەکان لەبەردەستدان: وشەی لاتینیی "dues" بە واتای خواوەند، لە زمانی ڤیدایی"deva" خواوەند، لە ئاڤێستادا - daeva دێو لە بنەچەدا بە واتای خواوەند هاتووە. - هەرچەند بەپێی ئاڵوگۆڕی باوەڕەکان، واتاکانیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە - لە "سەکایی"دا "*daiva" ناوی

خواوەندەکان بووە. لە زمانی "گوڵەکان devo "، لە زمانی ئیرلەندیdia ، لە بریتانی de لە زمانی نۆردیی دێرین tivar ناوی سەرجەم خواوەندەکان بووە. لە "پروسیا"ی کۆن "deiwas" و لە زمانی لیتوانی "deiwas"و لە زمانەکانی دیکەشدا ئەم وشەیە ناوی خواوەندەکان بووە.

٣ـ لە لێکۆڵینەوەی ئەفسانە هیندۆ ئەوروپاییەکاندا، دەکرێ ئاماژە بە ئاگر و بایەخەکەی بدرێت. هەبوونی "ئەگنا (ئاگری پیرۆزـ خواوەندی ئاگر)" لە "ڤیدا (کتێبی پیرۆزی هیندییەکان)، "ئازەر (ئاتشگە)" لە ئێران، "هەستیا (خواوەندی ئاگر) " لە یۆنان، "وستا" لە رۆم و "ئەگنیس سێزوێنتا" بەهێمای پەرستن و گەورەیی ئاگر لە قەڵەم دراوە، کە لە نێو هۆزە هیندۆ ئەوروپاییەکان هەبووەو لە خۆیدا بەسیمبولی بەخشندەیی هەر بنەماڵەیەک دانراوە. هەتا ئێستاش لە زۆربەی وڵاتاندا باوە کە ئەگەر خێزانێک منداڵی نەبێت بە "وەجاخ کوێر" ناوی دەبرێت. پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە لە رێورەسمی ئاگرپەرستیدا، تەنانەت لە نێو هۆزەکانی هیندۆ ئێرانییە دێرینەکانیشدا جیاوازی هەبووە، لە بواری رەگەزیشەوە لە نێوان "هەستیا" و "وستا" و لەلایەکی دیکەشەوە لەنێوان "ئەگنی" و " ئازەر"دا جیاوازی هەبووە، کە ئەوان لە رەگەزی مێ و ئەمانیش لەرەگەزی نێربوون.

٤ــ بەپێی بەڵگەکان، خواوەندی هیندۆ ئەوروپاییەکان سیمایەکی هاوچەشنی "بت"یان نەبووە. پەیکەری خواوەندی یۆنانییەکان، رەنگدانەوەی کولتوری دێرینی میسری پێوە دیارە، هەروەها لە فەرهەنگی سەردەمی "ڤیدا"ی هیندییەکانیشدا بتپەرستی و باوەڕمەندبوون بەبت بەدی ناکرێت. پەیکەری خواوەندی هیندییەکان، بۆ قۆناغی چوونە ژێر کاریگەریی فەرهەنگەکانی دیکە دەگەڕێتەوە. لە ئێرانیشدا سیمای "ئاهورا مەزدا" لەسەر بەردەنووسەکانی سەردەمی هەخامەنشی، لەژێر کاریگەریی ناوچەی میزۆپۆتامیادا بووە. هەروەها لە سەردەمی ساسانییەکانیشدا، لە "نەخش و نیگارە هەڵکەندراوەکان"دا، سیمای "هەرمەزد (ناوی پێنج پاشای یەکەمی

ساسـانییەکان)"، "میهـر" و "ناهیـد (خواوەنـدی زەردەشـتییەکان)" بـەرچاو دەکەون، کە لەژێر کاریگەریی کولتوری دێرینی میزۆپۆتامیادا بووە.

٥. لـە ئەفسـانە و ئـایینی سـەرجەم هـۆزە هینـدۆ ئەورووپاییەکانـدا باوەڕمەندی بە سیحر هەبووە.

٦. دەستەواژەی هاوبەشی ئایینی و توێژی "زانایانی ئایینی، جەنگاوەران و بەرهەمهێنەران" سێ لایەنی هاوبەشیدیکەبوون...

لـەکۆتایی ئـەم باسـەدا، پێویسـتە بگوترێـت لـە ئـەنجامی لێکۆڵینـەوە و پۆلێنبەندیی ئەفسـانە هینـدۆ ئەورووپاییـەکان، دەتـوانین بگەینـە سـەرچاوەی دروسـتبوونی مێژووەکـەیان، هاوکـات سـەرهەڵدانی ئەفسـانە هینـد و ئەورووپاییـەکانیش دەستنیشـان بکـەین، بـەڵام هەرگیـز نـاکرێ ئـەو مێـژووە بەوردی تۆژەن بکرێتەوە، چونکە بەروونی دیـار نییـە ئـەو هۆزانـەی کـە لـەم جیهانە بەرینەدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە، لە قۆناغە مێژووییـە جیاجیاکانـدا، خـاوەنی ئەفسـانەی هاوبەشـبوون، یـان ئەگـەر پێکهاتەیەکیشـیان بووبێـت پارێزگاری لێکراوە، یان رەنگدانەوەی لەسەر لە نەوەکانی دواتریشـدا هـەبووە یـان نـا؟ سـەرجەم ئـەو بنەمایانـەی باسـکران سـەبارەت بـە پێکهاتـەی ئایـدیۆلۆجیی سـێ لایـەنی و بنـەما ئەفسـانەیی هینـدۆ ئەورووپاییـە سەرەتاییەکان، دەکرێ هەمان شتیش سەبارەت بـە بـاوەڕی هینـدۆ ئێـرانییە سەرەتاییەکان باس بکەین.

## بواری هاوبەشی ئەفسانەکان
## لە کولتوری خۆجێی ئاسیای رۆژئاوادا

١ـ کولتوری خۆجێی ئاسیای رۆژئاوا پێشینەیەکی یـەکجار دێرینـی هەیـە. زانیـاریی ئێـمە سـەبارەت بـە ئایینـەکان لـە ئاسـیای رۆژئـاوا، لـە ئـەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەو ئاسەوارانەدایە، کە نەک تەنیا لـە میزۆپۆتامیـا، بـەڵکو لـە هەموو ئاسـیای رۆژئـاوا، ئێـران و ئاسـیای نـاوەڕاسـت، بـاس لـە پەرسـتنی

خواوەنـدی دایـک و قۆناغـەکانی بەرلـە مێـــژوو (٥٠٠٠ سـاڵ پـێش زایـین) دەکات.

هەبوونی کۆمەڵێک پەیکەری بچووکی خواوەندی دایک و ئەو جوانکـاری و زێڕ و زیوانـەی بەپەیکـەرە بچووکـەکانی خواوەنـدی دایکـەوە هەڵواسـراون، مێژووەکەیان بۆ هەزارەکانی پێش زایین دەگەڕێتەوە.

ئەو "مۆر"انەی کە وێنەی ئایینیان لەسـەر هەڵکەنـدراوە، هـەروەها ئـەو نووسـراوانەی کـە بـاس لـە نـزا ئایینیـەکانی خواوەنـدی دایـک و بەشـداریی خەڵک لەو نزا ئایینیانە لە ئاسیای رۆژئاوا دەکەن، ئەوە دەگەیەنێ کە خاڵی سەرەکیی نزای ئایینیی کۆمەڵگە دێرینەکانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگەی دایـک سالار، لە ئاسیای ناوەڕاستەوە تا رۆژئاوای ئاسـیا و رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، پەیوەنـدیی بەپەرسـتنی خواوەنـدی دایکـەوە هـەبووە، کـە ئـەم رەوتـە تـا سەردەمی باوکسالاری بەردەوام بووە.

لەسەرەتای قۆناغی شارنشینیدا، لە بەشـێک لەناوچـەکانی میـزۆپۆتامیا زنجیرە پەرستگەیەک هەن، کە بەشـێوەی جـووت جـووت لـە پـەنا یـەکتردا دانراون، کە پێدەچی ئاماژە بەژن و مێردێکی ئاسمانی بکەن.

لەهەموو قۆناغە مێژووییەکاندا، خواوەندی گەورەی شاری **"ئوروک"** لە میزۆپۆتامیا، خـاتوونی خواوەنـد "ئینـین" بـوو، کـە جارجـارەش بـە **"ئینانا"** ناوی دەبرا، کە لە وڵاتی سۆمەردا بە واتای "خاتوونی ئاسـمانەکان"ـــە. بـاوکی ئـەم خواوەنـدە نـاوی "ئـەنکی" بـووە، ئـەنکی خواوەندێکی زانایە و هێمای زانابیە. ئەم خوڵقێنەری جیهان لە دەسـتی ئـەو خواوەندە دایە و سەرجەم کاروباری جیهانی بە دەستە. هـەروەها خواوەنـدی باران و بەرەکەتەو ئاسایشی کۆمەڵگەی مرۆیی لە دەستدایە. ئـەو بەداهێنـەر و پارێزەری یاسا دادەندرێ، باشترین هاوڕێی مرۆڤەو چارەنووسـی مرۆڤـەکان دیـاری دەکـات. ئـەنکی بـەهۆی کوشـتنی یەکـەمین دێوەزمـەی نێـــر بـەناوی "ئەپسـۆ" دەگاتـە تـەختی خونکـاری. دێوەکـان لـە خزمـەتی ئـەودا بـوون.

مەردۆخ، خواوەندی گەورەی بابلی، کوڕی ئەو و هەروەها "ئینانا" کچی ئەو بووە.

خواوەند "ئینین (ئینانا)" هاوسەرێکی بەناوی "دۆموزی"یەوە هەیە، کە خواوەندی خێر و بەرەکەت و زاوزێیە. ئەم خواوەندە لە کۆمەڵگە دێرینەکانی ناوچەی میزۆپۆتامیا خاوەن پێگە و کاریگەرییەکی تایبەت بوو، کە بەهۆی بوونە قوربانیی خواوەندی زاوزێ، هەلومەرجێکی تایبەتی هەبوو، کە هەموو ساڵێک لەرێوڕەسمێکی تایبەتدا دۆمۆرزی دەکرایە قوربانی.

پێشینەی ئەو رێوڕەسمە بۆ ۳ هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەم ئایینە، بە خێرایی، لە سەرتاسەری وڵاتانی دەوروبەر بڵاو بووەوەو ئاسەوارەکەشی هەتا هەزارەی دووەمی پێش زایین لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئاسیای رۆژئاوا بەرچاو مایەوە. جە ـژنی نەورۆز لە سەرەتای بەهاردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم رێوڕەسمە دێرینەی ئایینی خۆجێیی ئاسیای رۆژئاوا.

ئەگەری زۆرە، لە سەرەتای شارستانییەتی سۆمەرییەکان، خواوەندی رزق و رۆزی و زاوزێ لەنێو نەریتی هۆزە شوانکارە ـ وەرزێرەکاندا، هەندێک جار، گرێدراوی زەویوزار و هەندێک جاریش گرێدراوی ئاژەڵداری بووە، کە هەمان دۆموزی بووە. ئەوەی کە ئاشکرایە ئینانا و دۆموزی بەهاوسەری یەکتر ناسراون. باوەڕمەند بوون بە هاوسەرگیریی خواوەندی رزق و رۆزی لەگەڵ ئینانا لە سەرەتای بەهاردا و هەروەها کوژرانی لە هەمان ساڵدا بە هێمای ژیان و مردنی جیهان دادەنرێت و بەڕێوەچوونی ئەو رێوڕەسمە لە سەرەتای هەموو ساڵێکدا و رێوڕەسمی پەیوەندیدار بە هاوسەرگیریی ئینین بەشێک لە باوەڕی خەڵکی ناوچەی میزۆپۆتامیا بوو. خەڵک لە کاتی کوژرانی ئەو خواوەندەدا شینیان دەگێڕا و سەرخۆشییان لە یەکتر دەکرد، هەرەها لە کاتی هاوسەرگیریی سەرلەنوێی "ئینین"یشدا شاییان دەگێڕا و پیرۆزبایيان لە یەکتر دەکرد.

مردنی دۆموزی هێمای مردنی گژ و گیا، هاوسەرگیریی "ئینین"یش هۆکاری ژیانەوەی سەرلەنوێی گژوگیا و هاتنەبەری دار و درەخت، هەروەها

زاوزێی مەڕ وماڵات بووە، کە پێدەچێ ویستبێتیان بەم شێوەیە لەگەڵ تەواوبوونی وەرزەکان پێشگیری لە راوەستانی ساڵ بکەن و ژیانەوەی گژوگیا و ئاژەڵەکان بەردەوام بن، کە ئەمە لە خۆیدا وەک سیحر سەیرکراوە. چیرۆکی رامایانا لە کولتوری هیندییەکاندا، چیرۆکی مردنی سیاوەش و هاتنی کەیخوسرەوە بۆ ئێران، کە سوودابە (ژنی کەیکاوس پاشای کیانی) تیایدا رۆڵێکی سەرەکیی هەبوو، چیرۆکی بەعل و ئەنەس لە نووسراوە دێرینەکانی کەنعانیدا باس لە بەسەرهاتی مردن و ژیانی خواوەندی رزق و رۆزی، هەروەها بارێنەری باران لە ماوەی چەندین قۆناغی حەوت ساڵەدا دەکەن و مردنی ئەو بەدەستی مووت، خواوەندی مەرگ و ژیانەوەی، چیرۆکی خواوەندی باران بەناوی تشووب لە هۆزی هیتییەکاندا لە ئاسیای بچووک و شەڕکردنی ئەو خواوەندە لەگەڵ دێوی بەردین، کە لەنێو ئاودا بووە.

قڕکردنی ئەو خواوەندە لە شاری خۆیدا و رۆیشتن بەرەو وڵاتانی دیکە و هێنانەوەی بۆ وڵاتی خۆی، چیرۆکی "ئیزیس" و ئۆزیریس لە وڵاتی میسر، کە چیرۆکی کوژران و زیندووبوونەوەی خواوەندی رزق و رۆزییە، لەسەر بناغەی کوژرانی ئۆزیریس بەدەستی "سێت" و جێگری سێت لەسەر تەختی دەسەڵاتدارێتیی ئوزیریس و هاتنی هوروس، کوڕی ئیزیس و ئۆزیریس و شەڕکردن لەگەڵ "سێس (مامی خۆی)" و دانیشتن لە جێگەی باوکی و گەیشتن بە دەسەڵات (چیرۆکی سیاوەش و کەیخوسرەو هاوشێوەی ئەم چیرۆکەیە) و شەخسی ئۆزیریس (خواوەند جیهانی ژێرزەوی) نوێبوونەوەیە، کە سەرجەمی مەخلوقات لە وڵاتی هیندەوە تا دۆڵی نیل، باسی گرنگیی خواوەندەکانی رزق و رۆزی و پەیوەندیی نێوانیان دەکەن.

سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدان و هەزاران ساڵ و گۆڕانکارییەکی قوڵی کۆمەڵایەتی، باوەڕی ناوچەکانی میزۆپۆتامیا لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە چەندین ئاڵوگۆڕی بەخۆیەوە بینی و لە جیاتیی تێکەڵبوون بە شارستانییەتی سۆمەری و سیستمی باوکسالاریی دکتاتۆری بابلی، جێگەی سیستمی دایکسالاریی گرتەوە. هەروەها ئەنکیی خواوەندی

زانـایی و تێگەیشـتوویی لەلایـەن "مـەردۆخ" خواوەنـدی بابلییـەکان و ئاشـور خواوەندی ئاشوورییەکانەوە جێگەی پێلێـژ کرا و روویان لە دیکتاتۆری کرد. رۆحانییەت، جەنگاوەری و بەرەکەتداری، لـە هـەر یـەکێک لـەو خواوەندانـەدا (ئاشوور و مەردۆخ) کۆبۆوە. ئەم دوو خواوەندە لە ناوەڕۆکدا یـەک خواوەنـد بوون، کە بە دوو ناوی جیاوازەوە، لە دوو وڵات و لەلایەن خەڵکەوە سـتایش دەکران.

لێـرەدا و لـەم قۆناغـەدا، بەپێچەوانـەی بیروبـاوەڕی هـۆزە هینـدی و ئەورووپاییەکان، کە هیند و ئێرانییەکان لقێک لەوان بوون، دابەشکردنی ئەرک لە نێـوان خواوەندەکانـدا بـوونی نییـە، بـەڵکو تـەواوی دەسـەڵات، دەکەوێتـە دەستی یەک خواوەند، ئەمەش بەئاڵوگۆڕێکی قوڵ بـەرەو یەکتاپـەرستی، لـە جیهـانی خواوەنـدەکان دادەنرێـت. هەرچەنـدە هـەتا ئێسـتا بـەرەوڕووی یەکتاپەرسـتی نەبووینەتـەوە، بـەڵام ئـەو ڕێگەیـەی کـە دەچێتـە سـەر ئـەو ڕێچکەیە روون و ئاشکرایە.

٢. لە ئەفسانە کولتوورییەکانی ئاسیای رۆژئاوا، یەکەمین جـۆری شـەڕی نێوان خواوەندەکان بەدی دەکرێت. ئـەم کێشـە ئەفسـانەییە لـە قۆناغـەکانی رابـردووەوە هـەتا قۆناغـەکانی پـێش زایینـی، ئەفسـانەی نزیـک بـە زۆربـەی هۆزەکان دەبینرێت.

لــە ســەردەمــانی زۆر دێرینــی میزۆپۆتامیــادا، واتــە لــە ســەردەمی شارستانییەتی سۆمەرییەکان، ئەپسوو کە باوکی خواوەند و دێوەکـان بـووە، لەلایەن ئـەنکی (خواوەنـدی زانـایی)ـەوە دەکـوژرێ و جێگـەی دەگیـرێ. لـە قۆناغـەکانی دواتریشـدا (نیـوەی دووەمـی هـەزارەی دووەمـی پـێش زایـین) مـەردۆخ کـە جێگـەی ئـەنکی و سـەرجەم خواوەنـدەکانی دیکـەی گرتۆتـەوە، تیمات، دێـو— یەکەمین خواوەند و هاوسەری ئەپسوو، کە دایکی خواوەند و دێوەکانــە، دەکــوژێ و جیهــانێکی مــادی لەتەرمەکــەی دەخوڵقێنێــت. لــە کەنعان، بەعل بـە کوشـتنی یـەم (دەریـا) دەگاتـە تـەختی دەسـەڵات. بـەپێی ئەفسـانەی ئـەدەبیی هیتییـەکان، هەریـەک لەخواوەنـدەکان، پـاش ٩ سـاڵ

دەسەڵاتداری، بەدەستی خواوەندی پاش خۆی دەکوژرێ و هەتا ئەوکاتەی خواوەندی باران دەگاتە دەسەڵات، ئەم رەوتەش بەردەوام دەبێت. لەیۆنانیش چیرۆکێکی هاوشێوە روو ئەدات. زێیوس لەگەڵ ئەو برایانەی کە لە سکی کرونوس، دێو - خواوەندی یۆنانیدا بوون، پێکەوە دەیکوژن و زێیوس کە خواوەندی باران بووە، دەگاتە دەسەڵات.

لەلایەکی دیکەوە و لە وڵاتی ئێران، بەپێی ئەفسانەی زۆروان و دوابەدوای ئاواتەخوازبوونی زۆروان بۆ منداڵبوون، هەرمەزد و ئەهریمەن لە منداڵدانی "زۆروان"دا دروست بوون. ئەهریمەن سکی باوکی خۆی هەڵدڕی و بووە پاشای گشت جیهان و هەرمەزد بوو بەپاشای رۆحانی. هەروەها لە دۆڵی "سێند"یش بەپێی گوتەی پێشینیان، کە لەباوەڕی ڤیداییەکان و پاش دەورانی ڤیدا رەنگیداوەتەوە، خواوەندەکان بۆ ئەوەی جیهان دروست ببێت، پورروشە، واتە یەکەمین دێویان کوشت، بەڵام ڕاستییەکەی پورروشە هەمان خواوەند، باوکی شارستانییەتی دێرینی دۆڵی سێندە، کە بە پەرجاپتی ناسرا و دواتر بەرەوڕووی بەرەهما دەبێتەوە.

٢. لەئەفسانەکانی جیهانی کولتوریی ئاسیای رۆژئاوا، خواوەند و دێوەکە لە یەک سەرچاوەوە دروستبوون. لە ئەفسانەکانی میزۆپۆتامیا ئەپسوو و تیمات، دایک و باوکی دێو و خواوەندەکان بوون.

لەیۆنانیش، کە کاریگەریی ئەفسانەکانی "کەنعانی و هیتی"یەکانی لەسەر بوو، ئورانووس و گایا ئەو دوو دێوە بوون، کە لە داوێنی ئەم دوو دێوە و کورونوس، خواوەند و دێوەکان دروستبوون.

لە ئێرانیش لە رۆزوان، هەرمەزد و ئەهریمەن، خواوەند و دێوەکان دروست دەبن.

هەروەها لە فەرهەنگی دۆڵی سێندیش خواوەندەکان و دژە خواوەندەکان، دێوەکان و ئاسوورەکان پەیدابوون.

٤. لەکولتوری ئاسیای رۆژئاوادا خواوەندێکی مێینەی بەهێز و دەسەڵاتدار (وەک پێشتر باسی کرا) بوونی هەبوو، کە بەجێماوی خواوەندی دایک و هێمای زاوزێ و ئەڤینداری و شەڕ بووە.

ئیشتر، هاوسەری مەردۆخ، کە لە شارستانییەتی سۆمەرییەکاندا جێگەی ئینانای گرتۆتەوە، ئەنس لە شارستانییەتی کەنعانی، ئافرۆدیت و هێرا لە ئەفسانە یۆنانییەکان، ناهید لە ئەفسانە ئێرانییەکان و سەرەسوەتی لە ئەفسانەکانی دۆڵی سێند، ئاماژە بە هەبوونی ئەو خواوەندە مێینەیە لە میزۆپۆتامیا دەکەن.

٥. خواوەندی باران، کە بەگشتی خواوەندی ئاسمانین و هەورەتریشقە لەژێر دەسەڵاتیاندایە، سەرچاوەی بیرۆکەی باوەڕی کولتوریی ئاسیای رۆژئاوان. ئەو خواوەندانە بەگشتی بە ئەژدیهاکوژ ناسراون و باسی سەرەکیی شەڕی ئەوان لەگەڵ ئەژدیها بەم شێوەیەیە، کە خواوەند لە شەڕی یەکەمدا شکست دێنێت، بەڵام لە بەرەوڕووبوونەوەی دووەمدا، بەسەر ئەژدیهاکەدا سەردەکەوێ و ئاوەکان دەخرۆشێنەوە. هەندێک جار، کوشتنی ئەژدیها، دەکرێ هۆکاری ماڵوێرانی و هەناسەساردی بێت.

لەئەفسانەکانی میزۆپۆتامیادا، دێوی نەخۆش، کە لەژێر زەوی دایە (دێوی ئاوە سوێرەکانی ژێرزەوی)، بەدەستی نینورتە خواوەندی باران، دەکوژرێ و ئاوە سوێرەکانی ژێرزەوی دێنە دەرەوە و ژیان بەرەو هەڵدێر دەبەن.

لەکەنعان شەڕی بەعل و یەم و بەعل و مەوت بەرچاو دەکەون، کە خواوەندی باران لەگەڵ دێوی وشکانی و مەرگ لە شەڕدان. لە یۆنانیش زێیووس، خواوەندی باران لەگەڵ تیتانییەکان، بەهەمان شێوە. شەڕی نێوان" مەردۆخ و تیامت"یش هەمان بابەتی ئەفسانەکانی لەخۆ گرتووە.

لەئەفسانە ئێرانییەکاندا، شەڕی تیشتر، خواوەندی باران، لەگەڵ ئاپووش، دێوی وشکانی، دووپاتبوونەوەی ئەم بابەتەیە.

لە کۆتاییەکانی دەورەی ڤیدایی لە هیند، ئیندرە، خواوەندی ئاسمانی بە شێوەی خواوەندی مەزنی ئەفسانەکانی هیند خۆی دەردەخات کە دەبێ بۆخۆی لەژێر چەتری ئەفسانە ئاسیاییەکاندا بێت. شەڕی ئەو لەگەڵ دێوی وشکانی بەناوی ورترە و تێکشکانی ورترە بە دەستی ئیندرە بە بابەتی جێگەی سەرنجی ئەفسانە ڤیداییەکان دادەنرێت.

## گەیشتنی ئارياييەكان بە دۆڵی سێند و ئێران و گۆڕانە ئایینییەکان

هەروەک پێشتر باس کرا، دەستەیەک لە ئارياييەکان لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین، لە کەناراوەکانی باکووری دەریای خاڕەزم (ئارال) و ناوچەی لاسەرووی چۆمی ینیسی بەرەو باشوور رۆیشتن، بەپەڕینەوە لە دۆڵەکانی هیندوکیش، چوونە نێو دۆڵی سێندەوە و تێکەڵی هۆزە خۆجێیەکانی دۆڵی سێند بوون، کە دواتر بە هیندو، ناوبانگیان دەرکرد. دەستەیەکی دیکە لە ئارياييەکان بەرەو باشوور و بیابانی ئێران بەڕێکەوتن و بەپێی بەڵگەی ئاسەوارناسان، لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین، چوونەتە ئێران و لە رۆژهەڵاتی ئەفغانستانەوە تا پێدەشتەکانی رۆژئاوای زاگرۆس و باشووری ئێران نیشتەجێبوون.

لەروانگەی ئایینییەوە، خاڵێکی جێگەی سەرنج ئەوەیە کە گۆڕانێکی بنەڕەتی و هاوشێوەی یەکتر لە دۆڵی سێند و بیابانی ئێران لە نێوان ئاریاییە تازە هاتووەکاندا روو ئەدات. بەپێی کۆنترین بەڵگەی ڤیداییەکان و بە پشتبەستن بە نووسراوە میتانییەکان، وەک ئەوەی کە باس کرا، دەتوانین بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە هیندۆ ئێرانی (ئاریایی)لە سەرەتاییەکان دوو دەستە خواوەندیان هەبووە، کە بە (ئەسوورا) ئێرانی (ئاهورا) و دێوە ئێرانی = ئاڤێستا (daevaناسراون. هێزەکانی خراپە بەشێوەیەکی دیاریکراو و رێکخراو لەنێو ئەفسانەکاندا نەبووە، بەڵکو چەندین جۆری ئەژدیها و هێزی ناپاک، بەشێوەی تاق و لۆق بڵاو ببوونەوە.

بەڵام ڕووداوێکی بنەڕەتی، کە پاش هاتنی ئەم هۆزانە بۆ ئێـران، لـە ڕوانگـەی ئایینییـەوە، ڕوو ئـەدات، ئەوەیـە کـە لـە هـەر دوو ناوچەکـەدا ئاڵوگۆڕێکی یەکسان دێتـە ئاراوە: دوو دەسـتە، یـان دوو توێـژی خواوەنـد، بەسەر دوو دەستەی "خواوەندەکان" و "دژی خواوەندەکان" دابەشبوون، کە هەر دوو تاقم، لەدایک و باوکێک بوون.

نووسەر لەو باوەڕەدایە ئـەم جیاوازییـە هیچ گرنگییـەکی ئـەوتۆی نییـە، هەرچەنـد دەکـرێ دووپاتکـەرەوەی چۆنیـەتیی کاریگەرییـەکانی هـاتنی ئـەم هۆزانە بۆ وڵاتانی ئەسووره و ئێران بێت، چونکە هۆزە ئێرانییەکان بەگشتی، بـەبێ شـەڕ و تێکهـەڵچوونێکی یـەکجار کـەم، لـە پێدەشـتەکانی ئێـران نیشتەجێبوون، خواوەندی جـەنگی هینـدۆ ئێرانییـەکان بـەناوی ئینـدره، لـەم قۆناغەدا، لە وڵاتی ئێـران، گرنگییەکی ئەوتۆی نابێت و خواوەندە ڕۆحـانی و فەرمانڕەواکان ( وەرنە و میترا)، کە سەربە گروپـی ئەسـوورەکان بـوون، لـە دەسەڵات دەمێننەوە، لەکاتێکدا کە بەهاتنی مرۆڤ بـۆ دۆڵـی سـێند، لەگـەڵ چەندین تێکهەڵچوونی بەهێـز بەرەوڕووبوونـەوە و ئەگـەری زۆره بـەم هۆیـەوە خواوەنـدی جـەنگ (ئینـدره)، کەسـەر بـە تـاقمی دێوەکانـە، لـەم قۆناغـەدا گرنگییەکی بەرچاوی بووبێت.

لەم ڕووەوە کاتێک ئاڵوگۆڕە ئایینییەکان دەست پێدەکەن، "ئـاهورا"کـان لـە ئێـــران و دێوەکـان لـە دۆڵـی سـێند، دەبنـە هێمـای خواوەنـدەکان، خواوەنـدەکانیش بەسـەر دوو دەسـتەی خواوەنـدەکان و دژە خواوەنـدەکان دابـەش دەبـن، بـەڵام ئـەم ئـاڵوگۆڕ و دەسـتەبەندییە، کـە تەنانـەت بـە پێچەوانەی دەستەبەندیی ئایینی ئارییایە سەرەتاییەکان بوو، تەنیا توانیی بە بڵاوکردنەوەی چەندین بۆچوون، پاساوێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

ئەگـەر سـەرنج بدەیـن دەبینـین دۆڵـی سـێند و بیابانـەکانی ئێـران لەسەردەمانی زۆر پێشـترەوە کەوتبوونـە ژێـر کاریگـەریی کولتـوری ئاسـیای ڕۆژئاوا و لە بیریشمان نەچێت لە کولتورەکانی ئاسیای ڕۆژئاوادا دوو دەسـتە خواوەنـد و دێـو بوونیـان هـەبوو، کـە هـەردووکیان زادەی دایـک و باوکێـک

بوون. نهێنییەکانی ئەم ئاڵوگۆرە قوڵە لە ئایینەکانی دۆڵی سێند و بیابانی ئێران، بەروونی، بەرچاو دەکەون.

راستییەکەی هەم دۆڵی سێند و هەم بیابانی ئێران، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا تێکەڵییەک لە نێوان ئایینە خۆجییەکان کە بۆخۆیان بەشێکی گرینگ لەو کولتورە ئاسیاییە بوون، لە ئایینی ئارییایی سەرەتاییەکاندا دروست بوو، لێرە بەدواوە ئایینی ئارییاییەکانی هیندۆ ئێران، هەر یەک بەشێوەیەکی جیاواز، پێشکەوتن. لە وڵاتی هیند بیرۆکەی "ئارمانی (ئایدیالیستی)" و پشتکردنە جیهانی مادییات، لە ئێرانیش بیرۆکەی دووفاقەیی (دوالیستی) بەهەڵسوکەوتێکی خۆ پارێزییەوە، بە نیسبەت جیهانی مادییەوە، بەرەوپێشچوو.

## ئایینی دوو فاقەیی
## لە فەرهەنگی ئاسیای رۆژئاوا

ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکان و ئارییایی دێرین، یان بەگشتی ئەفسانەی هیچ هۆزێک، بەدوور لە جۆرێک باوەڕ و روانگەی دوو لایەنە بەسروشت، ناخی مرۆڤ و هێزە دژوارەکان نییە. شەڕی خواوەندە ئاسمانییەکان، کە خواوەندی هەورەتریشقەبوون، لەگەڵ ئەژدیهای وشکانییەکاندا بەدی دەکرێن، بەڵام لە ئەفسانەکانی کولتوری ئاسیای رۆژئاوا بەرواڵەت کێشەکە لەمە گەورەترە و لە بەرانبەر خواوەندەکاندا جیهانێکی دیکە، دژ بە خواوەندەکان راوەستاوە.

لەمیزۆپۆتامیای دێرین، خواوەندی گەورەی یەکجار بەهێز هەبوون، کە هەموویان مەخلوقاتی خۆیان هەبوو، کاریان بۆ دەکرد، بەڵام خەڵک لە ژیانی رۆژانەدا پەیوەندییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەم دەستەیەی خواوەندەکان نەبوو، بەڵکو دەورووبەریان بە رۆح، فریشتە و شەیتان تەندرابوو. دێوێک هەبوو کە خاک و خۆڵی بیابانەکانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و ئەو کەسەی نزای بۆ نەکردبوو لە ناوی دەبرد. لەلایەکی دیکەوە تاقمێک دێو هەبوون، کە هەموو

کات ئامادەبوون ئەو ژن و پیاوانەی نزایان بۆ ناکەن و ئەرکە ئایینییەکانیان جێبەجێ ناکەن، بیانرفێنن و بیانکوژن، ئەگەر کەسێکیشیان بە تەنیا بکەوتبایە بەرچاو، دەیان دزی و دەیانکوشت، کە ئەمەش لە خۆیدا شتێکی تۆقێنەربوو. تەنانەت خواوەندەکانیش، بەدەست ئەم دێوانەوە وەزاڵە هاتبوون لە کاتی ئاوابوونی مانگدا کە بۆ خۆی خواوەندێک بوو. بەم شێوەیە باس دەکەن کە سین، ، خواوەندی مانگ، لەلایەن ئەو دێوانەوە بۆ ماوەیەک وەلا نراوە، بەڵام ئەم تاقمە دێوە دەستەی خواوەندی خراپەبوون، جیهانی خواوەندەکان تێکەڵێک لە خواوەندەکانی خێر و خراپەبوو.

کەوابوو لە هەر بۆنەیەکدا دەبوا پاڕانەوە و نزاکردنێکی تایبەت هەبوایە. لە گیرانی خۆر و مانگ، لەکاتی لە دایکبوونی منداڵ و لە کاتی نەخۆشکەوتن و لەجێداکەوتن و هەروەها کە کەسیک بە تەنیا بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، یان لەسەر سفرە دادەنیشت و هتد ... دەبوا بەشێوەیەکی تایبەت بپاڕایەتەوە بۆ ئەوەی لە هێرشی دێوەکان بەدوور بێت و بە سوچ و تاوانەوە نەگلێت. هەروەها پێویستبوو داوا بکەن لەو خواوەند و ڕۆح و فریشتانەی، کە لەساتە جۆراوجۆرەکاندا پارێزەری مرۆڤەکان بوون، کە لە شەڕ و خراپەی دێوەکان رزگاریان بێت، هەروەها دەبوا پەنایان بۆ دێوەکان بردبا و جادوویان کردبا، تەنانەت خواوەندی مەزنی وەک "مەردۆخ"یش لە شەڕ لەگەڵ تیامت، هانای بۆ شوێنێک دەبرد و دواتر لەسەر گاشە بەردەکان کۆمەڵێک وێنەی دێویان هەڵدەکەند، کە نزایان بۆ دێوەکان دەکرد، هەتا بەم شێوەیە لە شەڕی دێوان بەدوور بن. ڕێژەی دێوەکان دەگەیشتە حەوت دانە، بەڵام ڕێژەی گشتیی دێوەکان لەم حەوت دانەیە گەلێک پتربوو.

دێو و خواوەندەکان، چەند دەستەیەک ڕۆحی خێر و شەڕبوون، کە سەرجەمیان لە یەک سەرچاوەوە دروست ببوون و ئەو سەرچاوەی دێو — خواوەند، خواوەند — باوک، یان دایک و باوکی یەکەمی دێو و خواوەندەکان بوو کە لە ئەفسانەکانی میزۆپۆتامیادا (بابلی، ئاشووری = ئەکەدی) تیمات و ئەپسوو، دوو دێو ـ خواوەندی سەرەتایی بوون و جار جارەش ئەم خواوەندی

خراپەکارییانە بە نەوەی ئانوو دەناسران، کە لە کوێستانەکانی رۆژئاوا حەوابوونەوە.

چیرۆکێکی دێرینی ناوچەی میزۆپۆتامیا، کە هەتا وڵاتانی دراوسێ رۆیشتبوو، چیرۆکی ئەپوو و دوو منداڵەکەی خێر و شەڕ بوو، کە تەنانەت لە ئەدەبیاتی هیتییەکانیشدا رەنگی دابوەوە. ئەم چیرۆکە بەشێوەی چیرۆکی بەعل و شەڕ، بەعل و مەرگ، بەعل و دەریا لە ئەفسانەی هیتییەکاندا دەبیندرێت. هەروەها کوومەربی، خواوەند - باوکی هیتی، دوو وەچەی لێدەکەوێتەوە: یەکەم تشووب، خواوەندی جەنگاوەر و ئاسمان، دووەمیش منداڵی بەردین دوژمنی تشووب، کە لە ژێر ئاودا دەژی.

هەروەها لە کولتووری سووریای دێرینیش ئەم جۆرە دووفاقەییە (خواوەندی شەڕ و خێر)، کە سەرجەمیان منداڵی خواوەند — باوکی سەرەتا بوون، بەرچاو دەکەوێت.

دووفاقەیی لە ئاسیای رۆژئاوا، تەنانەت لە بیرۆکەی عیبرییەکان (هۆزی یەکەمی جوولەکەکان)یشدا دەبیندرێت. لە شیعری عیبریدا باس لە مردن دەکرێ و ئایینەکەیان زۆر بەهێز بووە. عیبرییەکان دڵی هێزە شەیتانییەکانیان بە نزا و پارانەوە بەدەست دەهێنا و هاوکات دڵی خواوەندەکانیشیان لە خۆیان رازی دەکرد. ئەم ئایینە لە رێورەسمی بەرزڕاگرتنی ئایینی سس لە میسر دەبینرێت، کە ئۆزیروس بە دەستی براکەی خۆی دەکوژرێت.

لە چاخی نوێدا، یادی بەعل - زبووب (Ba, al — Zebub) فەرمانڕەواکان ٢، ٣، ٦، ١٦) دەکرێتەوەو دەگوترێ زەبووب شەیتانێکی یەکجار بەهێز و شازادەی نێو دێوەکان بووە، لە ئایینی ئاسیای رۆژئاوادا هاتووە شەیتان بە دەستی خواوەند و فریشتەیەکی سەرپێچیکار دروست کراوە.

هاوکات لەنێو کۆنترین ڤیداییەکان لە هیند، کە باس لە ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکان دەکات، تەنیا ئاماژەیەکی بچووک بە شەڕی خواوەندی

جەنگاوەر و باران دەکرێت، کە لە گەڵ ئەژدیهایەکی تۆقێنـەری وەک ورتـرە، دێوی وشکانی، بەشەڕ دێت و لە ناوی دەبات و دەبێتە هـۆی بـاران بـارین و خێر و بەرەکەت.

بـەڵام ئـەم بیرۆکەیـە لـە کۆتاییـەکانی دەورەی ڤیداییەکانـدا بەگشـتی، ئـــاڵوگۆڕی بەســـەردا دێـــت و لەگـــەڵ دوو جـــۆر جیهـــانبینیی جیـــاواز بەرەورووەبێتەوە، کە لەوێدا جیهانی devaas خواوەندەکان دێوەکان

لەهەمبـەر جیهــانی دژە خواوەندەکانــدا (ئەســوورەکان) رادەوەســتن، بەتایبەت بەپێی ئەم نووسراوانە دەردەکەوێ کـە دێـو و ئەفسـانەکان، واتـە خواوەندەکانی خێـر و شەڕ، هەر دوو تاقم وەچەی پەرەجاپەتی، خواوەنـد ـ باوکی یەکەم بوون کە لە سەرەتادا هاوتاو وێکچووی یەکتـر بوون و تەنانەت زۆر جاریش بە دێو ناو دەبرێن. ئەگەر باش سەرنج بـدەین، دەبینـین کـە لـە بۆچوونی زۆروانیـی ئێرانییەکانیشـدا بەهـەمان شـێوە ئـەم چیرۆکـە دووپـات دەبێتـــەوە و تـــەنیا جێگـــەی ناوەکـــان گـــۆڕانی بەســـەردا دێـــت، واتـــە "ئەسـوورەکان (ئێــرانی: ئـاهورا) خواوەنـد و دێوەکـان ئێـرانی: دێـوە)

(daiva / daevaوەک شـەیتان ئـەژمار دەکـرێن و هـەر دوو تـاقم لـە وەچـەی زۆروانــن، بۆیــە بــەناچاری ئــەو ئاڵوگۆڕانــەی کــە هــەر یەکــەی بەشێوەیەکی سروشتی و جیاواز لە یەکتر، لە دۆڵی سێند و بیابـانی ئێــران روویانـداوە، ئاڵوگۆڕێـک بـوون کـە تـەنیا لـە بەرەورووبوونـەوە لەگـەڵ ئـەو شارستانییەتە خۆجێیـەی ئاسـیای رۆژئـاوادا بـەدیهاتوون، کەوابوو پێویسـتە بەشـێوەیەکی بەراوردکارانـە ئەفسـانەکانی ئاسـیای رۆژئـاوا لێـک بدەینـەوەو هەڵســەنگاندنیان بـۆ بکـەین. ئەگـەر دروســت بێـت کـە لـە ناوچـەکانی "میزۆپۆتامیا و یۆنان"یش هەمان پێکهاتەی خواوەند ـ باوک و هەمان رەوتـی سـەرچاوەگرتن لـە خواوەنـدەکان و دژە خواوەنـدەکان لـە خواوەنـد ـ بـاوک بوونیان هـەبووە، دەبینـین و دەشـزانین کـە ئەفسـانە یۆنانییـەکان، کـە لـەم حاڵەتەدا کاریگەریی ئەفسانەکانی کەنعانی و ئاسیای بچوکیان لەسـەر بـووە، لەو ناوچانەشدا هەمان شێوە ئەفسـانەی خواوەنـد ـ بـاوک و هـەمان رەوتـی

سەرچاوەگرتن لە خواوەند و دێوەکان بوونیان هەبووە، ئەگەریش ئەو بەڵگە ئاسەوارناسیانەی، کە سەبارەت بە پەرەسەندن و پێشکەوتنی کولتووری ئاسیای رۆژئاوا لە شوێنێکەوە بۆ دۆڵی سێند و لەلایەکی دیکەوە بۆ باڵکان و بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەتا یۆنان و میسر لەبەرچاو بگرین، دەبێ بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە پەرەسەندنی دووفاقەیی (خواوەندەکان و دژە خواوەندەکان) لە ڤیداییەکانی هیند و بیرۆکەی دووفاقەیی ئێرانییش، لەژێر کاریگەریی دووفاقەیی ئاسیای رۆژئاوادا بووە. ئەم رەوتە بەم شێوە و پێکهاتەیە، لەگەڵ ئەفسانەکانی هیندۆ ئێرانی و هیندۆ ئەورووپاییدا بوونی نەبووە.

ئاوڕدانەوە لە نووسراوەکان و بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ پێکهاتەی هۆرەمەزد و هەبوونی سپەنتامین و ئەهریمەن، هێمای ئەفسانەیەکی دیکەی ئاسیای رۆژئاوایە. بە پێی وتەی پێشینان سپەنتامینوو و ئەهریمەن لقە دوانەی یەکترن، کە هۆرەمەزد باوکی ئەو دوانە بووە، کە ئەمە خۆی پێکهاتەیەکی ئایینیی سەردەمی ساسانییەکان، لە وڵاتی ئێران، بووە.

**ئەگەر بەکورتی بیڵێین و هەڵوێستی خۆمان بەڕوونی دەربڕین:**

دەکرێ ئەفسانەی سەرجەم هۆزەکان هەڵگری کۆمەڵێک روانگەی دوولایەنەبن، کە لەهەر بەشێک لەئەفسانەکاندا، بایەخ و پێگەی جیاوازو خاوەن پێکهاتەو ناوەڕۆکی تایبەت بەخۆی بێت.

لەئەفسانەکانی سەربە کولتوری ئاسیای رۆژئاوا، روانگەیەکی نوسووڵی لەئارادا بووە، کە بەو پێیە:

١. لەخواوەند – باوکی یەکەمین دوودەستە خواوەندی لێ کەوتنەوە. یەکەم: خواوەندی بەخشندە و خێر و بەرەکەت، دووەم: خواوەندی خوڵقێنەری شەڕ و ئاژاوە، کە ئەم گروپە بەناوی دێو (لە یۆنان و تیتان)و رۆحی ناپاک دەناسران.

٢. خواوەندی شەڕ و ئاژاوە لە ئەفسانە هیندۆ ئەورووپاییەکان، بەتایبەت لە ئەفسانەی هیندۆ ئێرانییە دێرینەکان بەرچاو دەکەوێت. هەر چەند لە

ئەفسانەی هیندۆ ئێرانییەکان، جیهانی خواوەندەکان بەسەر دوو دەستە و بە دوو ئەرکی جیاواز دابەش دەکرێن، بەڵام ئەم دابەشکردنە پەیوەندیی بەخواوەندەکانی خێر و شەڕەوە نییە. لە ئەفسانەکانی هیندۆ ئێرانیدا تەنیا ئەژدیهای وشکانی و شەڕە بێ وچانەکەی لەگەڵ خواوەندی جەنگاوەر و بارێنەری باران دەبیندرێت، کە بۆ خۆی لە ژێر کاریگەریی ئەفسانەکانی ئاسیای رۆژئاوادا بووە.

٣. پاش ئەوەی ئارییاییەکان گەیشتنە دۆڵی سێند و پێدەشتەکانی ئێران و لەگەڵ کولتوری پێشکەوتووی ئاسیای رۆژئاوا بەرەورووبوونەوە، خواوەندی ئارییاییەکان، بەسەر دوو دەستە خواوەندەکانی خێر و خواوەندەکانی شەڕ دابەش بوون و دەستەی خواوەندەکانی شەڕ، ناوبانگی دژە خواوەندەکان و شەیتانیان بەسەردا برا.

٤. ئەم جۆرە تێڕوانینەی هەڵقوڵاوی ئاسیای رۆژئاوا، بەشێوەیەکی بەرچاو پانتایی وڵاتی ئێران دەگرێتەوە و خواوەندی خێر و خواوەندی شەڕ دەبنە چوارچێوەی ئایینە ئێرانییەکان، کە ئەم چەشنە تێڕوانینە لە ئایینی هیچ یەکێک لە هۆزەکانیدیکەی ئاسیای رۆژئاوادا بەرچاو ناکەوێت.

٥. لەئێران هێزی شەڕ و ئاژاوە دەبێتە هێمای شەیتان (ئەهریمەن)، کە ئەمە لە بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشیدا بەرچاو ناکەوێت، بەڵام لە سەردەمانی دێریندا روون دەبێتەوە. بەپێی ئەو بەڵگانەی لەبەر دەستدان، ئەهریمەن لە سەردەمی "زەردەشت"دا وەک هێماو سەرچاوەی هێزەکانی شەڕو ئاژاوە لەئێراندا ناسراوە.

## بەشی دووەم

### ئایینی زەردەشت و ئایینی سەر بەردەنووسەکان

### گاتاکان و ناوەڕۆکەکەی

گاتا، بەواتای سرروودە ئایینەکانی زەردەشتە، کە لەئەدەبیاتی سەردەمی ساسانییەکاندا بە گاتاکان ناودێر کراوە. سرروودەکانی زەردەشت لە "یەسنا (لەبەشێکی ستایشکردن)"دا، کە بەشێک لە ئەدەبیاتی ئاڤێستاییە، هاتووە. نزاکان بە گشتی لە ٧٢ هات پێکهاتووە، کە حەڤدە هاتیان تەنیا لە گاتاکان پێکهاتوون. ئەم حەڤدە هاتە لەپێنج گاتادا کۆکراونەتەوە.

١. بەپێی نووسراوەی گاتاکانی زەردەشت، لە جیهاندا دوو ئەسڵی ئەشە و درۆ هەن. ئەشە هێمای نەزم و راستی و پاکییە، درۆش هێمای ئاژاوەو ناپاکییە.

راستییەکەی، ئەم جیهانە بەرینەش، هاوشێوەی جیهانی بچووکی مرۆڤەکانە. بە هەمان شێوە، کە لەنێوان مرۆڤەکاندا، پاکی و ناپاکی هەیە، لەم جیهانە بەرینەشدا، ئەم دوو هێزە بوونیان هەیەو لە حاڵی ململانێدان.

٢. ئاهورامەزدا، (یەزدانی زانا)، خواوەندی گەورەیەو سپەنتامینوو، هێمای هێزی ئافراندنیەتی. ئەهریمەن و سپەنتامینوو لقە دوانەی یەکترن و ئەهریمەن (شەیتان) هێمای خراپە و لە ناوبردنە.

سپەنتامینوو هێمای راستییە و یەزدانی زاناش پشتیوانیەتی. ئەهریمەن هێمای درۆ و ناپاکییە. سپەنتامینوو هێمای چاکە و راستییەکانە، ئەهریمەن سەرجەم خراپە و درۆکانە.

کورت و پوخت:

سپەنتامینوو:

هێمای راستی، هەبوون و چاکەیە (ئاڤێستا)

ئەهریمەن یان شەیتان:

هێمای درۆ، پووچی و خراپەیە (ئاڤێستا)

بەم شێوەیە، جیهانی مادی، خولقێندراوی سپەنتامینووە و ئاهوورامەزدا (یەزدانی زانا) خواوەندی هەموو جیهانە.

٣. سپەنتامینوو و ئەهریمەن لە بیرو باوەڕ، ئاخافتن و کردەوەدا، دوژمنی یەکترن.

ئاهوورامەزدا جیا لە بەهەشتی پیرۆز بە یەکێک لەو حەوت هێمایە دادەنرێت، کە لە ناوناچن و پاشان بە "ئەمشاسپەند" (emshaspend)ناوبانگ دەر دەکات. شەش هێمای دیکەشی بەناوەکانی "ڤەهوومەنە، ئەشاڤەهیشتا، خشەترەڤەیریە، سپەنتا ئارمەیتی، هەئورڤەتات و ئەمێرەتات" هەیە...

ڤەهوومەنە): ئاڤێستای Vohu. manah (پاش بەهەشتی پیرۆز بە باشترین هێمای ئەهوورامەزدا ئەژمار دەکرێت. لە کۆتایی جیهاندا ئاکاری مرۆڤەکان هەڵدەسەنگێنی و زەردەشت بەرەو لای ئەهوورامەزدا ڕێنوێنی دەکات. واتای ناوەکەی ئەندێشە و ڕەوشت پاکیە و بۆ خۆی پارێزەری مرۆڤەکانە.

ئەشاڤەهیشتا بە واتای "جوانترین ڕاستی"یە کە ئاهوورامەزدا لە هێزی زانایی خۆی خولقاندویەتی، کە پارێزگاری لە سروشت دەکات و چاودێریی ئاگریشی لە ئەستۆیە. ئەشاڤەهیشتا : بە واتای پاشایەکی شیاو، کە پارێزگاری لە کانزاکان دەکات و هێمای پاشایەکی خواوەندییە. سپەنتا ئارمەیتی بەواتای "ئەندیشە و فیداکاریی پیرۆز"ـە. ئەو کە بۆ خۆی خاتوونی خواوەندی سەر زەوی و کچی ئاهوورامەزدایە، مامۆستای خولقێنەرانە. هەئورڤەتات بەواتای "کامڵبوون" کە پارێزگاری لە ئاو دەکات. ئەمێرەتات بە مانای "هەرمان"ـە کە پارێزگاری لە گژوگیا و خواردەمەنییەکان دەکات، کە ناوەکەی پاش هەئورڤەتات دێت.

٤. ئەهریمەن دێوەکانی خولقاند

ئەکوومن) : ئاڤێستا aka. Manah (بە مانای ئەندێشەی خراپەیە، کە شەڕ و ئاژاوەی لە ئەستۆیە.

تووڕەیی (aēšma)

بە مانای پەلەکردنە، کە خراپەکاران پەنای بۆ دەبەن و باوەڕمەندانی پاکی لەگەڵیدا بەشەر دێن. ئەو دوژمنایەتیی سوپاو لەشکر دەکات. دواتر شەش دێوی زەبەلاحی دیکەش، لە ئاڤێستای نوێدا، دەچنە پاڵ ئەکوومن و بەرەوڕووی "ئەمشاسپەنتان" دەبنەوە.

٥. ئاگری پیرۆز هێمای راستی و داوێن پاکییە.

٦. شەڕی نێوان پەیڕەوانی راستی و پەیڕەوانی درۆ لە هەموو جیهدان بوونی هەیە و هەتا لە ناوبردنی درۆ بەردەوام دەبێت. لەم شەڕەدا، دینی راستەقینەی زەردەشت رێنوێنی مرۆڤەکانە، لەگەڵ درۆ لەباری شەڕدایە.

٧. لەم شەڕە بەرفراوانەدا سەرجەم توخمەکانی سەرزەوی ، ئازادانە مافی هەڵبژاردنیان هەیە، تەنانەت دێوەکانیش دەتوانن بە ئازادی درۆ هەڵبژێرن، کەئەمە نیشانەی هەڵبژاردن و ئازادییە لەهەمبەر زەبروزەنگ، کە لە نێو دەقە گاتاییەکان دایە.

ئاهورامەزدا دادوەر و چاودێری کۆتایی ئەو شەڕەیە.

### تایبەتمەندییەکانی ئاهورامەزدا

١. خواوەندێکی گەورەیەو بۆ خۆی زانایەو هێمای زانست و تێگیشتنە و خواوەندێکی تاق و تەنیایە.

٢. خوڵقێنەری گشت جیهانی مادی و سپەنتامینووە، کە ناسناوی "دادار" واتا خوڵقێنەری پێدراوە.

٣. باوکی سپەنتامینوو و ئەهریمەنە و باوکی هەرمانی خێر و بەرەکەتە.

٤. دادوەریکی مەزن و زانایە.

٥. پشتیوانی راستییە و دژایەتیی درۆ دەکات.

٦. ئەمشاسپەنتان و بەرەکەت هێمای ئەون. (دەبێ سەرنج بدەین، کە ناوی هەرمانی خێر و بەرەکەت، دواتر بەدی دێت و لەنێو گاتاکاندا ئەم ناوە بوونی نییە).

## جیهـــــان

١. جیهان لە دوو بەشی مادی و مەعنەوی پێکهاتووە کە هەردووکیان بەدەستی ئاهوورامەزدا خولقێندراون.

بەم پێیە جیهانی مادی خراپ و ناپاک نییە و پێویست ناکا دژایەتیی بکرێت.

٢. جیهانی مادی لە زەوی و ئاسمان و ئەو توخم و فاکتەرانە پێکهاتووە، کە لە ئاسمان خولقاون، وەک ئاسمان، ئاو، زەوی، گیا، ئاژەڵ و مرۆڤ.

٣. بەهەشت و جەهەنەم بوونیان هەیە، کە پێدەچێ گەرزمان (=ئاسمان) باشترین بەهەشت بێت.

٤. لەکۆتاییدا ئاگرێکی بەرین لەناخی چیاکانەوە دروست دەبێ و خراپەکاران و ناپاکان لە ناودەبات.

٥. بەڵێنەکانی ئایینی زەردەشت (سوشیانت) لەسەردەمانی جۆراوجۆردا بۆ رێنوێنی و رزگاریی ئینسانەکان بەکاردێن.

٦. ئینسان لەپاش مەرگ دەبێ لەپردی چینوەت بپەڕێتەوە، کە تاوانبار و گوناهباران ناتوانن لێیبپەڕنەوە.

## ئینسان

١. بەهمەن لە خولقاندن و رێنوێنیکردنی ئینسان بەرەو لای ئاهوورامەزدا رۆڵێکی کاریگەری هەیە.

٢. ئایین بۆ رێنوێنیکردنی ئینسانەکان دروستکراوە.

۲. خواوەند هزر و تێگەیشتن ئەدا بە ئینسانەکان هەتا بتوانن ئازادانە ڕێگەی ڕاستی هەڵبژێرن، کەوابوو ئینسان خاوەن سەربەخۆییە. هۆرمەزد و ئینسان، هەردووکیان، خاوەن هزر و تێگەیشتنن.

٤. ئاکاری چاکە، هزری چاکە و ئاخاوتنی چاکە ڕێنوێنی ئینسانەکانن، سرووش یەشت پەیامهێنەری خواوەند و زەردەشت پێغەمبەری هەمان سرووش یەشت بوو. بەڵێنەکانی ئایینی زەردەشت ڕزگارکەری ئینسانەکانن.

٥. بۆ ئینسانەکان بەهەشت و جەهەنەم دروستکراوە.

لەکۆمەڵگەدا سیستەمی چینایەتی بوونی نییە. لە گاتاکاندا سەبارەت بە ئابووری ئاماژە بە ئاژەڵداری کراوە.

جەم / جەمشید گۆشت خواردنی فێری ئینسان کرد و بۆ خۆی گوناهبار بوو.

## ئایینی زەدەشتیی نوێ
## (ئاڤێستای بەدەر لە گاتاکان و ئەدەبیاتی پەهلەوی)

زۆربەی بەڵگەکانی ئێمە بۆ یەسنا، یەشت و وەندیداد (بەشی یەکەمی ئاڤێستا) دەگەڕێتەوە. "یەسنا و یەشت" هەردووکیان، لە yaz واتای "پەرستن و ستایش کردن"ەوە هاتوون. ڕیشەی ئەگەری زۆرە ناوەڕۆکی مانایی یەسنا و یەشت پەیوەندی بەشادی و جەژنەوە هەبێت.

بەگشتی، ستایشی خواوەندەکان، لەلای ئێرانییەکان و بەڕێوەبردنی وەها ڕێوڕەسمێک پەیوەندی بە جەژن و شادییەوە بووە. چەمکی (ندیداد) لە بنەڕەتدا پەهلەوی vidévdād بووە و بە واتای "یاسا ( = داد) یاسای دژ بە دێو" کە زۆربەی یاساکانی زەردەشتی لەخۆدەگرێت.

۱. لەئایینی نوێی زەردەشتیدا : پێگەی ئاهوورامەزدا هەتا ئاستی سپەنتامینوو دادەبەزێت و تێکەڵ بە یەک دەبن و بەرەوڕووی ئەهریمەن دەبێتەوە.

٢. پاش ئاهوورامەزدا، ئەمشاسپەنتان (فریشتەی خێر/ پیرۆز) دێتە ریزی ئەمشاسپەنتانەوە، کە بەگشتی حەوت دانەن.

٣. لەهەمبەر ئەمشاسپەنتاندا، دێوی خراپە راوەستاوە. دێوی خراپە (کەمالە) لەم قۆناغەدا سەرهەڵئەدا و هاوڕێ لەگەڵ ئەهریمەن حەوت فاقەییەک پێکدێنن.

ئەو حەوت دێوە ناپاکە بریتین لە : ئەکومن لە هەمبەر ئەهریمەن، ئەندر لە هەمبەر ئەشاڤەهیشتا، ساوول لە هەمبەر خشەترەڤەیریە، ناگهیس لە هەمبەر سپەنتا ئارمەیتی (فریشتەی پارێزەری دار و زەوی و سروشت)، تەریز و زەریز لە هەمبەر هەئووڤەتات و ئامیرەتات، رادەوەستن.

پاش ئەمشاسپەنتان خواوەندەکان دێن. رێژەیان یەکجار زۆرە. هەر دیاردەیەکی خواوەندیی وەک: ئاسمان و ئاو و ئاگر، تەنانەت رووداوە مەعنەوییەکانیش، خواوەندێکیان هەیە. هەڵبەت خواوەندە سەرەکییەکان زۆر کەمن و سەرجەمیان تاقمێکی سێ کەسی پێکدێنن. خواوەندەکانی دیکە زۆربەیان وەک سپەنتامینوو ئەژمار دەکرێن، وەک : بەهەشتی ئاسمان. زۆر جار سپەنتامینوو و خواوەند هەردووکیان ناوی یەکێک لە دیاردە سروشتییەکانیان هەیە، سەرەڕای ئەمانەش، سەرجەم خواوەندەکان بەسەر دوو دەستەی خواوەندی بەهەشت و خواوەندی مادی— دا، دابەش دەکرێن. پاش خواوەندەکان خوڵقاندنی جیهانی مادی بوونی هەیە کە لە رۆشنایی — ئاگر، لە ئاگر — با، لە با — ئاو، لە ئاو — زەوی و لە زەویش هەموو مادیاتی خوڵقاند، کە لە چوار توخم پێکهاتووە. دواتر، یەکەم جار ئاسمانی دروستکرد کە بووە زیندانی ئەهریمەن، دووەم جار ئاوی دروستکرد بۆ شکاندنی تینویەتیی دێو، سێیەم جاریش زەویی خوڵقاند بۆ رواندنی گیا، چوارەم جار گیای دروستکرد بۆ خۆراکی چوارپێ، پێنجەم جار چوارپێی خوڵقاند بۆ یارمەتیدانی مرۆڤ، دواجاریش مرۆڤی خوڵقاند بۆ لەناوبردنی ئەهریمەن و دێو. ئەهریمەن توانای خوڵقاندنی مادی نەبوو، کە هۆرمەزد بە

بوونـەوەرەکانی نێـو بەهەشـتی شـەیتان لەشـێکی مـادیی پێـدان بـۆ ئـەوەی لەلایەن ئینسانەکانەوە ببینرێن و لە ناویانبەرن، یان لێیان دوور بکەونەوە.

خواوەندە مەزنەکانی ئەم سـەردەمە بـریتین لـە : میهـر، ناهیـد، بـەهرام، تیشتر، وای و سـرووش. کـە لـەم نێوانـەدا میهـر و ناهیـدو وای، گرنگییـەکی تایبەتتریان هەیە، کە لە سەردەمی ویداییدا وێنەیان نییە.

لەم سەردەمەدا دوایین بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشی بوونیـان هەیـەو لـە بـەردە نووسـراوەکانی ئـەم سـەردەمەدا کـە لـە سـەردەمی "ئـەردەشـیری دووەم"ـەوە دەست پێ دەکا، هەمان پێکهاتە و ناوەڕۆکی بەردەنووسراوەکانی سەرەتای هەخامەنشییەکانی هەیـە، واتـا ئاهوورامـەزدا کـە هێمـای راسـتییە، خوڵقێنەری هەموو جیهانە، کـە پـاش ئـەو بغـان (خواوەنـدەکان) دێـن و لـە بەرانبەریشیدا درۆ بوونی هەیە، کە دێو نوێنەرایەتی دەکات.

(نە بەشێوەی ئاڤێستا کـە ئەهریمـەن هێمـای درۆیـە). بـەڵام لـە بـەردە نووسراوەکانی دواییدا باس لە دوو خواوەندی "میهـر و ناهیـد" دەکرێـت، کـە پاتشا داوای یارمەتی لە ئەهوورا مەزدا و ئەم دوو خواوەندە دەکات.

راسـتییەکەی، لـە یـەک سـەردەمدا، میهـر و ناهیـد لـە ئاڤێسـتا و بەردەنووسراوەکانی هەخامەنشیدا دەگەنە ئەوپەڕی دەسەڵات.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا، پێکهاتەی ئایین لە گاتاکان و ئاڤێستای نوێدا (ئـاییـنی زەردەشـت و ئـاییـنی زەردەشـتی)و سـەرەتاییترین و دوایـین بەردەنووسراو دەخەینە روو:

**گاتاکان ٦٠٠-٩٠٠ی پێش زایین**

١. لەجیهاندا دوو هێـزی راستی و درۆ بوونیان هەیە.

٢. سـێیانی گاتاکـان کـە ئاهوورامـەزدا لـە ناوەڕاسـتیاندایە، پشـتیوانی لەراستی و خواوەند دەکەن و سپەنتامینوو و ئەهریمەن وەچەی ئەون.

هۆرمەزد

سێیانی

بەهەشتی پیرۆز

(هێمای راستی)

ئەهریمەن

(هێمای درۆ)

٣. ئەمشاسپەنتان

سپەنتامینوو

ڤەهوومەنە

ئەشاڤەهیشتا

خشەترەڤەیریە

ئەکوومن

سپەنتائارمەیتی فریشتەی پارێزەری زەوی و دارستانەکان

توورەپی

هەئورڤەتات

ئەمێرەتات

٤. (سرووش) پەیامهێنەر.

٥. هۆرەمەزد خوڵقێنەری هەموو جیهانە (مادی و مەعنەوی).

٦. رێـز بۆ ئاگری پاقژ دابنرێت.

٧. بەهەشت و جەهەنەم بوونیان هەیە.

دەکرێ لە نیوان ئەشـە (راسـتی) و درۆدا یـەکیان هـەڵبژێریت و زۆرەملـێ بوونی نییە.

## ئاڤێستای نوێ

بەئەگەری زۆر هەتا ٢٠٠ بۆ ٣٠٠ ساڵ ٦٠٠ ساڵ پێش زایین).(

١. دووفاقەیی.

٢. هۆرەمەزد = سپەنتامینوو (هێمای راستی)، ئەهریمەن (هێمای درۆ).

٣. (ئەمشاسپەنتان (دێوەکان).

٤. (خواوەندەکان (دیوەکان)

٥. هەموو جیهانی مادی و بەشێک لە بەهەشت بەدەستی هۆرەمەزد خولٌقێندراوە.

ئەهریمەن خولٌقێنەری جەحەنەمی خراپەکارانە.
چوار توخمی: ئاگر، با، ئاو و خۆڵ
مادی: ئاسمان، ئاو، زەوی، گیا، بوونەوەر و ئینسان.
٦. رێز بۆ ئاگری پاقژ دابنرێ.
٧. بەهەشت و جەحەنەم بوونیان هەیە.
٨. هێز و دەسەلآتی هەندێک لە خواوەندەکان یەکجار زۆرە و هەندێک جاریش هاوتای دەسەلآتی هۆرەمەزدە.
هاوتای میهر و ناهید کە هۆکاری هێــزی رۆحانییەت، جەنگاوەری و بەرهەمهێنانن، بوونی نییە.

**سەرەتاییترین بەردە نووسراوەکان**
**٥٥٠ هەتا ٤٠٠ ساڵ پێش زایین**
١. راستی لە هەمبەر ناپاکیدا.
٢. ئەهوورامەزدا (هێمای پشتیوانی و راستی).
٣. بەغ (خواوەند) لە هەمبەر دێوەکاندا.
٤. ئەهورامەزدا خولٌقێنەری هەموو جیهانە.
٥. رێز بۆ ئاگری پاقژ دابنرێ.

**دوایین بەردە نووسراوەکان**
**(٤٠٠ ساڵ پێش زایین هەتا ٣٣٠ ساڵ پێش زایین)**
١. راستی لە هەمبەر درۆ.
٢. ئاهوورامەزدا پشتیوان و هێماری راستی.
٣. بەغان لە هەمبەر دێوەکاندا.

٤. لەنێوان بەغ (خواوەند)ـەکاندا، دوو خواوەندی میهر و ئەناهید هەن، کە بە هاوکار و یارمەتیدەری ئاهوورامەزدا دادەنرێن.

٥. ئاهوورامەزدا خولقێنەری گشتییە.

٦. رێز بۆ ئاگری پاقژ دابنرێ.

بەبەراوردکردنی سەرەتا و دوایین بەردە نووسراوەکانی ئەو دوو سەردەمە، لەگەڵ بەردە نووسراوەکانی سەردەمی گاتاکان و ئاڤێستای نوێ، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە :

١. هەخامەنشییەکان زەردەشتی نەبوون، هەرچەندە بەپێی بەڵگە مێژووییەکانی دیکە، دەتوانین باوەڕ بکەین کە ئایینی زەردەشتی لە نیوەی دووەمی دەسەڵاتداریەتیی هەخامەنشییەکاندا، نەک تەنیا لە وڵاتی ئێران، بەڵکو لە ئاسیای بچووک و میزۆپۆتامیاشدا، بەشێوەیەکی بەرین، بڵاو ببووەوە.

٢. هەرچەند ئایینی هەخامەنشییەکان لەگەڵ زەردەشت یەک نەبووە، بەڵام ئەم دوو ئایینە، پەیوەندییەکی قووڵیان لەگەڵ یەکتر هەبووە، کە سەرچاوەکەی بۆ فەرهەنگێکی هاوبەشی دێرین دەگەڕێتەوە.

ئەلف: باوەڕمەندبوون بە راستی/ ئەشە (راستی) لە هەمبەر درۆ.

ب: باوەڕمەندبوون بە ئەهوورامەزدا، کە خاوەندی سەرتاسەری جیهانە و خواوەندی عەدالەت و یەکسانییە.

ج: باوەڕمەندی بە خواوەندەکان و خولقێنەران، کە تەنیا جیاوازی لە ناوەکانیاندا هەیە، بەڵام لە ئەرک گرتنەئەستۆدا جیاوازییەکیان نییە.

د: رێزدانان بۆ ئاگر.

هـ: باوەڕمەندی بەوەی جیهان بە دەستی خواوەند دروست کراوە..

و: باوەڕمەندبوون بە هەبوونی دێو، دەرخەری ئەوەیە کە هەر دوو ئایینەکە،یەک سەرچاوەیان هەیە، هەرچەند ئەم سەرچاوەیە پاش جیابوونەوەی هیندووەکان پێکهاتووە و هیچ پەیوەندی بە ئایینی هیند و ئێرانی (ئاریایی) نییەو دەتوانین بەئایینی ئێرانی ناودێری بکەین.

٣. بەراوردکردنی ئایینی زەردەشتی و هەخامەنشی (گاتاکان) ئامـاژە بـە پێشینەتربوونی ئایینی هەخامەنشییەکان دەکات، لە هەمان کاتیشدا بە نەزم و پێشکەوتووتربوونی ئایینی زەردەشتی روون دەبێتەوەو پێدەچێ ئەهریمەن و ئەمشاسپەنتان ( فریشتەکان) ئاکامی داهێنانـەکانی پێغەمبـەر زەردەشـت بن.

٤. ٤. ٤، ٤ گرنگیی هەر دوو فریشتەی میهر و ناهید لە ئاڤێستای نوێ و دوایین بەردەنووسراوەکانی سەردەمی هەخامەنشییەکان، کـە هـەردووکیان لـە سـەردەمێکدا بـوون، ئامـاژە بـە پێکـەوەژیانی هۆزەکـان لـە پێدەشـتەکانی ئێـرانی ئەمڕۆدا دەکەن.

٥. دەتـوانین لایـەنی هاوبەشـی هـەر دوو ئـایینی بەردەنووسـراوەکان و ئایینی زەدەشتی، وەک ئایینی ئێـرانییە سەرەتاییەکان، پێناسە بکەیـن.

## بەراوردکردنی ئایینی ئێرانییە سەرەتاییەکان
## لەگەڵ ئایینی هیندۆ ئێـرانییە سەرەتاییەکان
(= ئارياییە سەرەتاییەکان )

١. بنچینـــەی خواوەنـــدی ئارياییـــەکان، بەســـەر ســـێ چینـــی جیـــاواز دابەشکراوەو ئاهوورامەزداش هێمای سەرجەم هێـزەکانی سەرزەوییە.

٢. خواوەندو فریشتەکانیدیکە ئەو رمێن و گرنگییـەی پێشـوویان نـەماوە، بـەڵام دواتـر زۆریـان، وەک میهـر و ئاناهیـت، هێـز و دەسـەڵاتێکی مـەزنیان وەدەست هێناو بۆخۆیان هەر سێ ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەیان بە ئەسـتۆگرت و لەوپەڕی بەهێزیدا، لە ئاهوورامەزدا، نزیکبوونەوە. لەقۆناغی ئاڤێسـتای نوێـدا زۆرێک لە خواوەندە ئارياییەکان خویا دەبنـەوە کـە هەنـدیکیان وەک "ڤـەیۆ" گۆڕانکاریی قووڵیان بەسەردا هاتووە.

٣. (وەروونـە) لـە دەسـەڵات کـەوتووە و خواوەنـدێکی بـەهێزی نـوێ کـە هێمای زانایی و تێگەیشتوویی بووە، جێگەی گرتۆتەوە. لـەم پەیوەندییـەدا و لە گەلێک پەیوەندیی دیکەشدا، ئاهوورامەزدا لەگـەڵ خواوەنـدی میزۆپۆتامیـا

"ئـەنكی"ی سـۆمەریی دێـرین بەرانبـەر "ئـێ ئـا" (Ea) زیـاتر لـە هـەموو خواوندەكان، وێكچوویان هەیە.

٤. حەوت فریشتە و دواتریش حەت دێو، بە پیرۆزیی ژمارەی حەوتـەوە، لـە حـەوت خواوەنـد، هـەروەها دێوەكـانی ئاسـیای رۆژئـاوا، نزیكایـەتییان هەبووە.

٥. هێمای ئەركـە كۆمەلآیەتییـە سـێ لایەنـەكانی "ناهیـد و میهـر"یش لـە ئاڤێستا نوێ و دوایین بەردە نووسراوەكانی میزۆپۆتامیادا بەرچاو دەكەون.

٦. ئەرتـە (راسـتی) لـە ئـایینی ئاریاییـە سـەرەتاییەكان و ئایینـە ئێرانییەكانـدا گرنگییـەكی هاوبەشـی بـووە، بـەڵام درۆ لـە ئـایینی ئێرانیـدا بایەخێكی تایبەتی پێدراوە، كە لـە ئـەدەبیاتی ڤیـدایی دێـرین بـەم شـێوەیە نەبووە و پەرەسەندنی ئەم چەمكـە و واتاكـەی، ئامـاژە بـە بەرەورووبوونـەوە لەگەڵ راستیدا دەكەن.

٧. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، كۆمەڵێك ناوی خواوەندەكان، لە هـەر دوو ئاییندا، هاوشێوەی یەكترن و كۆمـەڵێك وێكچـووی ئـایینیش لـە هـەر دوولادا بەرچاو دەكەون. راستییەكەی ئایینە ئێـرانییەكان لەگەڵ ئایینی ئاریاییەكانی سـەرەتا و ئـایینی خـۆجێیی پێدەشـتەكانی ئێـران و میزۆپۆتامیـا، تێكـەڵ بەیەكتـربوون.

٨. دابەشكردنی هێـز و دەسـەڵات لـە نێـوان دوو هێـزی دوژمنـی یـەكتر (واتـە خواوەنـد و دێوەكـان) لـە ئـایینی ئاریاییەكانـدا نـەبووە، بـەڵكو ئـەم مەسەلەیە، لە پێكهاتەی میزۆپۆتامییەكان پتر نزیكبووە.

## هەڵسەنگاندنی ئایینە زەردەشتییەكان و بەردە نووسراوەكانی پەیوەندیدار بە ئایینی میزۆپۆتامیایی

ئاهورامەزدا كەسایەتییەكی یەكجار نزیكی لەگەڵ "ئـەنكی"ی سـۆمەری لە سەردەمی دێرینی میزۆپۆتامیا و "ئێنا"ی سۆمەریدا هەیە،

هـــەردووكيان خواوەنـــدی زانـــایی، هـــەردووكيان خولّقێنـــەری جيهـــان، هـــەردووكيان هێمـــای دادوەری و هـــەردووكيان يارمەتيـــدەری كاروبـــاری بەرهەمهێنان و رزق و رۆزی و هەردووكيشيان دەسەلاّتدار و فەرمانڕەوان.

١. پێـــدەچێ ئێـــرانييەكان ئاهوورامـــەزدايان لـــە رووی هاوچەشـــنی ميزۆپۆتامياييـــەوە دروســـت نـــەكردبێت، چونكـــە لـــە هـــەزارەی يەكەمـــدا، كـــە ئێـــرانييەكان بوونە دراوسێی ميزۆپۆتامييەكان، مەردۆخ خواوەندێكی مەزن و لە ئەهوورامەزداش جەنگاوەرتر بووە، هەرچەند مەردۆخ بە زانـا و تێگەشـتوو دادەنـرا، بـەلاّم ناوەكـەی بـە مانـای زانـايی نـەبووە. دەبـێ بێينـە سـەر ئـەو باوەڕەی كە لە پێدەشتەكانی ئێـراندا، لانيكەم لـە هـەزارەی دووەم و رەنگـە زۆر پێشـتريش، خواوەنـدێك لـە هەمبـەر "ئـەنكی"ی سۆمەرييەكاندا لەلايـەن خەڵكەوە ستايشكراوە و هۆزە ئێرانييەكانيش ئەم خواوەندەيان لا پيرۆزبووە و ناسيويانە.

١. مەردۆخ - ئيشتر بەهۆی دراوسێيەتی لەگەڵ ميزۆپۆتاميا، لە هـەزارەی دووەمـــی پـــێش زايينـــەوە، كـــە خـــاوەن هێـــزێكی مـــەزن بـــوو، دەگەنـــە پێدەشـــتەكانی ئێـــران. لـــە ئـــايينی گاتـــايی و هەخامەنشـــيدا، كـــە ئـــايينی فـــەرمانڕەواكان و هاوكـــات پـــارێزەری داب و نـــەريتی دێـــرين بـــوون، ئـــەم پێكهاتەيە نەيتوانی جێگە بە ئاهوورامەزدا لێژ بكات، بەلاّم لە قۆناغی دواتردا واتا قۆناغی ئاڤێستای نوێ و دوايين بەردە نووسـراوەكان، ئاوێتـەی دەبێـت.

٢. خاڵێكی جێگەی سەرنج ئەوەيە كە "ئێێ"ی

ناوچەكانی يزۆپۆتامياش هەر باوكی مەردۆخ و ئيشـتر بـووە، هەرچەنـدە لـە سـەردەمی بەهێـزيی مەردۆخـدا "ئێئـا " (Ea)هەيمـەنەيـەكی ئـەوتۆی نـەمابوو، بـەلاّم بـە جۆرێـك سـێ فاقـەيی لـە نێـوان مـەردۆخ و ئيشـتر و

"ئێئا" (Ea)دا مابوویەوە. لە دوایین بەردە نووسراوەکانیشدا ئەم هێزە سێ هێزە لە ئاڤێستای نوێدا وەک جۆرێک سێ فاقەیی بەرچاو دەکەون.

خواوەند تیشتر ( tîştr) ۳. کە هیچ شێوە تێکەڵێک لە پێکهاتەی ئاسیای رۆژئاوا و میسر نییە و لە دەسپێکی هاویندا وەک ئەستێرەی تیشتردەردەکەوێت و خاوەن کەسایەتییەکی میسرییە، بەڵام بەهۆی تێکهەڵچوون لەگەڵ دێوی وشکانی، شکست بەدێوەکان دێنێ و سەرکەوتنی خۆی لە هەمبەر ئەفسانەی خواوەندەکانی باران لە ئاسیای رۆژئاوا مسۆگەر دەکات.

٤. لەسەردەمی گاتاییدا دووفاقەیی لەلای ئێرانییەکان، هاوشێوەی پێکهاتەی جیهانی خواوەند و دێوەکانی ئاسیای رۆژئاوایە، کە لەخواوەند — باوکی یەکەم، دو تاقمی دێو و خواوەند دەکەونەوە. نموونەی دووفاقەیی لە میزۆپۆتامیا و لەشارستانییەتی سۆمەری، بابلی و ئاشووریدا، زەق و بەرچاو بوون و نموونەیەکی دیکەی لەم چەشنە، لە ئەفسانەی یۆنانییەکان کەلە ژێر کاریگەریی ئاسیای رۆژئاوادایە، بەر چاو دەکەوێت.

هەڵبەت پێویست بەوتنە کە دووفاقەیی لە ئێران، زۆر لە ئاسیای رۆژئاوا بەرچاوتر بووە، کە بە جیهانبینییەکی تایبەت و لێکدانەوەیەکی فەلسەفی سەیر دەکرێت، کە لە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا شتێکی مەزن و بە هەیبەتی لەو چەشنە، لە ئارادا نەبووە.

لەقۆناغی ئاڤێستای نوێدا دووفاقەیی لە یەک رووەوە گۆنجاوتر دەبێت، واتا خواوەند — باوکی یەکەم لا دەبەن و هیچ پەیوەندییەک لە نێوان جیهانی خێر و شەڕدا نامێنێت و تەنیا دژایەتییەکی نەگۆڕ دەمێنێتەوەو یەکێتییەکی ئەوتۆ، بەهۆی ئەم دژایەتییەوە، بەو شێوەیەی کە لەنێو گاتاکاندا بەرچاو دەکەوێت، لە گۆڕێدا نامێنێت.

پاشان له بەشی "ئایینی زۆروان"دا دەبینین کە سێ فاقەیی ئەهورامەزدا - سپەنتامینوو و ئەهریمەن لە گاتاکاندا جێگەی سێ فاقـەیی زۆروانـی و دوو هێزی خێـر و شەڕ دەگرنەوە.

نـابێ لـه بیـر بکـەین کەلـە قۆناغـەکانی ناوەڕاسـت و کۆتـایی فەرهـەنگی ڤیدایی له هیند، لـەژێر کاریگـەریی فەرهـەنگی ئاسـیای رۆژئـاوا، هاوچەشـنی ئێران کە دووفاقەیی برەوی هەبوو، گۆڕانێک روو ئەدات. لەوێدا دوو تـاقم لـە خواوەندەکان (ئەسووراکان و دێوەکـان) بەسـەر دوو تـاقمی خواوەنـدەکان و دژە خواوەندەکاندا دابەش دەبـن، کـە هـەر دوو تـاقم وەچـەی بـاوکی یەکـەم (پەرجاپتی) بوون. تەنیا جیاوازییەک له نێوانیانـدا هـەبوو، ئـەوە بـوو کەلـە ئێـران، ئەهووراکان خواوەندکانن و هـەروەها دێـوە دێوەکـانن و لـە هینـدیش ئەسـوورەکان دێوەکـانن و دێوەکـانیش خواوەنـدەکانن. بـەڵام دووفاقـەیی لـە هیند و هەر لەم ئاستەدا دەمێنێتەوەو پێشکەوتنیک کە لەم بوارەدا لە ئێـران دێتە گۆڕێ، لە دۆڵی سێند نابیندرێ..

٥. لـە بـەردە نووسـراوەکانیش لـە هـەر دوو قۆناغـدا بـە شـێوەیەک بـەرەوڕووی ئـایینی دووفاقـەیی دەبینـەوە کـە هاوشـێوەی دووفاقـەیی لـە ئاڤێسـتای نوێـدا بـووە. هەرچەنـد زانیـاریی سـەر بـەردە نوسـراوەکان بـۆ کەموکۆڕی نین، بەڵام دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەوێدا دوو جیهانی خواوەندەکان (بـەغان) و دێوەکـان بوونیـان هـەبووە. جیهـانی خواوەنـدەکان فەرمانڕەواو خوڵقێنەرێکی مەزنی وەک ئەهوورامـەزدای هەیـە، بـەڵام جیهـانی دیوەکان خاوەن هیچ مەزنایەتییەک نییە.

پێدەچێ باوەڕمەندی بە وەها سـەروەری و مەزنایەتییـەک لەگـەڵ ئـایینی زەردەشت دەست پێ دەکات و خاڵی جێگەی سەرنج ئەوەیە کەلە فەرهەنگی دووفاقەیی ئێرانییەکان، کـە بـە مەبەسـتی بەرەوڕووبوونـەوە لەگـەڵ جیهـانی خواوەنـدەکان و دوژمنـانی خواوەندەکانـدا پێکهـاتبوو، بەشـیوەیەک جێگـەی

سەروەری لە جیهانی دێوەکان و هێزە خراپکارەکاندا بەتاڵ مابووەوە، کە ئەهریمەن بەوپەڕی خێراییەوە، لەنێو بیروباوەڕی خەڵکدا پەرەیستاند و جێگەی خۆی کردەوە و نەتەنیا لە ئایینی ئێرانییەکانی وەک (زەردەشتی، زۆروانی، مانەوی و مەزدەکی)دا بووە خاڵێکی جێگەی سەرنج، بەڵکو لەنێوهزری ئایینیی خەڵکی ئاسیای رۆژئاوای پاش خۆیشی، شوێنەواری قووڵی بەجێهێشت و چەمکی ئەهریمەن، لەنێو بیروباوەڕی خەڵکی ئاسیای رۆژئاوادا جێگەی خۆی کردەوە.

## بەشی سێیەم

### ئایینی زەردەشتی
### لەسەردەمی ساسانییەکاندا

ساسانییەکان لەلایەکەوە لە هەمبەر فراوانخوازیی رۆمییەکان و لەلایەکی دیکەشەوە بۆ پێکهێنانی دۆخێکی شیاو بۆ کاروباری بازرگانی لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای جیهانی ئەودەم، پێویستی بە ئەمنییەت، یەکێتیی سیاسی، نیزامی و هەروەها رێگەو بانی لەبار بۆ کاروانچییەکان هەبوو. لە سەرەتادا دژی سیستەمی خان و رەعیەتی بوون. نیزامی خان و دەرەبەگایەتیی ئەشکانییەکان بەرەورووی ئاڵۆزی و ناسەقامگیرییەکی سیاسی، نیزامی و ئابووری بووەوە، کەلە سەردەمی مەسیحییەت بەملاوە، لاوازیی دەوڵەتەکانی ئەشکانیی بەدواوە بوو. لەلایەکەوە بازرگانیکردن لەگەڵ هیند و چین، کە زیاتر ئاورێشم و بەهاراتی هیندیی وەک (بیبەر و زەردەچێوە) بوو و بازرگانیکردن لەگەڵ رۆمیش، کە زیاتر کەلوپەلی بلووری لەخۆدەگرت، داهاتی دەوڵەتەکانی ئێران، کە پردی پێوەندیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا بوو، دابین دەکرد و پاشکەوتی زێڕ و نوقرەی ئێرانی رووی لەزیادبوون دەکرد، کە ئەو ئاڵۆزی و پشێوییانە داهاتی وڵاتی بەرەو لاوازی دەبرد.

بە پێی نەریتە کۆنەکان، کە لە بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشیشدا بەرچاو دەکەون، یەکگرتوویی و یەکێتیی ئایین و دەوڵەت دەیتوانی هێزێکی مەزن بە دەسەڵات ببەخشێ. پاشاکانی هەخامەنشی خۆیان و کارەکانی خۆیانیان وەک پیرۆزییەکی ئایینی سەیر دەکرد و چیرۆکی کەیخوسرەویان وەک نموونە و ئولگووی خۆیان دادەنا، چونکە خاوەن کەسایەتییەکی ئایینی بووە، کە سەرئەنجام بەرەو خواوەند و ئاسمانەکان گەڕایەوە. کەوابوو شتێکی سەیر نییە کە دەبینین پاشای ساسانییەکان، لە سەرەتاوە، ویستوویانە خۆیان وەک کەسایەتییەکی ئایینی لەقەڵەم بدەن. بابەک، لە پەنا دەسەڵات و هێزی سیاسیی خۆیدا، پارێزەری ئاناهیت خواوەندی ئاو

بووەو خاوەن کەسایەتییکی ئایینی — فەرمانڕەوایی بووە. ئەگەر سەرنج بدەین کە ساسان بە پێی چیرۆکی باو لە سەردەمی ساسانییەکاندا (چاو لە کارنامەی ئەردەشیری بابەکان بکەن) شوان بووە، بۆمان دەر دەکەوێ کە ئەردەشیری بابەکان لە راستیدا هێمای سێ هێزی کۆمەڵایەتیی: "رۆحانییەت، فەرمانڕەوایی و بەرهەمهێنان" بووە و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە هەموو هێز و دەسەڵاتەکان لە کەسایەتیی پاشادا کۆبوونەتەوە، کە لەسەر بنەمای نەریتی کۆنی پاشاکان، لە ئاسیای رۆژئاوادا بووە.

کەسایەتیی پاشا - موبد لە سەردەمی ساسانییەکاندا، رێزێکی تایبەتی هەبوو. تەنانەت خوسرەو ئەنووشیروانیش موبد بوو. بەم پێیە، گرنگیی ئایینی زەردەشتی، وەک ئایینی فەرمیی سەردەمی ساسانییەکان دەناسرێت.

بەڵام ئایینی زەردەشتی لەم سەردەمەدا چ تایبەتمەندییەکی هەیە؟

لەم سەردەمەدا، لە جێگەی سێ فاقەیی گاتاکان هۆرەمەزد - بەهەشتی پیرۆز - ئەهریمەن و دووفاقەیی ئاڤێستای نوێ، هۆرەمەزد و ئەهریمەن، بەرەوڕووی سێ فاقەییەکی نوێ دەبینەوە، کە زرڤان - هۆرەمەزد- ئەهریمەن لەخۆ دەگرێت.

زڕوان
ئەهریمەن
هۆرەمەزد
ئەهریمەن
هۆرەمەزد
سپەنتامینوو

ئەم پێکهاتە نوێیە، بە زمانێکی ناڕوون، لە دەقە پەهلەوییەکان و بە زمانێکی روون لە نووسراوەکانی ئەرمەنی و سریانیدا، سەبارەت بە ئایینی ئێرانییەکان لە سەردەمی ساسانییەکان، لەئارا دایە.

زڕوان، له ئاڤێستای نوێدا پێگەیەکی ئەوتۆی نییە و له گرنگیی ئایینی زەردەشتیش بێبەرییە، بەڵام بیرئانینی ناوی ئەو لە جیهاندا، سەلمێنەری هەبوونی ئەو لە رابردوودا بووە، کە ئەگەری زۆرە، لە سەردەمی ئایینی زەردەشتدا، گرنگییەکی باشتر و پێگەیەکی شیاوتری بووبێت. هەر وەک پێشتر ئامارەی پێکرا، کەسایەتیی زڕوان پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئەفسانە دێرینەکانی فەرهەنگی ئاسیای رۆژئاوادا هەیە، کە دۆڵی سێند هەتا یۆنانی لەخۆ گرتووە، لەلایەکی دیکەشەوە پەرجاپتی له هیند و دەورووبەریدا لەگەڵ کرونووس بەرابەری دەکات و کۆمەڵێک ئەفسانەی هۆزەکانی ئاسیای رۆژئاوا، باوکی یەکەم کە خواوەندەکان و دێوەکانی لێکەوتنەوە، وەبیر دەخاتەوە. بە پێشینەبوونی زڕوان شتێکی حاشا هەڵنەگرە و هەر وەک ئەوەی پێشتر باسی لێوە کرا، پێدەچێ سێ فاقەیی گاتاکانیش لەژێر کاریگەریی هەمان پێکهاتەدا بووبێت، واتە له گاتاکانی زەردەشتدا، هۆرەمەزد جێگەی زڕوانی گرتۆتەوەو بەهەشتی پیرۆز و ئەهریمەن هێمای خواوەندەکان و دێوەکانن، بەڵام لە سەردەمی ساسانییەکاندا زڕوان جێگەی خۆی بە دەستهێناوەتەوە و هۆرەمەزد خوڵقێنەری خواوەندەکان و ئەهریمەنیش خوڵقێنەری دێوەکانە.

دەقە پەهلەوییەکان بەپێچەوانەی دەقە ئاڤێستاییەکان، کە زیاتر شێوەی سروودی ئایینی هەیە، چیرۆکەکان و باوەڕی زەدەشتییەکان شیدەکاتەوە و لەم رووەوە، له نووسراوە ئاڤێستاییەکان لەسەرترە و زانیارییەکی پوختەتر، سەبارەت بەزەردەشتییەکان دەخاتە بەر دەست. هەر چەندە کتێبە پەهلەوییەکان گەلێک درەنگ، واتە لە سەدەکانی دووەم و سێیەمی پاش ئیسلامدا نووسراونەتەوە، بەڵام دەقەکانی یەکجار کۆنە و لەم رێگەیەوە زۆربەی بنەما هزری و بیروباوەڕە زەردەشتییەکان، لەسەرەتای سەردەمی ساسانییەکان ڕووندەبێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەقە ئەرمەنی و سریانییەکان، کە باس لە بیروباوەڕی سەردەمی ساسانییەکان دەکەن،

جیاوازییـــەکی بـــەرچاویان لەگـــەڵ بـــاوەڕی زەردەشـــتییەکانی ســـەردەمی ساسانییەکاندا هەیە.

کتێبـە پەهلەوییـەکان لـەژێر کاریگـەریی ڕێفۆرمـەکانی خۆسـرەو(پاشـا)ی ئەنووشیروان، کەلە هەموو بوارەکانی ژیاندا کاریگەریی خۆی دانـابوو، ڕەنگـە هەندێکیتش وەبەر تـەوژمی ئیسـلام کـەوتبێت و زۆرێـک لـە بـاوەڕە دێـرین و ســـەرەتاییەکانی زۆروانـــی لـــە نێـــوانیاندا ســـڕدرابێتەوە. لەگـەڵ ئەمەشـدا کتێبـەکانی وەک بۆنـدەهش (بنیـات (bondehş) و هـەڵبژێردراوانی زادسپەرەم) ئامارژە بە تێڕوانینی قووڵی زۆروانی دەکات.

کەوابوو بەپێی ئەو زانیارییانەی کە سـەبارەت بـە ئـایینی زەردەشـتی لـە سەردەمی ساسانییەکان لەبەردەسـتن، دەتـوانین بـاس لـە ئـەم بنەمایانـەی خوارەوە بکەین :

١. لەسەرەتادا تەنیا زۆزوان هەبووە. ئەو سەرجەم هەست و نەستی لە خۆیـدا کـۆکردەوە. چاکـە و خراپـە، ڕوونـاکی و تـاریکی، مـادە و مینـوو، دادپەروەری، ناعەداڵەتی و زوڵم و هەتاهەتایی و هەرمان.

٢. زۆروان مـاوەی هـەزار سـاڵ لەبـەر ئـەوەی ببێتـە فـەرمانڕەوا، ئـاواتی هـەبوونی منـداڵێکی دەخواسـت، بـەڵام منـداڵی نـەدەبوو، هـەتا ئـەوەی کـە بەبیریدا هات، کە ڕەنگە منداڵی نەبێت، بۆیە لەبەر ئەو ئاواتە پیرۆزەی ئەو، هۆرەمـەزد و لـە بـەر گومانـە پیرۆزەکەشـی، ئەهریمـەن لـەنێو منداڵدانیـدا دروستبوون. هۆرەمەزد کەلە هەموو ڕاستییەکان ئاگاداربوو، هـەر لـەنێو ئـەو منداڵدانەدا ئاواتەکانی باوکی خۆی بۆ براکەی گێڕایەوە. ئەهریمەنی شەڕاشـۆ کـە پـاش هۆرەمـەزد لـەنێو ئـەو منداڵدانـەدا دروسـت ببـوو، بـۆ ئـەوەی فەرمانڕەوایی جیهان بە دەستەوە بگرێت، هەوڵەکانی خستە گەڕ هەتا یەکەم منداڵ بێت کە لە منداڵدان بێتە دەر و بگاتە بەردەم زۆروان، هاوکات چونکە هۆرەمەزد زووتر گەیشتە بەر زارکی منداڵدانەکە، ئەهریمـەن هـیچ ڕێگەیـەکی

جیا لە هەڵدڕینی منداڵدانەکەی بەدی نەکرد و بەم شێوەیە یەکەم منداڵ بوو کە هاتە دەر و چووە بەردەمی باوکی و داوای فەرمانڕەوایی جیهانی کرد. ئەهریمەن ناحەز و رەش و هێمای ناپاکی بوو، بۆیە زێروان خێرا تیگەیشت، کە ئەمە، ئەو منداڵە نییە کە ئەو ئاواتی بۆ دەخواست، بەڵام لەبەر ئەوەی بەڵێنیی دابوو فەرمانڕەوایی و تەختی دەسەڵات بەو منداڵە بدات کە زووتر لە منداڵدانەکە دێتە دەر، تەختی فەرمانڕەوایی پێ سپارد و هەر لەو کاتەدا هۆرەمەزد پەیدا بوو، ئەمە ئەو منداڵە بوو کە ئەو ئاواتی بۆ دەخواست. جوان و رەزا سووک، بۆیە زێروان فەرمانڕەوایی رۆحانیی جیهانی پێشکەشکرد و بە ئەهریمەنیشی گوت کە جیهانی مادی بۆ ماوەی ٩ هەزار ساڵ لەژێر رکێفی تۆدا دەبێت و پاشان هەموو جیهان، بۆ هەتاهەتایە، لەژێر دەسەڵاتی هۆرەمەزدا ئەبێت.

ئەم چیرۆکانە کە بەشی کۆتاییەکەی (پاشایەتیی ٩ هەزار ساڵەی ئەهریمەن و دواتر پاشایەتیی هەتاهەتایی هۆرەمەزد٨٣) لە ئەفسانە ئەرمەنی و سریانییەکاندا دێت، لە نێو دەقە زەردەشتییەکاندا، بەم شێوەیە خۆی دەنوێنێ کە هۆرەمەزد بە زانیاری و چاکەی خۆی، لە جیهانێکی بێ کۆتایی و رووناکدا دەژی، کە لە ئاسمانەکان دایە. ئەهریمەنیش بە نەزانیی خۆی و رەوشتی خراپەکارانەی خۆی، لە جیهانێکی تاریکیدا دەژی، کە بەتایبەت شوێنی خۆیەتی و لەژێر زەوی دایە. لە نێوان ئەم دوانەدا، بۆ ئەوەی هیچ تێکهەڵچوونێک لە نێوانیاندا روو نەدات، بۆشاییەک هەبوو، کە دوایین تێکهەڵچوونی ئەم دوو هێزە، لەم بۆشاییەدا، کە بەگۆڕەپانی شەڕ ناودێر کرابوو، روو ئەدا..

## جیهانی بێ کۆتا و رووناک

١. بۆشایی، یان جیهانی بەتاڵ، مەودای نێوان دوو جیهانی رووناکی و تاریکی

٢. جیهانی بێ کۆتایی تاریکی (له هەموو لایەکەوە بێ کۆتا بوو مەگەر لەسەرەوە)

زۆروان لەسەرەوەی هۆرەمەزد و ئەهریمەنەوە بوو، کە بە زەمەنی بێ کۆتا ناودێر کراوە. هۆرەمەزد لە زەمەنی بێ کۆتادا زەمەنێکی تایبەتی دروستکرد، کە بە زەمەنی "راوەستانی خواوەند" ناودێرکراوە. زەمەنی تایبەتی ١٢ هەزار ساڵ لەخۆدەگرێت.

٣. هۆرەمەزد لە ئەفسانەکانی زەردەشتدا، جیهانی مادی دروست دەکات، بۆیە مادە دیاردەیەکی هۆرەمەزدی و پیرۆزە..

٤. لەماوەی ٩ هەزار ساڵ شەڕ و بەربەرەکانێدا، سێ هەزار ساڵی یەکەم لەبەختی هۆرەمەزد دەبێت، سێ هەزار ساڵی دووەم هێزەکانی ئەهریمەن و هۆرەمەزد تێکەڵی یەکتر دەبن، لە سێ هەزار ساڵی کۆتاییش ئەهریمەن تێک دەشکێت و لە کۆتاییدا لەناودەچێت.

ئەم روانگەیە، لەگەڵ پاشایەتیی ٩ هەزار ساڵەی ئەهریمەن لەسەر جیهان، کە لە نووسراوە ئەرمەنی و سریانییەکاندا بوونیان هەیە، لە دژایەتی دایە.

٥. هۆرەمەزد سەرەتا ئەمشاسپەندان دەخوڵقێنێت کە ٦ فریشتە بەناوەکانی "ڤەهوومەنە، ئەشاڤەهیشتا، خشەترەڤەیریە، سپەنتا ئارمەیتی، هەئورڤەتات و ئەمیرەتات" لەخۆدەگرێت. پاشان خواوەندی پیرۆز و مادی دەخوڵقێنێت، کە پارێزگاری لەجیهانی پیرۆز دەکەن.

٦. دواتر، ئاسمان، ئاو، زەوی، گیا، جڕ و جانەوەر و مرۆڤ دەخوڵقێنێت، کە هەموویان تەواوکەری یەکترن.

٧. ئاسمان بە شێوەی هێلکە دروست دەکرێت، کە بنیاتەکەی بۆ رووناکی و بۆشایی جیهان دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ وەک پەرژین و لەمپەرێک، لەهەمبەر هێرشی ئەهریمەندا، کە دژی رووناکی بوون، رابوەستێ. بەشی ناوەوەی ئەو هێلکەیە لە ئاو پێکهاتووە. زەوی وەک

زەردێنەی هێلکە، لەناو بۆشایی ئاسماندا هەڵکەوتووە، بەشی ناوەوەی پڕە لە ئاو و تەنیا بەشی سەرەوەی بۆ ژیانی ئینسان و بوونەوەرەکان لەبارە، ڕووەکەکان تیایدا دەتوانن بڕوێن. هەر لەسەر ئەم بەشە، یەکەمین گیا، یەکەمین بوونەوەرو یەکەمین ئینسان لە ناوەڕاستی ئەم گۆی زەوییەدا دروست دەکرێن، کە بەگیای یەکەم، مانگای یەکەم دروستکراو و "کیومەرس" بەناوبانگە.

٨. ئەهریمەن دەست بەدروستکردنی کەماڵە دێوان دەکا و لە ئەنجامدا " ئەکوومن، ئێندر، ناگهیس یان تەرۆمد، تەریز و زەریز " دەخوڵقێنێت و پاشان دێتە سەر دروستکردنی دێوەکان.

٩. ئەهریمەن جەستەی مادیی نەبووە، خوڵقێنەری هۆرەمەزدیش، بۆ ئەوەی ئەهریمەن لەلایەن خەڵکەوە ببینرێت و خۆی لێ بەدوور بگرن، تاقمێک وردە ئەهریمەن دروست دەکات.

دێوی تووڕەیی و ئاز، بەگرنگترین دێوەکان ئەژمار دەکرێن، سەرجەم هەسارەکانیش لە هەمبەر ئەستێرەکانی هۆرەمەزدا خەسڵەتی ئەهریمەنییان گرتووە.

١٠. ئەستێرەناسی لە سەردەمی ساسانییەکاندا، کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر ئەفسانەکان داناوە، کاریگەرییەکانی لەپاش باوەڕهێنان بە زانستی ئەستێرەناسی، خۆی دەردەخات، کە لە ژێر کاریگەریی سووڕانەوەی هەسارەکان لەسەر هێڵی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر دایە، کە زۆر جار پاک و هەندێک جاریش شەڕاشۆو دەر ئەکەوێت.

١١. ئەهریمەن لە ژێر جیهانی تاریکییەوە دێتە دەر و هێرش دەکاتە سەر جیهانی ڕووناکی، سەری دەدرێ بە ژێر ئاسماندا و دەیشکێنێ و لە نێو دڵی ئاسماندا زیندانی دەبێ و چیدیکە ناتوانێ بگەڕێتەوە بۆ جیهانی پێشووی

خـۆی، هـەروەها بـەهۆی ئـەو هێـــرشەیەوە، جەهەنـەمیش دەبێتـە جێگـەی دێوەکان.

١٢. دوازدە هەزار ساڵی لەبیر کراو، بەسەر چوار بەش دابـەش دەکرێـت، کە هەر بەشێک ٣٠٠٠ ساڵ لە خۆ دەگرێت (٨٥).

١٣. پێویستە سەرنج بدەین کەلـە سـەردەمی ساسـانییەکاندا، کۆمـەڵێک ئـاینی جۆراوجـۆر لـە وڵاتـی ئێــران بوونیـان هـەبوو، کـە تەنانـەت هـەتا سـەردەمی ئیسـلامیش درێـــژەی کێشـا (٨٦)، هـەرکـام لـەوانیش بـاوەڕێکی جیاوازیان هەبووە، کە تەنیا لەسەر چەند دانەیەکیان زانیاری لەبەر دەستە.

١٤. ئاگر پاک و پیـــرۆزە.

# بەشی چوارەم

## تاوتوێکردنی ئایینە زۆروانییەکان لەئێــران

بەهۆی ئەوەی کە بەڵگەی نووسراوی روون، لەسەر ئـایینی زۆروانـی لـە ئێــراندا بوونی نییە، ناکرێ باس لەم ئایینـە بکرێت، هـەروەها ئـەو چیرۆکە پەرش و بڵاوانەی کە هەشـن، سـەلمێنەری ئـەوەن کـە پێویسـتە زیـاتر بـاس لەوە بکرێت کە ئایینی زۆروانی تێکەڵی هەموو ئایینەکان بووە، نەک باس لە ئایینێکی دیاریکراو بکرێت، کـە بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ لـە ئـارادا بـووە و ئایینی جۆراوجۆری لێ بۆتەوە.

لەسەر ناوەڕۆکی بیروباوەڕی زۆروانی، روانگـەی جۆراوجـۆر هـەن، زۆرێـک لەو باوەڕەدان بیروباوەڕی زۆروانی لە ئێران، لـەژێر کاریگـەریی سـێ فاقـەیی گاتاکانی زەردەشتدا سەریهەڵداوە..

سەرەتا پێویسـتە بزانین، بابـەتی گرنگـی بیـروباوەڕی زۆروانـی چییـە و روانگـە و پێکهاتـەی چ ئەفسـانەیەک تیایـدا رەنگـی داوەتـەوە، هـەتا لـەم رێگەیــەوە بتــوانین روانگــە و پێکهاتــەی نێــو بیروبــاوەڕی ئێــرانییەکان و خەڵکانی دانیشتووی ناوچەکانی ئاسیای رۆژئاوا، بدۆزینەوە.

سەرچاوەی زانیارییەکانی ئێمە لـەم پەیوەندییـەدا "ئێــرانی، ئەرمـەنی و سریانی و بەڵگەکانی ئایین دۆستی لە ئیمپراتۆرییەتی رۆم" پێکی دێنن. .

سـەرچاوە ئێــرانییەکان ئامـاژە بـە زۆروانــی لـە ئاڤێسـتادا، نووسـراوە زۆروانییـەکان لـە دەقـە پەهلـەوی و فارسـییەکان و هـەروەها نووسـراوەکانی ئایینی مانی دەکەن.

لەسەرچاوە ئاڤێستاییەکاندا هاتووە، کە زۆروان ئەو رێگەیەی رۆحی چاکە و خراپە بەرەو پـردی چینـوەت دەیپێـون، ئـەو دروسـتی کـردووە (وندیـداد). لەسـەرچاوە ئاڤێسـتاییەکانیدیکەدا بـاس لـە زۆروانـی بـێ کۆتـا و زۆروانــی دیاریکراو کە هەرکام یاسای تایبەت بەخۆیان هەیە، کراوە.

لەسەرچاوە پەهلەوییەکاندا، بە تایبەت لە بۆنتهێش و هەڵبژێردراوانی زادسپەرەم، زیاتر تیشک دەخرێتە سەر زۆروان و لەم نووسراوانەدا هیچ شتێک بە بێ ئیرادە و ویستی خواوەند توانای ژیانی نییە. هۆرەمەزد بە یارمەرتیی زۆروان، زۆروانێکی نوێ، دەخوڵقێنێ کە نزیک بە ٩ هەزار ساڵە (بە پێی هیندێک سەرچاوە ١٢ هەزار ساڵە) و دواتر هەموو جیهان بەدەستی هۆرەمەزد دەخوڵقێت و ئەهریمەنیش بە تێپەڕبوونی زەمەن، زەمەن خوڵقاندنی دایە و لەگەڵ کۆتایی هاتنیشی، تەمەنی کۆتایی پێدێت.

زۆروان لە دەقە پەهلەوییەکاندا جیا لەوەی کە بۆ خوڵقاندنی جیهان پێویستبوو، وەک داوەریش سەیر دەکرا. ئەو چاودێری و داوەریی شەڕی نێوان هۆرەمەزد و ئەهریمەن دەکات. بەپێی هەڵبژێردراوانی زادسپەرەم، ئەهریمەنی کردە فەرمانڕەوای ٩ هەزار ساڵەی جیهان و هەموو ئەو شتانەی کە دواتر دروستکران بەدەستی هۆرەمەزد بوون. بەپێی ئەو نووسراوانەی کە باسیان لێوە کرا، زۆروان لەسەروو دوو جیهانی هۆرەمەزد و ئەهریمەنەوە (جیهانی رووناکی و تاریکی)ـەوە دانیشتووەو چاودێری و داوەریی شەڕێک دەکات، کە سەرئەنجام خواوەندەکان تیایدا سەرکەوتوو دەبن، ئەو وەک خوڵقێنەر ئەژمار ناکرێت، بەڵام هەموو جیهان پەیوەندیی بەوەوە هەیە. ئەو لە توانایی و زانایی هۆرەمەزد بێ بەهرەیە، بەڵام بۆ خۆی خواوەندێکی مەزنە.

کتێبی "علما اسلام" کە بە زمانی فارسییە، بەگشتی باس لە ئایینی زۆروانی دەکات و جیا لەمەش نووسەرێکی دیکە لە کتێبی "الملل و النحل" ئایینی زۆروانی دەخاتە بەرباس.

لەسەرچاوە "مانی"ـەکاندا، زۆروان خواوەندێکی هەتاهەتاییە و بە باوکێکی مەزن ناوی لێدەبرێت. جیاوازیی زۆروان لەگەڵ ئایینی مانی، سەرەرای ئەوەی کە لە ئەفسانەکانی زەردەشتدا، سەبارەت بە زۆروان بەرچاو دەکەون، لەوە دایە کە لە ئایینی مانیدا، زۆروان لە ناوەڕاستی خواوەندەکانی جیهان دایە، لە کاتێکدا کە لە ئایینی زەردەشتیدا زۆروان لەسەرووی جیهانی هۆرەمەزد

و ئەهریمەنییەوە دانیشتووە. زۆروان لە ئایینی مانیدا ئەرکی داوەریشی لە ئەستۆ نییە، بەڵام خوڵقاندنی خواوەندەکان و بڵاوکردنەوەیان لە ئەستۆی ئەوە.

لەسەرچاوەکانی دیکەی وەک ئەرمەنی و سریانیدا، زانیارییەکی یەکجار زۆر و بە نرخ، سەبارەت بە ئایینی زۆروان لەئێران بوونی هەیە. نووسەرانی ئەرمەنی و سریانی، لەکاتی ئاخاوتن سەبارەت بە ئاایینی زەردەشتی، لەراستیدا باس لەبیر و باوەڕی زۆروانی، ئاایینی زۆروانیی نێو ئاایینی زەردەشتی دەکەن. بەڕواڵەت ئاایینی زەردەشتی، لەو سەردەمەدا، دەبێ جیاوازییەکی یەکجار زۆری بووبێت، کە لە زۆروانیی راستەقینەوە بگرە هەتا زەردەشتی و ئاایینەکانی دیکەی لەخۆگرتووە.

سەرەڕای ئەو زانیارییانەی کەلە سەرچاوە ئێرانی، ئەرمەنی و سریانییەکان، لەبەر دەستدا هەن و ئاماژە بە کورتەیەکی کرا، سەرچاوە میتراییەکانیش کۆمەڵێک زانیارییان لەخۆگرتووە، بەڵام لە سەرچاوە میتراییەکانی ئیمپراتۆری رۆمدا، بەکەمی پشت بە نووسراوەکان دەبەسرێت، بەڵکو پەیکەر و وێنە هەڵکەندراوەکانی سەر بەرد، زیاتر وەک سەرچاوە سەیرکراون. بەپێی سەرچاوە میتراییەکانی یۆنان و رۆمییەکان کەلە سەر بەردە نووسراوەکان، پەیکەرە و وێنەی سەر بەردەکان ماونەتەوە، لە دەسپێکدا ئاژاوەیەکی گەورە لە ئارادا بووە. هەر لەو کاتەدا کرۆنووس / ساتورن (= زۆروانی)، کە دەسپێکی ژیانە، بەو شێوەیەی کە لەئاسەوارەکانی رۆژئاوادا، کە زۆر روون نین، لە لایەکەوە زێیووس / ژووپیتێر (= ئەهوورامەزداو لە لایەکیدیکەشەوە هادس / پۆلۆتۆن (= ئەهریمەن)ی خوڵقاند. زێیووس و خواوەندەکان، لەسەر لوتکەی چیاکانی یۆنان (ئالیمپ) و هادس و تیتان (= دێوەکان) و مەخلووقاتی شەڕاشۆ لەجیهانی رەش و لە ژێر زەویدا، بەناوی تاتارووسەوە دەژین.

لەنێو زۆرێک لە پەرستگە میتراییەکاندا، پەیکەرو نەخش و نیگاری بوونەوەرێکی سەیروسەمەرەو ترسناک دۆزراونەتەوە، کە سەری لە شێر و

جەستەی لە مرۆڤ دروست کراوەو مارێکیشی تێئالاوە. زۆر کەس هەوڵیانداوە کە بەبرای هادس / پۆلۆتۆن (= ئەهریمەن)ی دابنێن. هەندێک جار بە رووتی و بەبێ جلوبەرگ پیشانیانداوە، بەبێ ئەوەی ئەندامی زاوزێی دیاربێت. رەنگە ئەمەش لە بەر ئەو هۆیە بووبێت کە ویستبێتیان وەک خواوەندێکی کامڵ لە قەڵەمی بدەن. هەروەها لەزۆربەی پەیکەرەکاندا لەسەر بەردێکی هاوشێوەی هێلکە راوەستاوەو زۆر جاریش چوار باڵی هەیە، کە دوانیان روویان لە ئاسمان و دوانیان روویان لە زەوییە. لەسەر جەستەی وێنەی ناوچەکانی هێڵی سوورانەوەی هەتاو دەبیندرێت و مارێک حەوت سوور بە دەوریدا ئالاوە. راوەستانی لەسەر ئەو بەردە خڕە، بە نیشانەی خواوەندیی ئەو و هەروەها ئەو چوار باڵەشی بە واتای خاوەنداریێتیی بای "شەماڵ و زریان" زانراوە.

هەبوونی وێنەی هێلی سوورانەوەی هەتاو، لەسەر جەستەی کورۆنووس و حەوت جار سوورانەوەی ئەو مارە بەدەوریدا، دەکرێ پەیوەندی بە حەوت هەسارەو کاریگەرییەکانی بەسەر ژیان و خەڵکەوە بێت، کە بەشێک لە بیروباوەڕی پێشینانیان بووە. پەیوەندیی مار لەگەڵ ئەو حەوت هەسارەیە، بەباوەڕی کۆنی ئێرانییەکان بۆ ئەهریمەنیبوونی هەسارەکان و چۆنییەتیی سوورانەوەیان دەگەڕێتەوە.

ساتوورن، بە وەها سیمایەکی تۆقێنەرەوە، هەمان زۆروان، خواوەندی کات و زەمەنی ئێرانییە، کە لە رۆژهەلات و رۆژئاوا بە "بەخت" ناوی لێ دەبرا و هەر دوو هێز، هێزی خواوەند زێیووس / ژووپیتێر و هێزی هادس / پۆلۆتۆن، هەر دووکیان شکستخواردووی دەستی ئەوبوون. ئەو بەسەر هێڵی سوورانەوەی، هەتا کە هێمای تێپەڕبوونی کات و کۆرۆنووس زەمەن بوو، دەسترۆیشتوویی هەبوو. هاوشێوەبوونی ئەو لەگەڵ شێردا، هێمای ئاگری هەتاهەتایی بوو. ئەو بەسەر هەموو جیهان و بای هەر چوار لادا دەسەلاتی هەبوو، وەرزەکانی دیاری دەکرد و خواوەندی کات و چارەنووس بوو.

بەپێی ئاسەوارە میترایی و ئەفسانە دێرینەکانی یۆنان - رۆمی، کۆرۆنووس / ساتوورن خواوەندیی خۆی بە زێیووس / ژووپیتێر دەسپێرێت و هەورە تریشقە، کە چەک و داردەستی فەرمانڕەواییەکەیبوو، رادەستی ئەوی دەکات، هەر چەند بۆ خۆی هێزێکی مەزنتری هەیە.

لە کاتێکدا زێیووس / ژووپیتێر گەیشتە پلەی خواوەندی و فەرمانڕەوایی جیهان، لە نێوان هێزە خواوەندییەکانی خۆی و هێزە خراپکارەکانی هادس / پۆلۆتۆن، کە بۆ جیهانی خواوەندەکان گەڕاندبوویانەوە، شەڕێکی قورس روو دەدات و زێیووس / ژووپیتێر دەبێ تیتانی (دێو)ـە کاولکەرەکان لەناوببات. سەرئەنجام، تیتانییەکان شکستخواردوو، دەکەونە نێو تاتارووس (= جەهەنەم) و پاکی و خواوەند بەسەر ناپاکی و ئەهریمەندا سەردەکەون. زێیووس / ژووپیتێر لە ئایینی میترایدا و پاش باوەڕی کۆنی ئەفسانە یۆنانییەکان، وەک خواوەندی بەهێزی چیاکانی یۆنانی دێرین و خواوەندی خواوەندەکان، ئەژمار دەکرێت.

بەڵام لە دوایین بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشی و لەئاڤێستای نوێدا، بەرەوڕووی دوو خاتوونی خواوەند (میهر و ناهید) دەبینەوە، کە هاوتەریب لەگەڵ ئەهوورامەزدا، گرنگییەکی تایبەتیان هەیە. میهر (میترا)ی خواوەند، لە مێژووی بیروباوەڕی ئێرانییەکاندا، پێگەیەکی تایبەتی هەیەو نە تەنیا لە دوایین بەردە نووسراوەکانی هەخامەنشی و ئاڤێستای نوێدا، گرنگیەکی لەرادەبەدەری هەیە، بەڵکو لە سەردەمی ئەشکانییەکانیشدا، چ لە ئێران و چ لە هیندێک لە وڵاتانی دراوسێی ئێران، کە فەرهەنگەکەیان هاوشێوەی یەکتربووە، بایەخی تایبەتیی خۆی هەبوو، زۆربەی پاتشاکانی ئێران ناویان میهر بووە، یان لانیکەم پاشگر و پێشگری ناوەکەیان (میهرداد یان ئاریا میهر)، یا "میهر"ی لەگەڵ بووە. لەم سەردەمەدا ئایینی میهری (میترایی) بەرەو ئاسیای رۆژئاوا و ئەورووپا دەچێت، ئایینێک کە تیایدا میهری خواوەند لە تەنیشت کۆرۆنووس (=زۆروان)دا، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە. پاشان

له ئایینی "مانی"شدا بەرەورووی گەورەیی و مەزنایەتیی میهری خواوەند دەبینەوە، کە سەرلەنوێ لەگەڵ زرووان خۆدەنوێنێت.

هەرچەند میهر(میترا) لەسەردەمی ساسانییەکانیشدا، بایەخێکی یەکجار زۆری هەبووە، هاوکات زرووانیش لەم سەردەمەدا، خۆی هاویشتۆتە نێو خواوەندە زەردەشتییەکان و بەم شێوەیە بایەخێکی تایبەتی بەدەستهێناوە، بەڵام پێکهاتەی زرووان و میهر لەم قۆناغەدا، وەک دوو کۆڵەکەی سەرەکی و بنەڕەتیی ئایین سەیر ناکرێن. لە راستیدا، زرووان، لە ئاڤێستای نوێدا و لە سەردەمی ساسانییەکانیشدا، میهری خواوەندەو لەپێگەی تایبەتی و پەیوەندییەکی دوولایەنە، بێبەرین.

زانیارییەکی پێشووی ئێمە لەپەیوەندی لەگەڵ بیروباوەڕی باو لەئاسیای رۆژئاوا لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زاییندا و بەبەهێز بوونی میهر و خاتوونی خواوەند (ئاناهیتا) بەپێی ئولگوی میزۆپۆتامیایی لەسەردەمی هەخامەنشی و دوایین بەردە نووسراوەکان و ئاڤێستای نوێ و ئاشنابوون لەگەڵ پێکهاتەی ئایینی میهری (میترایی) و ئایینی مانی، کە باس لەمەزنایەتیی میهر دەکات، لەو ئەگەرە نزیکدەبینەوە کە ئاوێتەبوونی زرووان – میهر لە دەرەوەی ئایینی زەردەشتیدا پەرەیستاندووەو شکڵی گرتووەو لە راستیدا بیروباوەڕێکی خەڵکی بووە کە لەنێو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ سەریهەڵداوەو دواتر لەرەوتی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، پێگەیەکی بەرزی لەنێو کۆمەڵگەدا پەیدا کردووە.

بەپێی ئەو جیاوازییانەی کە لەنێوان باوەڕی زروانی، لە تاقمە زەردەشتییەکانی ئێراندا دەیبینین و لەگەڵ پێکهاتەی زرووان – میهر لەئایینی میهری(میترایی) لە ئیمپراتۆرییەتی رۆم و ئایینی مانیدا، بەراوردیان بکەین، دێینە سەر ئەو باوەڕەی رەنگە هیچ کاتێک پێکهاتەو چوارچێوەی بیروباوەڕی سەقامگیرو دیاریکراو بۆ دەربڕینی بیر و باوەڕی زروانی لە ئارادا نەبووەو چوارچێوەی بیروباوەڕی زروانی، بەتێپەڕبوونی زەمەن و شوێنیش دەیتوانی بەشێوەی نوێ و جیاوازتر خۆت دەربخات،

بەڵام هەبوونی پێکهاتەی زێروان – میهر لە ئایینی میهر(میترایی) و مانئایی و نەبوونی هیچ بەڵگەیەک، بۆ تێکەڵبوونی لەگەڵ ئایینی زەردەشتی، چ لەسەردەمی ئاڤێستایی و چ لەسەردەمی ساسانیداو تەنانەت لاوازییەکی ڕێژەیی ئایینی میهر لەسەردەمی ساسانییەکان، ڕەنگە سەلمێنەری ئەم ڕوانگەیە بێت، کە مێژووی پێکهاتنی کەسایەتیی ئەهوورامەزدا لەلای نەتەوەکانی ئێران، ئیزنی بەوە نەدابێت کە ئایینی زێروانی کاریگەرییەکی زۆرتر لەسەر ئایینی زەردەشتی دابنێت و میهری خواوەند لە ئایینی زەردەشتیدا، جێگەی ئاهوورامەزدا بگرێتەوە. هەر چەند بەهۆی دابەزینی پێگەی ئاهوورامەزدا لە نێو گاتاکان و نێوان سێ فاقەیی (ئاهوورامەزدا– سپەنتامینوو – ئەهریمەن)و هاوسەنگبوونی لەگەڵ سپەنتامینوو لە ئاڤێستای نوێ و لە سەردەمی ئەشکانیدا، ڕێگەی بۆ هاتنی زێروان بۆ نێو ئایینی زەردەشت خۆشکرد.

بەسەرنجدان لەگرنگیی میهر(میترا) لە سەردەمانی کۆندا، باشتر وایە بارودۆخی ئەم خواوەندە تاوتوێ بکەین. هەرچەند کۆنترین شوێنێک، کە ئاماژە بە ناوی میهر دەکات، دەقی پەیماننامەی میتانی – هیتییە، کە مێژووەکەی بۆ نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بەڵام لە ڤیدای هیندییەکاندا زانیارییەکی یەکجار زۆر بوونی هەیە.

بەم پێیە کۆنترین دەقی هیندی، میترا

دوو ئەرکی سەرەکیی هەیە :

١. فەرمانڕەوایی ڕۆحانی.

ئەلیف. پاشایەتی و شاهەنشاهی (هاوڕێ لەگەڵ وەروونە).

ب. پێکهێنانی نەزمی مادی و ئەخلاقیی جیهان (هاوڕێ لەگەڵ وەروونە).

ج. کۆکردنەوەی خەڵک، کە ملکەچبوونی ئەو ٥ هۆزەی لە بەرانبەردا لێدەکەوێتەوە.

د. پاراستنی خواوەندەکان..

هـ.. پاراستنی یاسا.

ب٢. بەرەکەت بەشی.

ئەلیف. باراندنی باران و خواوەندیی چۆم و رووبارەکان (هاوڕێ لەگەڵ وەروونە).

ب. پاراستنی جوتیارەکان.

سەرەڕای ئەو دوو ئەرکە سەرەکییە، ئەرکی پاراستنی تەبایی و ئاشتەواییشی لە ئەستۆیە، کە بەکۆکراوەی ئەرکەکانی دادەنرێت، چونکە لەلایەکەوە لەگەڵ پاشا، لەلایەکیدیکەشەوە لەگەڵ دانی رزق و رۆزی بەرەوڕووە.

ئەم دوو ئەرکە، هەردووکیان، یەکجار کۆنن، کە پەیوەندی بەهیند و ئێرانی و تەنانەت هیند و ئەورووپاییەکانەوە هەیە. ئەرکی یەکەم باس لە پێگەی تایبەتیی ئەو لەجیهانی خواوەندەکاندا دەکات و ئەرکی دووەم باس لە ئەرکی گشتیی خواوەندەکان لەگەڵ جیهانی مادیدا دەکات.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، نە لەنێو گاتاکانی زەردەشت و نە لە یەکەم بەردە نووسراوەکانی سەردەمی هەخامەنشیەکاندا، باسێک لە میهر(میترا) نەکراوە.

بەرواڵەت شتێکی سەیر و جێگەی سەرنجە کە لەهیچکام لەم دوانە، باسێک لە میهر، ئەم خواوەندەی سەردەمی هیند و ئێرانییەکان، نەکراوە. زەردەشت لە گاتاکاندا ـ هەتا ئەو شوێنەی کە بەپێی ئەو گاتایانەی کە لەبەردەستدا هەن دەتوانین بڵێین ـ هاوڕێ لەگەڵ وەلانانی هەموو خواوەندە دێرینەکانی ئێران، میهریش وەلا نراوە. لەراستیدا زەردەشت بەشێوەی تاقانە لەجیهانی خواوەندەکان نزیکبۆتەوە، کە ئاهوورامەزدا یەکێک لەو خواوەندانەیە و ئەنگەرەمینو (ئەهریمەن) و سپەنتەمینوو (فریشتەی پارێزەری دار و درەخت و زەوییە) وەک دوو هێمای خراپە و چاکە لە جیهاندا سەیر دەکرێن.

یەكـــەمین بـــەردە نووســـراوەكانی ســـەردەمی هەخامەنشـــیەكان و زانیارییەكانی ئێمە لەسەر ئەو سەردەمەی چاخی بەردین دەریدەخات جیا لـە ئاهوورامـەزدا، خواوەنـدێكی دیكـەش بـەناوی (= بـەغان) هـەبووە، بـەڵام گرنگییەكی ئـەوتۆ و جێی بایـەخیان لـە لای یەكـەم پاشـاكانی هەخامەنشـی نەبووە، كە ناویان لەسەر بەردە نووسراوەكان تۆمار بكەن.

لەراستیدا، یەكەم بەردە نووسراوەكان، جۆرێك لە باوەڕمەندبوون بە یەك فاقەیی پێوە دیـارە، بـەڵام وەك ئـەوەی پیشـتر باسمانكرد، بـە ئەرخایـەنی ناتوانین پشت بە ئەم بەردە نووسراوانە ببەستین. لە رەهەندی بڵاوكردنەوەی فەرهەنگییەوە، ئاهوورامـەزدای هەخامەنشـییەكان لەگـەڵ خواوەنـدی دێرینـی میزۆپۆتامییەكان ئێنا / ئەنكی، پەیوەندی و نزیكایـەتی هەیـە، هـەر چەنـد یەك نەبوون.

بـەڵام لەئاڤێسـتای نـوێ و یەكـەمین بەردەنووسـراوەكانی سـەردەمی هەخامەنشـییەكان، بـە پێچەوانـەی سـەردەمی رابـردوو، بـەو پـەڕی سەرسووڕمانەوە، نەتەنیا بەرەوڕووی گەڕانەوەی خواوەنـدەكان و (بەغـەكان) دەبینەوە، بەڵكو بەرەوڕووی میهری خواوەندێك دەبینەوە، كە چەندین قـات بەهێـزتر لە میهری خواوەندی قۆناغی "ڤیـدایی ـ میتـانی"یـە و خـاوەنی سـێ ئەركی خۆیەتی (كە لەژێر كاریگەریی مەردۆخ و ئاشوورییەكانی میزۆپۆتامیاو روانگەی رۆژئاوایە).(

## بەپێی میهریەشتی ئاڤێستایی :

١. میهر ئاگاداری وتە و ئاكاری دروستە، ناتوانین درۆی لەگەڵـدا بكـەین، ئـەو دژی پەیمانشـكێنییە، ئاگـاداری هـەموو شـتێكە و كـەس نـاتوانێ فێڵـی لێبكات، جەستە و لەشی ئەو وەك كەلامی خواوەند وایە، ماریفەت و زانستی رۆحانییەت و تێگەیشتن لە كـەلامی خواوەنـد دەبەشـێتە ئینسـان، داڕێـژەری یاسایە، پاشایەكی مەزن و بەهێـزە، بەشەندەی رزق و رۆزییە. ئەم وەسف و خەسڵەتانە باس لە ئەركی یەكەم دەكەن.

٢. ئەو خواوەندێکی بەهێزەو لە نێوان خوڵقێنەراندا بە هێـز و دەسەڵاتی یەکەم ئەناسرێ، ئەو پاسەوانی لـە جیهـان ئـەکات و خـەو و خـۆراکی نییـە، یارمەتیدەری جەنگاوەرانە. جەنگاوەران دەبێ بۆ بەهێـزبوونی ئەسپەکانیان و تەندروستیی خۆیان سوژدەی بۆ بەرن، پێویستیان پێیـەتی، ئـەو پاڵـەوان و جـەنگاوەرێکی بەهێـــزە، سـەرکەوتن و بەختــەوەری ئەبەخشـێت، ریزەکـانی دوژمنــان تێکدەشـکێنێ، پاڵــەوانێکی بــەهێزی شــەڕکردنەو تــەور و زیــن و خەنجەر و گورزی هەیە.

**ئەم خەسڵەتانە دووەم ئەرکی ئەو دیاری دەکات.**

٣. میهر چەندین دەشتی کاکیبەکاکیی هەیە، وزەی رۆیشتن بەئەسـپەکان دەبەخشێت، ماڵ و ئاسـایش و هێمنـی ئەبەشـێت، خێـر و بەرەکـەت بەسـەر خەڵکدا ئەڕژێنێ، ، فریشتەکانی دژ بە رزق و رۆزی دەخاتـە ژێــر گوشـار و راویان دەنێت، ئاژەڵی چوار پێی وەک ئەسپ و ماین ئەبەشێت، ماڵەکان بـە ژنــی سـەنگین و مـاقووڵ دەڕازێنێتــەوە، شـادی و بەختــەوری و سـەروەت و سامان ئەبەشـێت، ئـاو و کانیـاو دەژیێنێتـەوە، بـاران دەبـارێنێ و گـژ و گیـا دەڕوێنــێ، مــەڕ و مــاڵات و ئــاژەڵی خــەڵک زیــاد دەکــات، کــوڕی بەهێـــز ئەبەخشێ و ژیان ئەبەخشێ.

ئەم خەسڵەتانە بـاس لەئـەرکی سـێیەم دەکـات. لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئەرکی سێیەمدا پێویستە باسـی ئاتەشـگەی گرنگـی "ئـازەر بـۆرزین"ی میهـر بکەین، کە ئاتەشگەی وەرزێـرەکان بووە. هەر وەک دەبینرێ ئەم ئاتەشگەیە، ناوی میهری خواوەندی لەسەر بووە. بەم پێیە میهری ئاڤێستایی نەتەنیا دوو ئەرکی ڤیدایی لەخۆیدا بەهێـز کردووە، بەڵکو ئەرکی سێیەمیشی وەرگرتووەو وەک پێگەی هێز و دەسەڵاتی خۆی چاوی لێکردووە..

لەدوایین بەردە نووسراوەکانی سەردەمی هەخامەنشییەکانیشدا ناوی میهر ــ بـە پێچەوانــەی قۆنــاغی یەکــەم، هەخامەنشــییەکان ـ لــە ســەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ئەردەشیری دووەم (٤٠٤ هەتا ٣٥٩ پـێش زایـین) لـە بـەردە

نووسراوەکاندا دێتە گۆڕێ و درێـژەی دەبێـت. ئەردەشـیری دووەم دەڵێـت :
"من لەسەر داوای هۆرەمەزد، ناهید و میهر"ی ئاسمانم دروستکرد.

ئەم ئەم پێکهاتەیە زیاتر شێوەی پێکهاتەی " (ئێنا / ئەنکی)ـ مەردۆخ — ئیشتر". ئێنا خواوەندی زانایی، خوڵقێنەری گشتی لەسەردەمی میزۆپۆتامیای دێریندا دادوەری گشتی و پشـتیوانی ئینسـان بـوو. وێکچووی لەڕادەبـەدەری نێوان "ئێنا (= ئەنکی) لەگەڵ ئاهوورامەزدا و باوەڕهێنان بە ئاهوورامەزدا لـە پێدەشتەکانی ئێـران دا وەک خواوەندێکی مەزن، ئەم ئەگەرە دەخـوڵقێ کـە باوەڕهێنان بە خواوەندێکی هاوشێوەی ئەنکی، خواوەندی زانـایی، ئـەخلاق و یەکسانی لە پێدەشتەکانی ئێراندا بـەر لـەهاتنی ئاریاییـەکان لـەئارادا بـووەو ئارياييەکان ئـەم خواوەنـدە خۆجێییـەيان قـەبووڵ کـردووە و کەسـایەتییەکی بەهێـزتر و مەزنتریان پێبەشیوە، بەڵام کاریگەرییـە نوێیـەکانی میزۆپۆتامیـا لەسەر بیرۆکەی ئـایینی ئێرانییـەکان لـەقۆناغی دووەمـی هەخامەنشـییەکان، بووە هۆکاری ئەوەی میهر و ناهید بەسیمایەکی نوێتر لـە ئەفسـانە و ئـایینی ئێرانییەکاندا دەر بکەون. میهـری خواوەنـد سـیمایەکی نـوێ و مـەردۆخی بـە خۆیـەوەگرتووەو لەگـەڵ ناهیـد (کـە سـیمایەکی هاوشـێوەی سەرەسـوتی، خـاتوونی خواوەنـدی ڤیـدایی هەیـە) کـە سـیمایەکی ئیشـتر(خواوەنـدی تەمووز)ی هەیـە، هاوشـێوەی مـەردۆخ و ئیشـتر / ئاشـوور و ئیشـتر، ژن و مێردێکی ئاسمانییان پێک هێناوە. بەهـەمان شـێوە کـە مـەردۆخ و ئیشـتر / ئاشوور و ئیشتر هەردووکیان کە منداڵی ئێنـا (= ئـەنکی) بـوون، (میهـر و ناهید)یش بە دەستی هۆرەمەزد خوڵقاون.

ئەم ژن و مێـردە ئاسمانییە — بەهۆی هێـزی بڕواهێنـان بەئاهوورامـەزدا، بە پێشینەی خۆجێیبـوونی خۆیانـەوە، ئـەو هێـزەی کـە لـە ئاهوورامـەزدایان وەرئـەگرت لەگـەڵ هـەبوونی پەرسـتگە تایبەتییـەکانی ئاناهیتـا لـە ئێـران (هاوشـێوەی ئایینـە هێماییـەکانی ئیشـتر لـە ئاشـوور)و لەگـەڵ هـەبوونی پەرسـتگە میهرییـەکان و ئاتەشـگەی "بـۆرزین میهـر" نیشـانەی ئەوەیـە کـە ناتوانێت لە ئایینی زەردەشتیـدا جێگەی ئاهوورامەزدا بگرێتەوە.

لەراستیدا ئەو ئاڵوگۆڕەی کە لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین لە میزۆپۆتامیا دێتە ئاراوە، لە ئایینی سەرمایەدار و دەوڵەمەندەکانی ئێرانەوە سەرچاوەیگرت و پەرستنی خواوەندی دێرین و زانا، ئەخلاق و یەکسانی لە پێدەشتەکانی ئێراندا وەک خۆی مایەوە.

لێرەدا پێویستە خاڵێک وەبیربێنینەوە، لەگەڵ ئەوەی کە گومان دەکەین ئاهوورامەزدا سیمای نوێی خواوەندی دێرینی پێدەشتەکانی ئێران و میزۆپۆتامیا، ئەنکی / ئێئا بێت، بەڵام پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە ئاهوورامەزدای گاتاکان، زەوی هەتا ئاسمان لەگەڵ ئێئا ئەنکیی دێرین جیاوازیی هەیە. جیاوازیی ئاهوورامەزدای گاتا و بەردەنووسراوەکان لەگەڵ ئێئا یان ئەنکی، هەر ئەو جیاوازییانەن کە لەنێوان جیهانی ئەفسانەکان و جیهانی ئایینەکاندا بوونی هەیە. ئاهوورامەزدا لە بەردە نووسراوەکان و گاتاکانی زەردەشتدا، بە بەراورد لەگەڵ ئەنکی، خواوەندێکی مەزنتر و بەهێزتر دەکەوێتە بەرچاو. ئەو ئەفسانەیەی کە لە دەوروبەری ئەنکی بوونی هەیە، زۆر سەرەتایی و ئاساییە، لە کاتێکدا پەرستنی ئاهوورامەزدا لە بەردە نووسراوە و گاتاکاندا، هێمای شکۆمەندی و مەزنایەتییەکەی دێتە ئەژمار.

لەنێو خەڵکی ئاسایی نیشتەجێی پێدەشتەکانی ئێران، پێکهاتەی نوێی میزۆپۆتامیایی دێتە ئاراوە، کە ئایینی زۆروانی - میهری و واننایی نمونەی ئەو پێکهاتەیە. هەڵبەت پێویستە کاریگەرییەکانی ئاسیای رۆژئاوا، لە ئایینی میهری و مانایدا، لەبەرچاو بگیرێت.

لە ئایینی زۆروانی — میهریدا، کە هەتا ئاسیای رۆژئاوا و یۆنان دەڕوات، میهری خواوەند رۆڵی سەرەکیی هەیە و رۆڵی زێیووس / ژوپیتێر کەمڕەنگ دەبێتەوە. هەروەها، لە ئایینی مانناییشدا هۆرەمەزد رۆڵێکی گرنگ، بەڵام بێ ناوەڕۆکی هەیە. لێرەدا میهری خواوەندە، کە ئەرکی سەرەکی و تێکشکاندنی ئەهریمەنی لە ئەستۆیە و لەهەر دوو ئایینـدا زۆروان وەک خواوەندێکی هەتا هەتایی، بایەخێکی بەرچاوی هەیە.

**تایبەتمەندییەکانی زۆروان**

**لەکۆبەندی زانیارییە پرش و بڵاوەکاندا:**

١. خواوەندێکی مەزن، هەتا هەتاییە.،

٢. ئـەو خواوەنــدی کــات و ســاتە، هۆرەمــەزد و ئەهریمــەن ئــەو خوڵقاندوونی و هۆرەمەزدی و ئەهریمەنی بەهۆی بوونی ئەوەوە مومکینە.

٣. ئەو خواوەندێکی عادل و دادپەروەرە.

٤. ئەو لە زانست و هێـزی بێسنوور بەهرەمەند نییە.

٥. ئەو خواوەندی بەخت، مەرگ و ژیانە.

٦. وای (هــەوا) کــە بــە خواوەنــدی ئاســمان ناســراوە، لــە دوایــین ئەفسانەکانی زەردەشتیدا، جەستەی زۆروان بەهاوتای ئاسمان دادەنرێت، کە بە هەوای هێدی و هێمنی خواوەند لە هەمبەر زۆروان، لەقەڵەم ئەدرێت.

٧. زۆروان لە زۆربەی چیرۆکەکاندا هاوسەری هەیە.

٨. هۆرەمەزد و ئەهریمەن، هەدووکیان منداڵی ئەون.

**جیهانناسیی زۆروانی**

١. جیهـانی مـادی لـە تـاریکی، کـە بوونـەوەرێکی ئەهریمەنییـە، دروسـت کراوە (تاریکی دژی ڕووناکی).

٢. خوڵقێنەرەکـەی هۆرەمـەزدە، بـەڵام بـە بـێ یارمـەتیی زۆروان توانـای خوڵقاندنی جیهانی ڕووناکیی نەبوو.

٣. بەپێچەوانـەی بیـرو بـاوەڕی زەردەشـتی، کـە پێیـان وایـە جیهـان لـە ڕووناکی دروستکراوە، زۆروانییەکان لەو باوەڕەدان، کە جیهان لە ئاو دروست کرا. (ئاو دژی ئاگر).

٤. ئەهریمەن بۆ ماوەی ٧ یان ٩ هەزار ساڵ فەرمانڕەوای جیهانە.

ژنان مەخلوقاتێکی ئەهریمەنین، کە هۆرەمەزد بە ناچاری خوڵقاندوویەتی، بەشدارینەکردنی ژنان لە ڕێوڕەسمە ئایینەکانی میهری، یۆنـان و ڕۆمیـدا، دەکرێ ئاکامی ئەم جۆرە عەقڵیەت و بیرۆکەیە بێت.

## خواوەندە ڕاستییەکان

١. زوروان خواوەنـدێکی مەزنـە، داوەریـی شـەڕی نێـوان هۆرەمـەزد و ئەهریمەن، خواوەندی بەختە.

٢. هۆرەمەزد خوڵقێنەر و دوایین فەرمانڕەوای جیهانە.

٣ .٣. میهـر بنـەمای هێـز و هەڵسـوڕێنەری شـەڕی نێـوان هۆرەمـەزد و ئەهریمەنە، بۆ خۆیشی لەدژی ئەهریمەن، خواوەندی جەنگاوەرییە.

## ئینسان

٣. ئینسان ڕۆڵێکی گرنگی لەشەڕ و تێکهەڵچوونەکانی نێوان هۆرەمەزد و ئەهریمەندا هەیە. ئینسان بە لایەنگری و پەیڕەویکردن لە میهر، لـە شـەڕدا بەشـداری دەکـات. بـەڵام ژنــان مــافی بەشــداریکردنیان لــە ڕێوڕەســمە ئایینییەکاندا نییە، چونکە پێدەچێ لە تۆرەمە و ڕەچەڵەکی ئەهریمەنییـەکان دروستکرابن.

ئەم خەسڵەتە زوروانییانە، بە دڵنیاییەوە، بـە ئـاڵوگۆڕێکی یـەکجار زۆر، دەگاتـە سـەر بنـەما و بنچینـەکانی ئیسـلام و بـەبڕوای نووسـەر بـە شـێوەی سۆفیگەری لەنێو ئیسلامدا جێگەی خۆی کردۆتەوە. لەم ئایینـەدا پاڵـەوانان، جوامێرەکـان و تاقمێـک لـە سـۆفییەکان جێیـان دەبـۆوە. هەرچەنـد لـەمڕۆدا چۆنییەتیی بیروباوەڕی زوروانی، بە تـەواوەتی لەبیـر کـراوە، بـەڵام بـەبڕوای نووسـەر، زۆرخانـە، ڕێوڕەسـم و ئایینـە پاڵەوانییـەکان، بـەجێماوی ئـایینی زوروانی - میهرین.

# بەشی پێنجەم

## ئایینی گنووسی

لەکاتێکدا کە ئایینی مەسیحییەت لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی رۆم، لەو وڵاتەدا، لە بەرەبەری بەهێزبووندابوو، ئایینە سەرەتاییەکان، بتپەرستی و خورافات و ئەفسانە و چیرۆکە خەیاڵییەکان، سەرتاسەری ئەو وڵاتەیان تەنیبوو. هەروەها کۆمەڵێک ئایینی فەلسەفییش، لەشکڵی جۆراوجۆری، وەک : فەلسەفەی رواقی (حیکمەتی)، فەلسەفەی ئەفلاتونی و فیساغورسی و رۆژهەڵاتییش تێکەڵی کرابوون و لێکدانەوەیەکی نوێیان بۆ دەکرد. بیروباوەڕی یۆنانی و رۆژهەڵاتیش، ئاوێتە و تێکەڵی یەکتریبوون و ئایینی سیحراویی وەک ئایینی دیمەتر، ئیزیس دایکی مەزن، هەروەها کەمێک پاشتر، ئایینی میهر، لەبیری خەڵکدا رۆ چووبوو، کە بە کەرامەت و داهاتووی پاش مردن دڵیان خۆش کردبوو.

لەوەها دۆخێکدا بوو کە گنووسییەکان سەیانهەڵدا، گنووس

گنووس لە بنەڕەتدا لە وشەی یۆنانیی "gnosis" "زانین" دروست بووە. پێڕەوانی ئەم ئایینە لایان وابوو، کە بەراستییەکانیان زانیوەو دەستیان پێیراگەیشتووە. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون، کە راستییەکان تەنیا لای خواوەند ئاشکران، ئەم راستییانەش لە بنەڕەتدا لە سەردەمانی زۆر کۆنەوە بەشێوەی سیحراوی باسیان لێوە کراوە و لەلایەن کەسانێکی تایبەتییەوە، کەدەستیان بە راستییەکە راگەیشتبوو، سینگ بە سینگ گوازراوەتەوە. بۆ نموونە گنووسییە مەسیحییەکان پێیان وابوو زانیارییەکانی خۆیان لە یەکێک لە هاوڕێکانی عیسای مەسیح، یان تەنانەت مریەم و لە عیسای مەسیح فێر بوونە کە بە شێوەی پێخەم (وەحی)یان پێگەیشتووە.

ئایینی گنووسی تەنیا پێخەم و ئیلهام نەبووە، بەڵکو ئایینی رزگاری بووە. لەم ئایینەدا، رۆحی ئینسان فێر دەبوو کە بە چ شێوەیەک لە پاش ئازادبوون، جارێکیدیکە بۆ جیهانی رۆح بگەڕێتەوە، کە پێشتر لەوێوە کەوتبووە سەر جیهانی مادی. ئەم ئازادییە بە یارمەتی و ئاگایی لەسەر

پێخەمی خواوەند پێکدێت و ئەم ئاگاییەش لەگەڵ جێبەجێکردنی نزا و ڕێوڕەسمە ئایینییەکان، دروست دەبێت. هەموو کەسێک نەیدەتوانی بچێتە ئەو ئاستە و هەموو کەسێکیش لەو ئایینەدا وەر نەدەگیرا. تەنیا ئەو کەسانە فێری ئەو زانستە دەکران، کە دەیانتوانی بەسەریدا زاڵ بن.

ئەو کەسانەی کە فێری ئەو ئایینە دەکران، لەسەر دوو ڕەهەندی و دژ بەیەکبوونی مادە و ڕۆح بوو، خواوەندی خوڵقێنەریش دەستی کەسی پێڕانەدەگەیشت. ئافراندنی جیهانی مادی، کاری ئەم خواوەندە نەبووە، بەڵکو کاری خواوەندێک کە چەندین قات لە خوارتر یان کاری ئەهریمەن بووە.

لە نێوان جیهانی مادی و خواوەندی مەزندا، لێرە و لەوێ، چەندین خواوەندیدیکە هەبوون و بڕیارەکان و داواکاریی خواوەندی مەزنیان بۆ جیهانی مادی دەبرد، لە هەمان کاتدا ئەو بڕیار و داواکارییانەی، کە لە جیهانی مادی نزیکدەبوونەوە، ڕەنگی ئاژاوەو خراپەکارییان لێدەنیشت، هەروەها ڕۆحیش، بەپێی ئەم ڕەوتە، بۆ ئاسمان دەگەڕایەوەو خۆی لە خواوەند نزیکدەکردەوە.

ئەم بنەما فیکری و تێگەیشتنەیە، کە زۆرێک لە ئایینەکان، دەخاتە ژێر کاریگەری و ڕکێفی خۆیەوە.

بە دڵنیاییەوە بنەما هزرییەکانی ئایینی گنووسی، لە پێش ئایینی مەسیحیدا بوونی هەبووەو پاشان لە گەڵیدا بەرەوپووبۆتەوە. لە سەدەکانی سەرەتای مەسیحییەتدا، ئایینی گنووسی سەرتاسەری یۆنان و ڕۆمی تەنی و ئایینی مەسیحی و جووەکانی خستە مەترسییەوە.

ئایینی گنووسی لە سەرەتادا لە ئەسکەندەرییە و سامەڕا (ناوەندی دەسەڵاتداریەتیی ئایینی جووەکان) سەریهەڵدا. ئایینی گنووسی لەمیسر، ئاوێتەی ئایینی ئیزیس و ئۆزیریس بوو. لە ئایینی گنووسیدا دوو بنەمای دژ بەیەک و سەربەخۆ لەیەکتر، بوونیان هەیە، یەکیان بنەمای شەڕ، ئەویدیکەشیان چاکەیە. لەم جیهانەدا خواوەند وەک سکڵێک لە ناخی ئێمەدایە و لە پێشدا گەشاوە بووەو ئێستا کووژاوەتەوە، هەتا ڕۆژێک سەرلەنوێ سەر هەڵبداتەوەو بدرەوشێتەوە. ئەم ژیلەمۆیانە لەت لەتی جەستەی ئۆزیریسن، کە لەسەرتاسەری میسردا بڵاوبۆتەوەو بەخاک

سپێردراوەو ئۆزیریس بەدوایدا دەگەڕێ. ئەم روانگەیە، دواتر لەبیروباوەڕی گنووسی مەسیحی بازیلدیس و والنتینـدا سەرلەنوێ خۆیان دەردەخەنەوە.

لە سامەڕا (عیبری) Shomron ئایینی گنووسی هاوکات لەگەڵ مەسیحییەتدا رمێنی باشی هەبوو، کە رێبەرییەکەی لە دەستی شەمعون مغدا بوو و خەڵک پەیرەوییان لێدەکرد. تەنانەت لە دەقە مەسیحییەکانیشدا هاتووە کە ئیدیعای خواوەندی کردووە. ئەم رێچکەیە لە ئاسیای رۆژئاوادا یەکجار زۆر بەرچاو دەکەوێت، کە سەرەتا کەسێک دەلاڵ و ناوبژیوانیی نێوان خواوەندی مەزن و خەڵکەکەی کردووە، پاشان خۆی بە خواوەندی مەزن داناوە.

لە سەدەی دووەمی زایینیدا، پەیڕەوانی شەمعون بە رواڵەت سێ فاقەیی مەسیحیان قەبوڵ کردبوو، لە هەوڵی ئەوەشدابوون کە شەمعون، وەک منداڵی خواوەند، لە قەڵەم بدەن کە هاتۆتە نێو جووەکان و لە سامەڕا وەک باوک و لە نێو هۆزەکانیدیکەدا وەک خواوەند سەیر کراوە، دواتریش پەیرەوانی شەمعون لەپەنا خواوەندی مەزندا، هاوسەرێکیان بەناوی هێلێن بۆ دانا. ئەم ئایینە لە ئاسمانەکان و لە نێو ئەستێرەکاندا دروست بوو. لەوێدا پەرستنی خواوەندی مانگ برەوی باشی هەبوو. پەیڕەوانی شەمعون، ئەم خواوەندەیان، بەهاوتای زانایی دانا و خەڵکی ئەسکەندەرییەش بە ئیزیس ناودێریان کرد.

نە تەنیا ئایینی شەمعون، بەڵکو ئایینەکانیدیکەی گنووسیش هەموویان لە داوێنی مەسیحییەتدا بە خۆیاندا هاتن و پەرەیان گرت. هەر ئەم بابەتە دواتر بووەهۆی دروستبوونی کێشەو ناکۆکی و لە ئەنجامدا کێشە لە نێوانیاندا هاتە ئاراوە.

بەپێی نووسراوە مەسیحییەکان، سەرچاوەو بنەمای ئایینی گنووسییەکان بەم شێوەی خوارەوەیە :

١. مادە دوژمنایەتیی رۆح ئەکات، بە هەمان شێوە کە شەڕ دوژمنایەتیی چاکە ئەکات. کەوابوو دەکرێ مادە بێرێزیی پێبکرێت. تەنانەت حاشا لەوە دەکات کەعیسا بە جەستەوە گەڕابێتەوە بۆ ئاسمان و غوسڵی لە خۆی دەر ئەکات. لە بواری ئەخلاقیدا، زۆر جار، بەهۆی مادیبوونی جەستەوە، سنوورە ئەخلاقییەکان دەشکێن، چونکە هەر خۆبەدوور گرتنێک، مادیبوونی جەستە

لە نێو نابات، کەوابوو جیاوازییەک لە نێوان خۆ بەدوورگرتن و گەندەڵیی ئەخلاقیدا بوونی نییە. لە هێندێک لە تاقمەکاندا، بەپێچەوانەوە، خۆ بە دوورگرتنێکی ئەوتۆ هەیە کە هەر چەشنە پەیوەندییەک دەبێتە هۆی ئالوودەبوونی زیاتر، بۆیە ژن، گۆشت و مەی لە ژیان دوور دەخرێنەوە.

٢. خەیاڵکرنی سەیر و سەمەرە لەنێوان پەیرەوانی ئەم ئایینەدا، وەک نەریتێکی گشتیی لێهاتبوو. خەون و خەیالات، بیر و بۆچوونی سەرسوورهێنەر، سەبارەت بە فریشتەکان، چوونە بنج و بناوانی ئەژدادی خۆیان، هەروەها فێربوونی چیرۆک برەوی باشی هەبوو.

٣.عیسای مەسیحیان لە پلەیەک خوارتر لە فریشتەکان دادەناو زۆر جار حاشایان لە هەبوونی دەکرد، هیندێک کەسیش دەیانگوت عیسا جەستەی نییە و پێیان وابوو ئەو بەجەستەی خۆیەوە نەهاتۆتە سەر زەوی.

٤. ئەم کافرانە زیاتر لە نێو جووەکانەوە سەریانهەڵداو خۆیان بەمامۆستای یاسا لەقەڵەمدەدا.

شەڕ و کێشەی نێوان مەسیحی و گنووسییەکان بووەهۆی ئەوەی خوێندنەوەو باس و گفتوگۆ لەسەر مەسەلەکانی ئایینیی مەسیحییەت پەرەبگرێت و لەئەنجامدا بناغەیەکی بەهێزی بۆ دروست بکات.

***

لە سەدەی دووەمی مەسیحیدا، دۆخی مەسیحی دژوارتربووەوەو گنووسییەکان شێلگیرانەتر بەرەورووی مەسیحییەکان بوونەوە. یەکێک لە گنووسییەکان بازیلیدیسی ناوبوو، کە لە ئەسکەندەرییە دەژیا. گرنگترین مەسەلەی جێگەی سەرنج ئەمەبوو کە شەڕ لە کوێوە هاتووە. ئەو لەسەر ئەو باوەڕەبوو، کە خواوەند لەسەر ئازاردانی تاوانباران سوورە. ئەو پێیوابوو ئازارێک، کە شەهید دەیچێژێ، ئاکامی ئەو تاوان و سوچانەیە، کە خۆی، لە ماوەی ژیانیدا کردوونی.

لەراستیدا بازیلیدس نەسلی مرۆڤایەتیی بەگومڕا دەزانی و پێیوابوو کە تەنیا پەیڕەوانی ئەوان لەم گومڕاییە رزگاریان دەبێت و بەرەورووی راستی دەبنەوە. ئەم راستییەش شتێک نەبوو کە فێری خەڵک بکرێت، دەبوا بە

دەستیان بهێنایە، بۆیە پێویستبوو خاوەن خەسڵەتێکی تایبەتی بن، کە توانای بە دەستهێنانیان هەبوایە.

والنتین لەسەر ئەو باوەڕەبوو، کە بەدەستهێنانی ئەو راستییە، تەنیا بۆ کەسانێکی تایبەت و کامڵ دەلوێ، لە کاتێکدا بەبۆچوونی بازیلیدس باوەڕی کامڵ دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی راستی، دواتر گنووسییەکان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی، کە بەدەسهێنانی راستی پێویستیی بە ئیمان و باوەڕ نییە. بازیلیدس پێیوابوو راستی بۆ خۆی لە چەندین قۆناغدا خویا دەبێت. بەقسەی بازیلیدس، لە بنەڕەتدا خواوەندێک بوونی هەیە کە هێشتا لەدایک نەبووە. ئەودەم زانایی دێتە ئاراوە، پاشان ئاخاوتن، دواتر بیر کردنەوە، تێگەیشتوویی هێز، داد، لە ئاکامیشدا ئاسایش و هێمنایەتی دەر ئەکەون. ئەمانە کۆمەڵێک مەودای نێوان خواوەند و جیهانی مادین، کە ئەم دوانە لە یەکتر گرێ ئەدەن.

***

واڵنتین لە سەدەی دووەمی مەسیحیدا دەژیا، کە بە گەورەترین بانگەشەکەری ئایینی گنووسی دادەندرا. هەروەها دوو بابەت، جیاوازی لە نێوان پڕوپاگەندەی بازیلیدس و والنتیندا پێک دەهێنا. یەکەم جیاوازی کە پێشتر ئامـاژەی پێکرا. دووەم جیاوازی ئەوەی کە ژیانی خواوەند و بەردەوامییەکەی لە رێگەی خویا بوونەوە نییە، بەڵکو لە رێگەی جووتەی ئێنئۆنەکانەوەیە، کە یەکەم دەستەیان لە هەشت جووت پێک هاتووە، پاشان دەستەی دووەم لە دە ئێنئۆن، دەستەی سێیەمیش لە دوازدە ئینئۆن پێکهاتوون، کە لەسەر یەک سی جووت ئێنئۆن بوونیان هەیە، کە ئەمە لە خۆیدا ژمارەیەکی پیرۆز بووە.

خواوەندی مەزن رۆژێک بڕیاری ئافراندنیدا و یەکەم جووتی خوڵقاند، کە زانایی و راستی بوون. واڵنیتن لەو باوەڕەدایە خواوەندەکان لەژێر کاریگەریی شەهوەتدا چینی جیاواز لەیەکتریان دروستکردووە. ئێنئۆنەکان جووت جووت لەیەکتر نزیکایەتییان دەکردو ئێنئۆنی نوێیان دروست دەکرد. ئەمە هەر ئەو روانگەیەیە کە لە مانناییدا لەلایەن دێوەکانەوە ئەنجام ئەدرا.

دوایین ئێنئۆن بەناوی سۆفیا لە داوێنی جیهانی مادی کەوتەوەو ئەمەش بووە سەرچاوەی سووچ و تاوان. هیندێک جار سۆفیا بەر نابێتەوە، بەڵام ئالوودە دەبێت و پێویستە رزگار بکرێت. مەسیح و خواوەند دێن بۆ رزگارکردنی. مەسیحی گنووسی و مەسیحی عیسایی لە بنەڕەتدا یەکێکن. ئەو ئاکامی سی "ئێنئۆن"ـە کە لە جیهانی خواوەندەوە دێتە سەر زەوی. ئەو لەگەڵ سۆفیا خۆی دەکاتە یەک و لە ئەنجامدا لەو شەهوەتانەی کە تێیکەوتووە رزگاری دەکات.

ئەم زانیارییانە نابێ بکەونە بەر دەستی هەموو کەسێک، بەڵکو شانازییەکە، کە کەمتر رۆحێک دەگرێتەوە. ئایینی واڵنتین بەم زووانە دابەشی چەندین لق دەبێت، کە گرنگترینیان قوتابخانە رۆژئاوایی و رۆهەڵاتییەکان دەبێت.

مەرقیوون هاوکات لەگەڵ واڵنتین و بازیلیدس، بەڵام لەوان بەساڵاچووتربوو. ئەو بە گەورەترین دوژمنی کەنیسەی مەسیحییەکان دادەنرا. ئەو رێبەرێکی بەهێز و چالاک بوو، ناوەندە ئایینییەکانی خۆی لە ئیمپراتۆریەتی رۆم دروستکرد و دواتر ئینجیلێکی نوێی خستەڕوو، کە تیایدا بەشێکی بەرچاو لە ئینجیلی مەسیحییەکان سڕدرابووەوە. مەرقیوون لە شاری سینووپ لە ئاسیای بچووک، کە دانیشتوانەکەی مەسیحی بوون، چاوی بە جیهان هەڵێنابوو. ئەو کە پیاوێکی دەوڵەمەندبوو، رووی لە رۆم کرد و وەک مەسیحییەکی خاوەن بڕوا خۆی ناساند، بەڵام دەستی کرد بە رێکخستنی دەستە و گروپی خۆی و چیرۆکەکەی لە ئینجیل دەرهێنا و کتێبێکی لەژێر ناوی ئانتی تێز نووسییەوە و ساڵی ١٤٤مەسیحی، لەگەڵ مەسیحییەت پەیوەندییەکانی، بەگشتی، پچڕاند و دەستە و بیر و باوەڕ و تاقمەکەی مەرقیوون بە شێوەیەکی بەرین بڵاوبووەوە.

ئەو لەو باوەڕەدابووخواوەندی جووەکان، کە خواوەندێکی خوڵقێنەرە، لەگەڵ خواوەندی مەسیحییەکان جیایە. ئەو دەقی تەوراتی جووەکان و ئینجیلی مەسیحییەکانی لەگەڵ یەکتر بەراورد کرد و دەرکەوت کەناوەڕۆکەکەیان بە پێچەوانەی یەکترین، کەوابوو، ئەم دوانە باس لە دوو خواوەندی جیاواز دەکەن، بۆیە لە ئەنجامدا ئینجیلی خۆی دروست کرد و

تەوراتی لە خۆی دوورخستەوەو تەنیا لە نێو تەوراتدا چیرۆکی "لوقا"ی قەبوڵ کرد، سەرەڕای ئەوەش چەند بەشێکی لێ لابرد.

مەرقیوون بنەمای بیرکردنەوەی خۆی، بەم شێوەیە، باس دەکات: جۆرێک دووفاقەیی، جیهان بەسەر دوو بەرەدا دابەش دەکات. جیهانێک کە دەبیندرێت و جیهانێک کە نابیندرێت. ئەو جیهانەی کە دەبیندرێت، بە دەستی خواوەندێکی نەفس نزم دروستکراوە کە بەخوڵقێنەری جیهان ناودێر کرا. ئەم خواوەندە بە ئەنقەست بەرەورووی خواوەندی مەزن نەبۆتەوەو لە هەبوونی ئەو بێ ئاگایە. ئەو ئەهریمەن نییە، بەڵام خواوەندێکی زاڵم و غەدارە. لەم جیهانەدا کە خۆی خوڵقاندوویەتی، جیا لە غەم و پەژارە هیچی تێدا نییە، ئینسانیشی ئافراندووەو هەناسەی خۆی بە زاریدا کردووە، کە ئەوە رۆحی ئینسانەو پاشان لەگەڵ مێینە دەستی تێکەڵکردووە و بەرەو نەفس نزمی رۆیشتووە. بەڵام خوڵقێنەری جیهان چاوی بە مەخلوقاتی خۆی هەڵنایەو تەنانەت لێکدانەوەی چاکەو خراپەی پێنەداوەو لە بەهەشتی سەر زەوی وەدەریناوە. لێرەوەیە کە مێژووی رەنج و ناخۆشیی ئینسان دەست پێدەکات. جووەکان کە بەخراپترین هۆزی ئەم سەر زەوییە دادەندران، خۆشەویستترین هۆزی خواوندی جیهانبوون، هەر ئەویش بوو کە هۆزەکانیدیکەی لەبەر جووەکان لەناوبردبوو. ئەوەی ئەم هۆزە لە خواوەندەوە بۆی مابووەوە، نەفس نزمی، زەبوونی و داماوی و بەرچاوتەنگی بوو. ئەو یاسا و ئایینەی کە خواوەند بەجووەکانی داوە، گەمژانە و لاواز وجێگەی شوورەییە. ئەو لەو باوەڕەدا بوو پێغەمبەری جووەکان، پێغەمبەرانی ئەو خواوەندە زاڵمە بوون و سەرجەمیان لە هەبوونی خواوەندەی مەزن بێ ئاگابوون.

بەڵام خواوەندی مەزن، کە دڵی بۆ ئینسان، ئەم بوونەوەرە رەزیل و داماوە دەسووتێ، لە هەوڵی رزگارکردنی دایە. ئەو یەسووع (عیسا)ی لە سەردەمی تیبریووس پاتشادا، لە ئاسمانەوە نارده سەر زەوی، ناردی بۆ مەوتەنی مەسیح لە فەڵەستین و جەلیل، هەتا فێری هەقیقەت بێت. هەرچەند خواوەندی جیهان بەڵێنی ناردنی مەسیحی داوە کە هەتا ئێستا نەهاتووە، بەڵام خواوەندی جیهان، لە رابردوودا هاتۆتە سەر زەوی و نەیویست لەشی مادی (لەشێک کە ببیندرێت) بۆ خۆی دەستەبەر بکات،

چونکە مادە بە گشتی ناپاکە. ئەو تەنیا رواڵەتی مادەی قەبوڵ کرد و لەدایک بوو، قۆناغی منداڵیی نەبوو و لەناکاو، لە کەنیسەی وڵاتی مەسیحدا، هاتە سەر جیهان.

ئەو بەبێ ئەوەی دژایەتی خواوەندی جیهان بکات، بیروڕای خۆی خستەبەر رای خەڵک و خۆی بەهێنانەوەی پەرجوو سەرقاڵ کرد و پەیڕەوانی خوڵقێنەری جیهان لەدەوری کۆبوونەوە، پێترۆسی هاوڕێ گومانیکرد کە ئەمە یەسووع، هەمان مەسیح بێت، بەڵام یەسووع پێیخۆش نەبوو بەزەبری گوشار، هێزی خواوەندی جیهان بەدەست بێنێت، ئەو ئینسانی بەمردنی خۆی، کڕییەوە و پاش مردن بەرەو جەهەنەم رۆیشت بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی خواوەندیان مەحکومکردووە، رزگار بکات کە ئەم تاقمە "قابیل، لووت، میسرییەکان و کافرەکان"بوون. ئەو سەرجەمی ئەمانەی ئازاد کرد، بەڵام هابیل و نوح و پێغەمبەرانیدیکە رزگار نەکران، چونکە ئەوان باوەڕیان بە یەسووع نەهێناو گومانیان کرد کە رەنگە خواوەند جارێکیدیکە فێڵیان لێبکات، قوتابییەکانی خۆی پاکیی ئینجیلیان نەپاراست. تەنیا رێژەیەکی کەم، کە لەگەڵ پۆلۆسی هاوڕێی یەسووع بوون، بڕیارەکانی ئەویان جێبەجێکرد و رێگەی رزگارییان پیشاندا. کەوابوو، تەنیا کەسانی هەڵبژێردراو رزگارییان دەبێت و خەڵکیدیکە تامی خۆشی و بەختەوەری ناچێژن.

بیرۆکەکانی مەرقیوون لە پاش نەمانی خۆی، گۆڕانیان بەسەردا هات و هێندیک لە تاقمەکان باوەڕیان بە سێ ئەسڵی: خواوەندی مەزن، خواوەندی خوڵقێنەری جیهان و دوو فاقەیی یان ئەهریمەن، هەبوو.

زۆری پێناچێ خواوەندی خوڵقێنەری جیهان لەنێو ئایینی گنووسیدا دەسڕدرێتەوە و خواوەندی مەزن و ئەهریمەن دەمێننەوە، کە ئەم گۆڕانەش لە ئایینی مانەویدا بە چەشنێک بەرچاو دەکەوێت.

# بەشی شەشەم

## ئایینی مانەوی

مانی لە ١٤ ئاوریلی ٢١٦ی زایینی لە باکووری بابل، هاوکات لەگەڵ کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی ئەشکانییەکان، چاوی بە دنیا هەڵێنا. ناوی باوکی پەتگە و خەڵکی هەمەدانە، هەروەها دایکیشی ناوی مریەمە و لە خێزانێکی خانەدانی دەوڵەمەند بوو. ناوی مانی ئێرانی نییە، بەڵکو ناوێکی ئارامییە. پەتگ لە هەمەدانەوە بەرەو تیسفوون پایتەختی ئەشکانییەکان رۆیشت و لەوێ چووە نێو تاقمی مۆغتەلیسە* کە تاقمێکی گنووسی بوو. ئەو لەسەر ئیدیعای خۆی و بە پێی پەیامی خواوەند، دەستی لە گۆشتخواردن، شەرابخواردنەوەو دەست تێکەڵکردن لەگەڵ ژناندا کێشایەوەو هاوڕێ لەگەڵ کوڕەکەی خۆی (مانی)، کە تەمەنی چوار ساڵان بوو، لەگەڵ ئەندامانی ئەو تاقمە، یەکیانگرتەوە. بە پێی گێڕانەوەی مانەوییەکان، مانی منداڵێکی تەمەن ١٢ ساڵان بوو، کە فریشتەیەک، یان رۆحێکی خواوەندی بە بەردا کرا و راستیی ئایینە خواوەندییەکەی بۆ روونکردەوە. ١٢ ساڵ دواتر، هەمان رۆح، بەبەریدا کرایەوەو فەرمانی پێکرد کە بانگەشە بۆ ئایینەکەی بکات. سەرەتا باوکی خۆی، دواتریش گەورەکانی نێو بنەماڵەی خۆی، هێنایە سەر ئایینەکەی خۆی، پاشان بەسەفەرێکی دەریایی رووی لە هیند، توران و مەکران واتا سێند و سیستان و بەلووچستانی ئێستا، کرد و توانیی پاشای توران بێنێتە سەر ئایینەکەی خۆی. لەکاتی بەدەسەڵات گەیشتنی شاپووری یەکەمی ساسانییەکان (٢٤٢ی زایینی) لەڕێگەی دەریاوە بەرەو پێدەشتەکانی ئێران گەڕایەوەو بەپێ هەتا خوزستان و میشان لە باشووری دیجلە، رۆیشت. لەڕێگەدا بەرەوڕووی کۆمەڵێک کێشە و ئاستەنگ بووەوە و لەوێوە بەرەو بابل گەڕایەوەو بەمەبەستی بانگەشەکردن رووی لەوڵاتی ماد کرد. کۆمەڵێک دوژمنی بۆ خۆی داتاشی، بەڵام بەردی بناغەی کۆمەڵگەی مانیی دانا و

توانیی یەکێک لە براکانی پاتشا بە ناوی پیرۆز بێنێتە سەر ئایینەکەی خۆی، هەر ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کە توانیی چاوی بە شاپووری یەکەم بکەوێت. مانی سێ جار چاوی بە شاپوور کەوت، سەرئەنجام پاتشا ئەوی وەک هاوڕێی هەمیشەیی خۆی دیاریکرد و ئیزنی ئەوەی پێدا کە بتوانێ لەسەرتاسەری وڵاتدا بانگەشە بۆ ئایینەکەی بکات. ئەو لە ماوەی چەندین ساڵدا بانگەشەیەکی لە رادەبەدەری بۆ ئایینەکەی خۆیکرد و سەرەڕای تەبلیغات بەپزیشکیشەوە سەرقاڵ بوو، سەرئەنجام لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتدارێتیی شاپووردا توانیی برایەکیدیکەی شاپوور، واتا میهر شا، فەرمانڕەوای میشان، بەرەو لای ئایینەکەی خۆی رابکێشێت. پاشان چەندین نوێنەری بەرەو میسر، رۆم و باکووری رۆژهەڵاتی وڵاتی ساسانییەکان بەڕێکردو سەرکەوتنی یەکجار مەزنی بەدەستهێنا.

لە کاتی مردنی شاپوور لە دەورووبەری ٢٧٣ی زایینی، مانەوییەت لەسەرتاسەری ئەو وڵاتەدا پێگەیەکی بەهێزی هەبوو، لە کاتێکدا ئایینی فەرمیی ئەو وڵاتە زەردەشتی بوو. لەسەروبەندی دەسەڵاتدارێتیی هۆرەمەزد، کوڕی شاپووری یەکەم، مانی بەرەو بابل گەڕایەوە، بەڵام لەپاش فەرمانڕەوایەتیی هۆرەمەزد، لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی بەهرام، برای هۆرەمەزد، مانی سەرلەنوێ، سەفەری خۆی دەستپێکردەوەو بەرەو باشووری دیجلە بەڕێکەوت. لە کاتێکدا کە بەتەمابوو لە ئەهوازەوە بەرەو باکووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە بڕوا، لە لایەن دەوڵەتەوە پێشی پێگیرا و لە ئەنجامدا بەرەو میشان گەڕایەوەو رووی لە تیسفوون کرد، پاشان داوایان لێکرد چاوی بە بەهرام بکەوێ.

بەهرامیش بەهۆی دنەدانی مووبەدە زەرەشتییەکانەوە، بەبێچاوڕوویی لەگەڵی جووڵایەوەو بڕیاری زیندانیکردنیداو پاش ٢٦ رۆژ مانەوە لەزیندان، دەورووبەری ٢٧٧ی زایینی، لە تەمەنی ٦١ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

پاش مردنی مانی، هیندێک کێشە و ناکۆکی لەنێو رێبەریی مانەوییەکاندا هاتە ئاراوەو هاوکات بەهۆی ئەوەی کە پەیڕەوانی مانەوی کەوتبوونە ژێر

گوشـارەوە، دەسـتەیەکی مـەزنی مانـەوی بـە ناچـاری روویـان لـەدەرەوەی ئێـران، لە ئاسیای ناوەڕاست کرد و لەوێ سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندو جیا لە پەنابەرانی مانەوی، لە نێوان "سۆغدیان"یشدا کە دانیشتوانی خۆجێی ئەو ناوچەیەبوون، تاقمێک روویان لە ئایینی مانی کردبوو.

پاش هاتنی ئیسلام بۆ ئێـران، بەشـێوەیەکی گوشـار بۆسـەر پـەیڕەوانی ئایینی مانی کـەم بـووەوە، تەنانـەت هیندێکیشیان بـەرەو ئێـران گەڕانـەوە، بـەڵام لــە ســەردەمی خەلیفــەی عەباســییەکاندا، ســەرلەنوێ کوشــتاری مانەوییەکان دەسـتی پێکـردەوەو ناوەنـدی ئـایینی مانـەوی لەبەغـدا مایـەوەو هەتا سەدەی دەیەمی زایینی خۆی راگرت. لە پاشان ناوەندی مانەوهییەت بۆ سـەمەرقەند گوازرایـەوەو لـەوە بـە دواوە نازانرێـت مانەوییـەکان چییـان لـێ بەسەرهات و هیچ زانیارییەکیش لەو بارەیەوە لەبەر دەستدا نییە.

مانەوییـەکان لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی حەوتەمـدا گەیشـتنە تورکسـتانی رۆژهەڵات و چین و هاوڕێ لەگەڵ سۆغدییەکان، کۆمەڵێک ناوەندی ئایینییـان پێکهێنا. تەنانەت ساڵی ٦٩٤ی زایینی شـاندێکی مانـەوی چوونـە دیوەخـانی چین و لە ٧٣٢ی زایینیدا مانەوییەکان لەسەر ئیزنـی دەسـەڵاتدارێتیی چین، رێوڕەسمە ئایینییەکانی خۆیان بەڕێوەبرد. لە ناوەڕاستی سـەدەی هەشتەمی زایینی، کە تورکستانی چین، لەلایەن دانیشتوانی باکووری رۆژئـاوی چینـەوە دەستی بەسـەرداگیرابوو، ئـایینی مـانی کرایـە ئـایینی فـەرمیی وڵات و هـەتا ناوەراستی سەدەی نۆیەمی زایینی، ئەم رەوتـە درێـژەی هـەبوو. لـە سـەدەی سـێزدەیەمی زاییـنی، لەگـەڵ هێرشـی مەغۆڵـەکان، ئـایینی مانـەوهی دوایـین زەبری گورچکبڕی وێکەوت و لەوە بەدواوە هیچ زانیارییەک لەسـەریان بـوونی نییە.

دوابەدوای ئەو ئاڵوگۆڕانـەی لـە بیروبـاوەڕی گنووسـیدا پێکهـاتبوو، مـانی رایگەیاند کە دوو جیهانی رۆح (خێـر) و مادە (= شەڕ) لـە بەرانبـەر یەکدا راوەستاون، کە هیچکات پێکەوە دانوویان نەکوڵاوەو هەمیشە دژبە یەکن. ئەم دوو هێــزە بــەهۆی هەڵوێسـتی شــەڕانگێزانەی هێــزی شــەڕەوە، تووشــی

تێکهەڵچوونبوون و جیهانی رووناکی یان خێر، تەنیا لە کاتێکدا رزگار دەبێت کە لە مادە یا شەڕ جیا ببێتەوە.

مانی گوتوویەتی لەسەرەتادا بەهەشتێکی رووناک لەئامانەکان بوونی هەبوو، کە جیا لە جەهەنەم یان تاریکی، بەرەو هەموو لایەک پەلی هاویشتبوو. ئەم بەهەشتە لە پێنج توخمی فەروەهەر، با (هەوا)، رۆشنایی، ئاگر و ئاو پێکهاتبوو. زۆروان فەرمانڕەوای ئەم بەهەشتەبوو. گیانلەبەرانی ئەم جیهانە ئێنئۆنەکانن، کە گیانلەبەرانی نەمرین و بە گشتی دەرخەری بەرچاوتەنگیی زۆروانن، هەروەها لە نێوان زۆروان و جیهاندا دەڵاڵی دەکەن. سەرەڕای ئەمانەش خاتوونە خواوەندێک بەناوی گیانی پیرۆز بوونی هەیە، کە پێدەچێ هاوسەری زۆروان بێت.

جەهەنەمیش دابەشی پێنج ناوچەکراوە، کە هەرکام لەوانە، لەیەکێک لە توخمەکانی پێنج توخمی تاریکی دروستبووە، کە لە "مادە، هەوای تاریک، ژەهر و دووکەڵ" پێک دێن. لەم پێنج ناوچەیەی جەهەنەمدا، پێج جۆر دێو لە شێوەی دوولاق، چوار لاق، باڵدار، مەلەوان و خشۆک" دەژین، کە لە هەر جۆرێک، جووتێک (نێر و مێ) بوونیان هەیە، کە بۆ هەتاهەتایە، بەشێوەی شەهوەتی و توندوتیژ دەمێننەوە. ئەهریمەن، یان شازادەی تاریکی، فەرمانڕەوایی سەرجەمیانی لە ئەستۆیەو بۆ خۆیشی تایبەتمەندییەکانی سەرجەم ئەو دێوانەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، کە لە دێو (دوو لاق)، شێر (چوار لاق)، هەڵۆ (باڵدار)، ماسی (مەلەوان) و ئەژدیها (خشۆک) پێکهاتوون. زۆر جار ئەهریمەن لە قاڵبی مادەدا وێنا دەکرێت.

بە رێکەوت، ئەهریمەن گەیشتە سنووری نێوان بەهەشت و جەهەنەم و کە چاوی بە رۆشنایی بەهەشت کەوت ئاواتی خواست موڵکی خۆی بوایە و لە ئەنجامدا هوروژمی بۆ برد. زۆروان، بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایشی هەتاهەتایی لە نیشتمانەکەی، ئاکاری چاکە و وتەی خێری خۆی بەرەورووی ئەهریمەن کردەوە، ئەم ئاکارانە خواوەندی مانەوییەکان بوون و جیاوازییان تەنیا لە ئەرکەکانیاندابوو.

له ئایینی مانەویدا سێ تاقمی خواوەند بوونیان هەیە، له تاقمی یەکەمدا، دایک واتای ژیانه. ئەویش منداڵەکەی خۆی بەناوی (هۆرمەزدبەغ)، یان مرۆڤی سەرەتایی، بانگ دەکات. هۆرمەزدبەغ پێنج منداڵەکەی خۆی، لە پێنج توخمەکەی بەهەشتی رۆشنایی دروستکرد و بۆ شەڕکردن ئاوقای هێزەکانی شەڕی کردن. ئەو پێنج رۆڵەیە، بە ئەمیهرسپەنتان ناودێر کران. بەلام ئەم پێنج رۆڵەیەی هۆرمەزدبەغ لە بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ هێزی تاریکی و شەڕ تووشی شکستبوون و پاشان هۆرمەزدبەغ ئەو پێنج رۆڵەیەی خۆی لە جیهانی تاریکی بەجێهێشت، بۆ ئەوەی جارێکیدیکە هێزەکانی شەڕ بیر لە هێرشکردنە سەر بەهەشتی رۆشنایی نەکەنەوە. دێوە جەهەنەمییەکان، ئەو پێنج رۆڵەیەی هۆرمەزدبەغیان قووتدا و بیری هێرشکردنە سەر بەهەشتی رۆشناییان لەلا نەما.

بەم شێوەیە، بەشێک لەبەهەشتی رۆشنایی لەدەستی هۆرمەزدبەغدا نەماو لەلایەن هێزی تاریکییەوە بە یەخسیر گیراو بەهۆی ئەم یەخسیرییەوە، رەسەنایەتیی خۆی لەدەستداو بەهۆی گوشاری مادەوە، تووشی فەرامۆشی بوو، بەڵام مادە سەرخۆش و مەستی سەرکەوتنەکەی بوو.

هۆرمەزدبەغ بە بێهۆشی لە قولایی جەهەنەمدا کەوتبوو، بەڵام کاتێک هۆشی وەبەر خۆی هاتەوە داوای یارمەتیی کرد، دایکی کە گوێی لە هاواری رۆڵەکەی بوو، داوای لە زۆروان کرد بەهانای رۆڵەکەیەوە بچێت، بۆ ئەوەی رۆڵەکەی لە جەهەنەم رزگار بکات. زۆروان دەستەی دووەمی خواوەندەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی بە هانای هۆرمەزدبەغـەوە بچن. یەکەم خواوەندی دەستەی دووەمی خواوەندەکان، کە هەتا رادەیەک ئەرکەکانیان ناڕوونن، ناوی دۆست رۆشنان بوو. دوای ئەو، بام ئیزەد و پاشان میهر ئیزەد، یان هەمان رۆحی زیندووە. میهر ئیزەد پێنج منداڵی هەیە، کە پارێزگاری لە پارێزەری شکۆ، شانازیی پاتشا، ئەڵماسی رووناکی، شکۆی پاشا و مانبەد ئیزەد (ئەتڵەس) دەکەن. میهر ئیزەد چووە سەر لێواری دۆزەخ و پڕ بە گەروو بانگی کرد. هاوکات هۆرمەزدبەغ کە گوێی لە بانگی میهر ئیزەد بوو،

لەنێو قوولایی جەهەنەمەوە، وەڵامی دایەوە. ئەم بانگکردن و وەڵام دانەوەیە، بە خواوەندی مانەوەییەکان ئەژمار دەکرێن: بانگکردن شەشەمین منداڵی میهرئیزەد و هەروەها وەڵامیش بە شەشەمین منداڵی هۆرمەزدبەغ دادەنرێن. بانگکردن باس لە ئاواتی خواوەندەکان بۆ رزگارکردنی رووناکیی یەخسیر کراو و هەروەها وەڵامیش باس لە پەرچەکرداری رووناکی بەم ئاواتە دەکات. رزگاربوونی هۆرمەزدبەغ بە نموونە و ئۆلگووی کۆنی رزگاریی رۆحی ئینسانەکانە، چونکە هۆرمەزدبەغ لە بێهۆشییەوە هاتەوە سەرخۆو رزگارییەکەی دەستەبەر بوو و لەدەستی تاریکی و شەڕ رزگاری بوو، بەرەو لای دایکی ژیان و میهر ئیزەد و بەهەشتی رووناکی گەڕایەوە.

### ئافراندنی جیهان

میهرئیزەد، لەپاش رزگارکردنی هۆرمەزدبەغ هێرشی کردەسەر جیهانی تاریکی و هێزە تاریکییەکانی تێکشکاند . لەکەلاکی دێوە کوژراوەکان :

١. هەشت زەوی دروست دەکات.

٢. لە پێستەکەیان دە ئاسمان سەر یەک دەخات.

٣. هەروەها ئەوانەی کە مابوونەوە خانەدان و گەورە دێوەکان بوون، زیندانی دەکرێن و بەزیندوویی لەئاسمان دەیانبەستێتەوە.

٤. ئەو رووناکییانەی قووتدراون و هێشتا ئالوودە نەبوون، خۆر و مانگیان لێدروست دەکات، کە لە ئاسمانێکی دیکەدا، ئاسمانی یازدەیەم، دایاندەنێت.

٥. بۆ رزگار کردنی ئەو رووناکییانەی کە هێشتا بە یەخسیری ماونەتەوە، سێ ئاسمان دروست دەکات، کە لە ئاسمانی ئاگر، ئاسمانی ئاو و ئاسمانی با، پێکهاتوون کە پاشا پارێزگارییان لێدەکات. پارێزەری شکۆ دە ئاسمانی سەرەوەی راگرتووەو مانبەد ئیزەد کە لەسەر جیهانی پێنجەم راوەستاوە، سێ ئاسمانی سەروو خۆی راگرتووە.

## ڕەوتی ڕزگاری

جیهان لەم قۆناغەدا هیچ جوڵە و بزاوتێکی نییەو هێشتا ژیان بەدی نەهاتووە. هەتاو لە شوێنی خۆی لە ئاسمان ڕاوەستاوە.

زۆروان خولقێنەری سێیەم بانگ دەکات، کە بەو هۆیەوە خواوەندە ڕزگاریدەرەکان کۆدەبنەوە. یەکەمیان (نریسە ئیزەد)ی ناوە، کە بەپێغەمبەری سێیەم بەناوبانگەو بۆ خۆی خاتوونی ڕووناکی بانگ دەکات، کە زۆر جار بە شێوەی دوازدە خاتوون خۆی دەنوێنێ. نریسە ئیزەد، کە هێمای جوانیی خواوەندە، خاتوونی ڕووناکی خۆی بە ڕووتی دەخاتە بەرچاوی گەورەی دێوەکان، کە لە ئاسماندا بەند کراوە. دێوەکان بەدیتنی خاتوونی ڕووناکی حەشەری دەبن و ڕەحەت دەبن و بەو هۆیەوە ئەو نورەی کە لە جەستەیاندا بوو، دەڕژێتە سەر زەوی. بەشێکی کە دەڕژێتە نێو دەریاکان، دێوی گەورەی دەریایی لێپەیدا دەبێ، کە ئەڵماسی ڕووناکی لە ناو دەبات. ئەو بەشەی کە دەڕژێتە سەر زەوی، شینبوونی گژوگیای لێدەکەوێتەوە. دێوە مێیەکان، کە لە جەهەنەمدا لەدێوە نێرەکان ئاوس بوون، بەرەکانیان دەخەن و دەکەونە سەر زەوی و پێنج جۆر دێوی جەهەنەمی دروست دەکەن، کە لە دوو لاق، چوار لاق، باڵندە، خشۆک و مەلەوان پێکهاتوون.

لەم کاتەدا، بام ئیزەد بەهەشتی نوێ دروست دەکات، کە لە بەهەشتی ڕووناک و هەتا هەتایی پێکدێت، بەڵام لەکاتی جووتبوونی ئەو دوو هێزەدا، ژیانێکی سەربەخۆی هەیەو ئەرکەکەیشی ئەوەیە کە لە دەورانی جووتبوونی دوو هێزی (خێر و شەڕ)دا ماڵی خواوەندەکان و ڕۆشنایی ڕزگار بکات، بۆ ئەوەی بەڵکو بەهەشت بۆ هەتا هەتایە بەدوور لە هەر جۆرە گرفتاری و تەنگ و چەڵەمەیەک بێت. هۆرمەزدبەغ فەرمانڕەوایی ئەم بەهەشتە نوێیە دەکات.

سێیەمین خواوەند لە سێیەمین خولقێنەر، ستوونی ڕووناکی بەناوبانگەو هەر چەندە بەواتای ئەو ڕێگەیەیە کە شۆق و نورە ڕزگارکراوەکان لەوێوە

بەرەو ئاسمان دەڕۆن، بەڵام وەک خواوەند ئەژمار دەکرێت. دەروون و جەستە پاکەکان لەم رێگەیەوە بەرەو مانگ دەڕۆن و ئەمەش دەبێتە هۆی گەورە بوونی مانگ و دەبێتە هۆی ئەوە کە مانگ خەرمانە بدات. پاشان روو لەخۆر دەکەن و مانگ سەرلەنوێ دەبێ گەورە ببێتەوە. نوور و شۆقە رزگارکراوەکان لە تەنیشت خۆریشەوە بەرەو بەهەشتی نوێ دەڕۆن. مانگ و خۆر لە نووسراوە مانەوییەکاندا بەکەشتی و ئەڕابە ناویان هاتووە، کە تەختی خواوەندەکانیان لەنێو جەستەی خۆیاندا جێکردۆتەوە.

خواوەندە خولْقێنەرەکانی دەستەی سێیەم، نۆبە بە نۆبە بانگکران، کە لە عیسای نورانی، بیری مەزن، یان بەهمەن و دادوەری — دادگەر، پێکدێنن.

بەهمەن ٥ ئەندامی وەک: "زەین، بیر، دژکردەوە، هۆش و زانست"ی هەیە کە بە ٥ وزەی مێشک دادەندرێن و هاوکات وجودی خواوەند ئاوێتەیان بووە. نریسە ئیزەد، مانگ و خۆری خستە جووڵەو بە ئالوگۆڕی وەرزەکان، رزگاریی رۆشنایی لەرێگەی ئاونگ و بارانەوە دەست پێدەکات.

## خولْقاندنی ئینسان

مادە کە لە دوو دێوی ئاز و ئارەزوو وێنا کراوە، بۆ کەمڕەنگکردنەوەی هەوڵی رزگارکردنی رووناکی، ئەو دوو دێوە، دڕندەیەکی زەبەلاحی بۆ قووتدانی بێچووە دێوەکان خولْقاند، هەتا بتوانێ لەم رێگەیەوە رووناکیی نێو جەستەی ئەو بێچوانە، لە جەستەی خۆیاندا کۆبکاتەوە. بۆیە لە ئەنجامدا ئەو دڕندە زەبەلاحەیان دروست کرد.

ئەم دوو دێوە شێوەی خواوەندەکان ئەدەن ( شێوەیان دەچێتەوە سەر نریسە ئیزەد و خاتوونی رووناکی)، ئەمانە هەمان خواوەند بوون کە لەلایەن دێوە زیندانییەکانەوە بیندرابوون. هەموو ئەو رووناکییانەی کە ئەو دوو دێوە قووتیاندابوون، دێتەوە نێو جەستەی ئەو دوو مرۆڤە سەرەتاییەو لە ئەنجامدا رۆحیشیان بە بەردا دەکرێت و هاوڕێ لەگەڵ رۆحی زیندانیکراوی رۆشنایی، رۆحی تاریکییش لە جەستەیدا دەمێنێتەوە، کە شەهوەتی ئاز،

بەرچاوتەنگی، رق و قین ئاوێتەی بووە. ئەم شەهوەتەیە کە ئینسان ناچاری زاوزێ دەکات و بۆ هەتاهەتایە رۆحی ئینسان بە زینـدانیکراوی دەهێڵێتـەوە. عیسای نـورانی لـە ئاسمانەوە دێتـە سـەر زەوی و رۆحـی ئینسـان لـە خـەو هەڵدەستێنێ و سەرچاوەی رووناکی (هەمان سەرچاوەی رۆح) پیشان ئەدات، واتـە فێـری زانسـی دەکـات. گهمـۆرد روو لـە داوێـن پـاکی دەکـات، بـەڵام مۆردیانە، کە رووناکییەکی کەمتری هەیە، لەلایەن دێوێکـەوە فریـو ئـەدرێ و یەکەم بێچووەکانی خۆیان بەناوی ( هابیل و قابیـل) دەخەنـەوە. پاشـان لـە ئەنجامی جووتبوونی لەگەڵ گێمـۆردا، شـیس چـاوی بـە جیهـان هەڵـدێنێ و بەم پێیە مرۆڤ بۆ هەتاهەتایە زیندانی دەکرێت.

## رێگەی رزگاریی تاك

ئەو نورەی کە رۆحی ئینسانی لێدروست دەکرێ، بەشـێوەی مـادە نـاکرێ رزگار بکرێت. رزگارکردنی ئەو نورە تەنیا لـە رێگـەی هەوڵـدانێکی زیرەکانـەو بە شێوەی تاکە کەسی دەلوێت. بەهمەن کۆمـەڵێک پێغەمبـەر دەنێرێـت، کـە ماریفەت (gnosis) بە منداڵی ئینسانەکان بە دیاری دێـنن. ئەمـەش هـەر ئەو کارەیە کە عیسای نورانی هـاوڕێ لەگـەڵ گهمـۆرد کـردی. بـەم ماریفەتـە وەرەی خۆرزگاربوون لای تـاک دروسـت دەبێـت، بـەڵام مـادە بـەردەوام هـەوڵ ئـەدات کـە رۆح بـە لـەبیرکراوی بمێنێتـەوە، وەک بـە خـەوی مەسـتانە ناودێـرکراوە. مانی ناوی ئینسانی دێرینی لەم رۆحـە نووستوە نـاوەو رۆحـی بێداریش بە ئینسانی نوێ نـاو دەبـات. رۆح کـە لـە رووناکی دروسـت بـووە، بێگومان پاک و خاوێنەو تەنیا بەهۆی فەرامۆشییەوە تووشی سـووچ و تـاوان دەبێت، بـەم شـێوەیە هێـزی بەربـەرەکانێ و رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ رۆحـی تـاریکی لـە دەسـت ئـەدات. ئاکـامی سـووچ و تـاوان پەشـیمانییەو تـەنیا لـە رێگەی سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ئاگایی و هەڵوێستێکی بوێرانەوە دەکرێ قەرەبوو بکرێتەوە.

چارەنووسی رۆح لە پاش مەرگیش گرێدراوی ژیانی تاکە، رەنگبێ رۆح چەندین جار لە پاش مەرگ بگەڕێتەوە سەر جیهان و هەتا ئەو شوێنەی کە شیاوی رزگاربوون بێت، ئەمەش تەنیا لە رێگەی پارێزکردن لە سووچ و گوناهەوە دەستەبەر دەبێت. بە پێی چیرۆکە مانەوییەکان رۆح لە پاش مەرگی تاک دەچێتە لای داوەری عادل ئاکارو کردەوەکانی هەڵدەسەنگێنێ و لەئەنجامدا، یان دەچێتە بەهەشتی نوێ، یان دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی تێکەڵکراوی رۆشنایی و تاریکیی رابردووی، یان سەری خۆی بەرەو جەهەنەم هەڵدەگرێت.

بەپێی چیرۆکەکانیتر، رۆحی خۆپارێز، هەر کە لەجەستە جیابووەوە، خواوەندە رزگارکەرەکان دەچنە پێشوازیی و سێ دەستە فریشتەی بەهەشتی، تەوقی گوڵ، تاج و جلوبەرگی بەهەشتی بۆ دێنن. رۆح لەگەڵ ئەوەی کە ئەم سێ دانەیەی لەبەر کرد، بەرەو بەهەشتی نوێ بەڕێدەکەوێ و لە رێگەی بەهەشتی نوێدا بە ئەرخایەنی لە ستوونی رووناکی، مانگ و خۆرەوە تێدەپەڕێت. هیندێک جار خواوەندی رزگارکەر بە سیمای خاتوونی رووناکییەوە خۆی دەنوێنێ.

## کۆتایی جیهان

شەڕێکی مەزن، نیشانەی کۆتایی جیهانە، کە تیایدا هەموویان لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دێن و لەم نێوانەدا ئیمان رۆیشتووە، چونکە لەو سەردەمەدا بەو شێوەیەی کە پێویستە نورو رووناکی لە جیهانی مادیدا نەماوە. لەم کاتەدا، عیسا سەرلەنوێ دێتەوە سەر زەوی و تەختی عەدالەت دائەمەزرێنێتەوەو ئینسانی چاک و خراپ لە یەکتر جیادەکاتەوە، هاوکات ئەو خواوەندانەی کە زەوی و ئاسمانیان هێناوەتە سەر ئەم رەوتە، کارەکانیان جێدەهێڵن و ئەوکاتەیە کە زەوی و ئاسمانەکان تێکدەڕووخێن و ئاگری بە قودرەت، بڵێسەی هەتا ئەوپەڕی جیهان دەڕوات و دوایین ترۆپکی نوری

ئازاد بەرەو بەهەشتی نوێ دەچێت، کە بۆ خۆی بە دوایین خواوەند ناودێرکراوە.

لەم کاتەدایە کە مادە زیندانی دەکرێت و دەرکی زیندانی مادە بەبەردێکی زەبەلاح دائەپۆشرێت و بەهەشتی نوێ دەبێتە بەهەشتی رووناکی و سەرجەم بوونەوەرەکان، خواوەندەکان و رزگارکراوەکان دەچن چاویان بە باوەگەورەیی دەکەوێت، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە لە دەسپێکی هێرشی ئەهریمەنەوە هیچ چاوپێکەوتنێک ئەنجام نەدرابوو.

## "عیسا لە ئایینی "مانی"دا

وەک ئاشکرایە، مانی باوەڕی بە سێ دانە عیسا هەبووە :

١. عیسای نوورانی، خواوەندی رزگاریدەر.

٢. عیسای زەحمەتکێش. لە مانەوییەتی رۆژئاواییدا بە رۆحی ئازار چێشتووی نێو مادە دەگوترێ، رۆحێک کە هاوشێوەی عیسا لە خاچ دراوە.

٣. عیسای مەسیح، پێغەمبەر و کوڕی خواوەند کە روالەتی ئینسانی بەخۆیەوە گرتبوو، گومانیان وابوو لە خاچ دراوەو بەدەم ئازارەوە دەنالێنێ. مانی لەم روانگەیەوە، کە پێغەمبەر و کوڕی خواوەند جەستەیان هەبووە، رەتدەکاتەوەو پێیوانەبوو کە ئەو لە خاچ درابێت. هەندێک جاریش سێ پێناسە و واتای جیاواز لەیەکتر لەبارەی عیسای مەسیح هەیە و لە هەر کام لەم حاڵەتانەدا، یەکێک لەو سێ عیسایە دیار نامێنێت.

مانی پێیوابوو عیسا پێغەمبەرێک بوو پێش خۆی هاتبوو و خۆی بەو پێغەمبەرە دادەنا کە عیسای مەسیح پێشبینیی کردبوو. ئەو رێزی لە کەسایەتیی بودا و زەردەشت ئەگرت، بەڵام پێدەچی زانیارییەکی ئەوتۆی لەسەر رێنماییەکانیان نەبووبێت.

مانی لەو باوەڕەدا بوو، ئەخلاقی جوان لە پێناو رزگارکردنی رووناکی، لە جیهانی مادیدا زیندانیکراوە، بۆ ئەوەی رووناکی ئازاری پێ نەگات. ئەم روانگەیە لایەنی ئەخلاقی و مادیی هەردووکیانی لەخۆدەگرت. هەروەها

دەکرێ ڕۆح لە ڕێگەی "ئەخلاقی جوانی برایانە، ئیمان، پشوودرێژی، تێگەیشتوویی، ڕاستی، ئاشتی و دڵخۆشکردنی خەڵک"ەوە ڕزگار بکرێت. پێویستە بەحورمەت بیت و لە کاری سێکسی خۆ بەدوور بگری. بەتایبەت ئەم خاڵەی کۆتایی گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە هەر جۆرە دەست تێکەڵاوکردن و جووتبوونێک دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆح بۆ هەتاهەتا زیندانی بکرێت. هەروەها خواردنی گۆشت بە نارەوا دەزانرا، چونکە بوونەوەرەکان بەشێک لە نوربوون و لەشیان لە مادەی تاریک دروستکرابوو. کوشتنی هەر بوونەوەرێک و تەنانەت قرتاندنی چڵە گیایەک بەسووچ و گوناح ئەژمار دەکرا. چونکە ئەم کارە دەبووە هۆی ئازاردانی ئەو نوورەی لە جەستەی ئەو بوونەوەرە، یان ئەو چڵە گیایە دایە.

لە ئەنجامدا، مانەوەییەکان دەستیان لە جیهان داشۆردبوو. پەیڕەوانی مانەوەی بەسەر دوو دەستەدا، دابەش دەبوون : هەڵبژێردراوان و نیوشاگان (= گوێگرەکان). هەڵبژێردراوەکان بەردەوام سەرقاڵی نزا و پاڕانەوەبوون و گوێگرەکان، کە زۆربەی پەیڕەوانی ئەو ئایینەیان پێکدێنا، دەبوا پێداویستییەکانی ژیانی هەڵبژێردراوەکانیان دابین بکردایە، بەم هۆیەوەو بۆ دابینکردنی بژێویی ژیان سەرقاڵی وەرزێری و مەڕ و ماڵات بەخێوکردن و بەرهەمهێنانی خورد و خۆراک بوون و تەنیا ئیزنی هاوسەرگیری لەگەڵ یەک ژن، یان یەک پیاویان هەبوو.

لێرەدا تەنیا هەڵبژێردراوەکان ئیمکانی ئەوەیان هەبوو لە پاش مەرگ بچنە بەهەشتی نوێ و گوێگرەکان ئاواتەخواز بوون بەتکاکاریی زامۆرد (میرات) زانست بەدەست بێنن و ببنە هاوڕێی هەڵبژێردراوەکان و لە ئەنجامدا ڕێیان لە بەهەشت بکەوێ.

ڕێبەری مانەوییەکان بەجێگرەوەی مانی ئەژمار دەکراو شوێنی فەرمانڕەواییەکەی لەبابل بوو. پاشان ٥ گروپی دیاریکراو بوونیان هەبوو :

١٢ مامۆستا بەئەدەبیاتی سەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکان (hammozag، ٧٢ ئەسقەف= حاکم(ispasag ، ٣٦٠

ئەرشەد (=بالا دەست wizidag )کە ژنان و هەروەها گوێگرەکانیش کە حەشیمەتی هەرە زۆری ئەم ئایینەی پێکدەهێنا، تیایدا بەشدار بوون. لە نێوان هەڵبژێردراوەکاندا، کۆمەڵێک تاقمی وەک میرزا و جارچی بوونیان هەبوو. هەڵبژێردراوەکان سێ نیشانە لەسەر "زار، دەست و دڵ"یان هەبوو، کە بەنیشانەی (پاراستنی ئەخلاق لە ئاخاوتن، ئەنجامدانی کار و کۆنترۆڵکردنی هەوا و هەوەس) بوون، کە لە مانستان (شوێنی ژیانی مانی)دا دەژیان، جارو باریش سەفەریان دەکرد بۆ ئەوەی ئایینەکەیان لەهەموو قوژبنەکانی جیهاندا بڵاوبکەنەوە. ئەوان تەنیا بە لاق رێگەیان دەبڕی و سواری چوارپێ (گوێدرێژ) نەدەبوون و رۆژی یەک ژەم نانیان دەخوارد، خواردنەکانیشیان هەمووی گژوگیابوو، کە هەمیشە پێش خەوتن دەیانخوارد، سەیر لەوەدا بوو ئەوانە هەمیشە تەنیا بەشی یەک رۆژ خواردنیان پێبوو، بەڵام جلوبەرگی یەک ساڵیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت.

## ئایینەکان

لەئایینی مانەوییەکاندا نوێژخوێندن، نزا و پاڕانەوە، رۆژووگرتن و دانپێدانان بە سووچ و گوناهەکان و تۆبەکردن، بەگرنگترین ئەرک ئەژمار دەکران. هەڵبژێردراوەکان رۆژی حەوت جار، گوێگرەکانیش چوار جار نوێژیان دەکرد. لە رۆژدا بۆ نوێژکردن روویان لە خۆرو لەشەویشدا روویان لەمانگ دەکرد. لە کاتی نوێژکردندا جیا لە یادکردن لە هەر کام لە خواوەندەکان، لە رووناکی، خواوەند، هێز و تێگەیشتنیش دەپاڕانەوە. لەهەر ساڵێکدا پێنج جۆر رۆژوو و هەر جارەی بۆ ماوەی دوو رۆژ بەرۆژوو دەبوون. چوارەمین و پێنجەمین جاری رۆژووگرتن لەدەسپێک و کۆتایی مانگێکی دیاریکراودا بووە (یەکەم و دووەم، بیست و حەوتەم و بیست و هەشتەمی مانگ) و ئەگەری زۆرە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە مانی لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا ئازارێکی زۆری لە نێو زینداندا چێشت و پاشان لەنێو زیندانیشدا مرد. لەرۆژی ۳۰ی ئەم مانگەدا جێژنی بەما یان تەخت بەڕێوە دەچوو. لەم

جێژنەدا کە بەگرنگترین ڕووداوی ساڵ ئەژمار دەکرا، کورسییەکی بەرزیان دەهێنایە بەردەمی خەڵکەکە و وێنەیەکی مانیی پێغەمبەریان لەسەر دادەنا کە ئاماژەی بەرۆیشتنی ڕۆحی مانی بۆ بەهەشتی نوێ دەکرد.

## بەرهەمی مانەوییەکان

بەرهەمی سەرەکیی مانەوییەکان، حەوت بەرهەمە و سەرچەمیان بەرهەمی مانی بوون، بە زمانی ئارامی (زمانی ناوچەیی مانی) نووسراوبوون:

١. ئینجیلی زیندوو.
٢. گەنجینەی ژیان.
٣. نامیلکەکان.
٤. نهێنییەکان.
٥. دێوەکان.
٦. نامەکان.
٧. نزا و پاڕانەوەکان.

سەرەڕای ئەمانە، مانی کتێبێکیدیکەی بە زمانی فارسی لەژێر ناوی شاپوورگان هەبوو، کە کۆکراوەیەک لە بیروباوەڕی خۆی بۆ شاپووری کوڕی ئەردەشیری ساسانییەکان نووسیبوو. کتێبێکیدیکەشی بەناوی ناوی ئاردهەنگ کە بەئەرتەنگ و ئەرژەنگ دەخوێندرێتەوە، هەبوو کە کۆمەڵێک وێنەی لەسەر جیهانی مانەوی و ڕاڤەکردنی جیهانی مانەوییەکان تێدا بوو، هەروەها کتێبێکیدیکەیشی لەژێر ناوی کفالایا، یان گوتاربێژییەکان لەپاش بەجێما، کە کۆکراوەی وتەکانی مانی و کۆمەڵێک پێشبینیی ناوبراوی لەخۆگرتووە.

لە دەقی ئەو کتێبە ئارامییانەی کە دۆزراونەتەوە، باسێک لەتوورفان (نووسراوە بەنرخەکانی مانی) نەکراوە.

## بەشی حەوتەم

### ئایینی مەزدەك

ئایینی مەزدەک بزافێکی زەردەشتی - گنووسیە و لایەنگری لەوەرچەرخانی قووڵی کۆمەڵایەتی دەکات. ئەم ئایینە، لە سەردەمی قوبادی ساسانی (٥٣١ - ٤٨٨ زایینی) پەرەیسەند و کۆمەڵێک سەرهەڵدان و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیی لەوڵاتی ئێراندا پێکهێنا، هەرچەندە بەتوندی سەرکوتکرا، بەڵام ئاسەواری یەکجار قووڵی لەپاش خۆی بەجێهشت، تەنانەت دەکرێ بڵێین رووخانی دەوڵەتی ساسانییەکان، بەرئەنجامی سەرهەڵدان و بزافی مەزدەکی لە ئێراندا بوو.

سەرەڕای ئەو هەموو لێکۆڵینەوەیەی لەسەر ئایینی مەزدەک کراون، بەهۆی نەبوونی بەڵگە لەسەر مەزدەکییەکان، هەتا ئێستا کۆمەڵێک لایەنی ئایینی مەزدەکی بەشاراوەیی ماونەتەوە. ئەگەری زۆرە نەبوونی بەڵگە لەسەر مەزدەکییەکان، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە زۆرینەی خەڵکی لایەنگری ئەم ئایینە وەرزێر و شوانەوێڵەی رەمەکی و دەشتەکیی گوندەکان بوون و تەنیا چەند خوێندەوارێکیان لەنێودا بووبێت. هەروەها ئەو نووسراوانەی کە لەسەر مەزدەکییەکان بوونیان هەبوو، سەرجەمیان لە سەردەمی ساسانییەکاندا هاوڕێ لەگەڵ مەزدەک و پەیڕەوانی، لەناوچوون.

زانیاری و بەڵگەکانی ئەو سەردەمە، تەنیا لەسەر دژبەرانی ئەم ئایینە لەبەردەستدا هەن. ئەم زانیارییانە لەنێو دەقە پەهلەوییەکانی کۆتایی سەردەمی ساسانییەکان و سەرەتای ئیسلام، بەڵگە سریانی، یۆنانی (بیزانسی) و ئیسلامییەکان، دەرهێندراون.

سەرجەمی ئەو بەڵگانە، نیشانەی تێڕوانینی فەرمیی دەوڵەتی ساسانییەکانن و نزیکەی زۆربەیان یەکلایەنە نووسراون. بەڵگە ئیسلامییەکان، ئاماژە بە دەق و زمانەکانی عارەبی و فارسی دەکەن، بەگشتی بەرهەمەکانی شەهرستانی، ئیبنو نەدیم و فیردەوسی، زانیاریی

بەکەڵک و تۆکمە لەسەر ئایینی مەزدەکی دەخەنەڕوو. هەروەها لە سیاسەتنامەی نیزامولمولک و لە گێڕانەوەکانی داراب هۆرمەزدیاریشدا ئاماژە بەئەم ئایینە کراوە، کە پێدەچی بە پشتبەستن بە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوتر لە مەزدەک نامک* بوو بێت. پێدەچێت ئەم کتێبە بەشێوەی هەقایەت و چیرۆک بۆ دژایەتیکردنی مەزدەک و ئایینەکەی لە سەردەمی ساسانییەکاندا نووسرابێت.

سەرچاوە ئیسلامییەکان باس لە زەردەشت ناوێک دەکەن کە رۆحانیی شاری "فەسا"ی سەربە ئوستانی شیراز بووە. بەپێی ئەم سەرچاوانە، ئەو رۆحانییە کە بە زەردەشت خۆرگان ناودێر کرابوو، ئایینێکی بنیاتناوە کە پێدەچی لە سەرەتادا بەئایینی زەردەشتگان بەناوبانگ بووبێت، بەلام سەردەمی ژیانی ئەم زەردەشتە روون نییە.

سەرچاوە یۆنانییەکان باس لە کەسێک بەناوی بوندوس دەکەن کە بانگەشەی بۆ ئەم ئایینە کردووەو وەک دەگێڕنەوە بوندوس لە بنەڕەتدا مانەوی بووە، بەلام ئایینێکی نوێی داهێناوەو پاشان لە رۆمەوە بەرەو ئێران رۆیشتووەو بانگەشەی بۆ دریست دینان* واتە دینەکەی خۆی کردووە. قوباد رووی لە ئایینەکەی کرد و ئایینی دریستی قەبوڵ کرد.

بەپێی ئەم دوو چیرۆکە، رەنگە بێینە سەر ئەو باوەڕەی وەها ئایینێک بەر لە مەزدەک لە ئارادابووبێت و پاشان بەهۆی ناسەقامگیریی وڵاتی ئێران لە سەردەمی قوباد و فیرۆز و هەروەها بەهۆی چالاکییەکانی مەزدەکەوە، ئەو ئایینە خەڵکێکی زۆری لە سەردەمی قوبادا لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوەو بەمەزدەک ناودێر کراوەو شێوەی ئایینێکی سەربەخۆی بەخۆوە گرتووە.

ئیبنو نەدیم باس لە مەزدەکولقەدیم (مەزدەکی دێرین) و مەزدەکولئاخر (دوایین مەزدەک) دەکات و ئەم ئایینە کە بناغەی ئایینی مەزدەکی و خوڕەمی بووە، بە تاقمێکی زەردەشتی لە قەڵەم ئەدات. ئەو لەو باوەڕەدایە

مەزدەکولقـەدیم لایـەنگری ژیـان و خۆشـگوزەرانی، یەکسـانی، پێکـەوەژیانی برایانە، ژن و سامان بووە. مەزدەکولئاخر هەر ئەو کەسەبوو کەلە سـەردەمی قوباددا خۆی نواندو بە دەستی خوسرەو ئەنەوشیروان کوژرا.

وەک دیارە مەزدەکییـەکان باوەڕیـان بـە نـاوەڕۆکی دەقـە ئاڤێسـتاییەکان بـووە. چـوونی مـەزدەک بـۆ دیووەخـانی پاشـاو دەسترۆشـتوویی ئـەو لـە دیوەخانی پاشا، سەلمێنەری ئەوەیە کە مەزدەک سیماو ڕواڵەتی ڕۆحانییەکی زەردەشتیی هەبووەو پێدەچی لایەنگری ئەم ئایینە بووبێت، چونکە ئەو وەک لایـەنگر، یـان پـەیڕەوێکی ئـایینی مانـەوی، نەیـدەتوانی لـە ریـزی ڕۆحانییـە زەردەشتییەکاندا، سەر لە دیوەخانی پاشا دەربێنێ.

هاوکات مەزدەکییەکان لە بیر و بـاوەڕی گنووسـیش بـێ بـەهرە نـەبوون، ئەگەر دەگوترێ کە کاریگەریی ئـەم ئایینـەیان لەسـەر بـووە، بوختـان نییـە. کەوابوو دەتوانین باوەڕ بکەین کە سەرچاوەی ئـایینی مەزدەکییـەکان ئـایینی زەردەشتی بووەو تێگەیشتن و جیهانبینیی گنووسیشیان بۆ جیهـان هـەبووە. چێژ وەرگرتن لە ژیـان یـان ئـازار کێشـان لـە پێنـاو مەزدەکـدا، هـەردووکیان ڕێچکە و ڕۆحێکی گنووسی بوون. دووفاقـەیی مـەزدەک لـە ڕواڵەتـدا شـێوەی دووفاقـەیی زەردەشـت ئـەدات، بـەڵام مەسـەلەی رزگـارکردنی ڕۆح لەدەسـتی مادە، بابەتەکە لە دووفاقەیی گنووسییەکان نزیکتر دەکاتەوە، ڕێگریکردن لـە خوێنڕشتن و کۆمـەڵێک بـەهای ئـەخلاقی و کۆمەڵایـەتی، سیمای ئـەخلاقیی گنووسی / مانەوی، دەڕازێنێتەوە.

ئایینی مەزدەکی، لە ناوەڕۆک و کردەوەدا، لە زەردەشتییەکانی سەردەمی ساسانییەکان و ئایینی مانەوی و نەریت و بیروبـاوەڕی خـەڵکی دەشـتەکی و گوندنشینی ئێران تێکهەڵکێش کراوە.

## بیر و باوەڕی مەزدەکی

مەزدەکییەکانیش هاوشێوەی زەردەشتییەکان، زۆروانی و مانەوییەکان، هەروەها وێکچووی پەیڕەوانی بیروباوەڕی گنووسیی باو لە ئێران، ئاسیای رۆژئاوا و ئیمپەراتۆرییەتی رۆم لەو سەردەمەدا، باوەڕیان بەدوو ئەسڵی بنچینەیی هەبوو. ئەم دوو ئەسڵە تاریکی و روناکی بوون. روناکی زانست و تێگەیشتنی لەگەڵ خۆیدا دێنا و هەموو کەسیش ئازادبوو کە چۆن و بە چ شێوەیەک هەڵسوکەت بکات. تاریکیش هێمای نەزانی و ناتێگەیشتوویی و هەڵسوکەت و کردەوەکانیش لەو ئەسڵەدا بەرێکەوت و بێ ئامانجن. رووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو ئەسڵە لەگەڵ یەکتر بەرێکەوت بووەو بە قەولی شەهرستانی، جیابوونەوەی ئەم دوو ئەسڵە لەیەکتر بەرێکەوت دەبێت.

بەهۆی بەرەوڕووبوونەوەی ئەم دوانە لەگەڵ یەکتر، مودەبیرولخێر و مودەبیرولشەڕ بەوجوود هاتن. خواوەندی مەزن لەسەر تەختی ئەم جیهانە بەرینە دانیشتووە، بەهەمان شێوە کە فەرمانڕەواکانی سەر زەوی لەسەر تەخت دانیشتوون. لێرەدا بەرەوڕووی سێ قاقەیی گاتایی، یان زۆروانی دەبینەوە، کە خواوەندی مەزن لەسەرەوەیەو مودەبیر ( زانا و بەتەگبیر) لەتەنیشت ئەو داندراون :

خواوەندی مەزن

مودەبیرولشەڕ

مودەبیرولخێر

چوار هێزی "جیاکردنەوە، تێگەیشتن، پاراستن و مەزنایەتی" بەرەوڕووی خواوەندی مەزن راوەستاون : بە هەمان شێوە کە گۆیا چوار مووبد (رۆحانیی زەردەشت)ی، هیربدانی هیربد، سپاهبد و رامشگر، لە بەرانبەر پاشادا راوەستابن.

ئەم چوار هێزە بە یارمەتیی حەوت وەزیر، فەرمانڕەوایی جیهان دەکەن، کە ئەمانەش لە دوازدە هێـزی ڕۆحانی فەرمان وەر ئەگرن.

مەزدەکییەکان باوەڕیان بە سێ توخمی ئاو، ئاگر و خاک هەیە.

کاتێک چـوار هێـز، حـەوت وەزیـرو دوازدە هێـزی ڕۆحـانی لەکەسـێکدا یەکـدەگرن، ئـەو کەسـە بـەرەو یـەزدان هەڵـدەزنێ و ڕاپەڕانـدنی ئەرکـە ئایینییەکانی لەسەر شان نامێنێ.

لەم گەلاڵەیەدا، ڕۆڵی ژمارەکان ـ سێ، چوار، حەوت و دوازدە ـ بەڕوونی بەرچاو دەکەوێ، کەلە ئـەنجامی کۆکردن (+)، لێکدانی ژمارەکـانی سـێ و چوار، دوو ژمارەی حەوت و دوازدە دەرئەچن.

خواوەندی مەزن بەیارمەتیی وشـە و پیتـەکان، فـەرمانڕەوایی دەکـات کـە هەموو ئەمانە لە ناوەکەیدا کۆبۆتەوە. ئەوانە کاتێک شارەزای لایەنی نهێنی و شـاراوەی پیـت و وشـەکان بـن و لـەو ڕێگەیـەوە پـەڕجووی نـاوی خواوەنـد بەدەست دێـنن و لەئەنجامـدا دەسـتیان بەسـیرولئەکبەر(نێهێنییـە گەورەکـە) ڕادەگات، ئەگەریش ئەم ئاگاییـە بەدەسـتنەهێنن لەنەزانیـدا دەمێننـەوە. لـە نووسـراوەی مێژوونووسـاندا، بابـەتێک لەسـەر مـادەو جیهـان مینـوو بـەرچاو ناکـەوێت و لـەو پەیوەندییەشـدا زانیارییـەک لەبـەر دەسـتدا نییـە. هـەروەها سـەبارەت بـەکۆتایی جیهـان و لەسـەر ئـەرکی خێـر و شـەڕ، بەڵگەیـەک لەبەردەستدا نییە.

بۆچوونەکەی شەهرستانی سەبارەت بـە لێکجیابوونـەوەی بەرێکـەوتی دوو ئەسڵ لەکۆتایی هەر حاڵەتێکی دەستتێکەڵکردنی جنسیدا، بابەتێکی جێگەی باس و لێوردبوونەوەیە، هەر چەندە ئەم ڕوانگەیە بنەمایەکی عەقڵانیی نییـە. چونکە لـەنێوان مەزدەکییـەکان و پـەیڕەوان و شـوێنکەوتووەکانی سـەردەمی ئیسلامدا، جۆرێک دوایین بانگەشەی ڕزگـارکردنی ئینسـان لەدەسـتی شـەڕ و ناپاکی لەئارادابووەو لەو ماوەیەدا، ڕۆح لەڕێگەی ئەستێرەکانەوەو مانگیش لە ڕێگەی خۆرەوە ڕزگاریان بووە. پێدەچێ ئەو لێکجیابوونەوەیەی کـە باسـکرا، پەیوەندیی بەڕزگاریی ڕۆح لـە یەخسـیری و ژێردەسـتیی مـادەوە هـەبێت کـە

پەیوەندیی بەرووداوەکان و رەوتی ژیانی تاکەکانەوە هەیەو ملکەچی هیچ بڕیارێکش نییە. ئەگەر کاری چاکە و شیاویان ئەنجامدابێ، دەچینە بەهەشت، ئەگەریش تووشی سووچ و گوناه بووبن، لەجیهانی مادی و لەیەخسیریی رۆحدا دەمێننەوە.

هەبوونی خواوەندی مەزن، کە خۆی لە کاروباری جیهان ناداو خۆی لەهەموو رووداوەکانی جیهان بەدوور گرتووە، روانگەیەکی گنووسی دەخاتەڕوو. هەروەها پیرۆزیی وشە، پیت و ژمارە و نهێنی و شاراوەبوونیان، واتایەکی گنووسیی هەیە. تەنانەت ئەرکداربوون بەراپەڕاندنی کاروباری ئایینی بۆ زەفەربردن بە نهێنییە شاراوەکانیش، بەشێک لە ئایینی گنووسییە.

بەڵام لە بواری کۆمەڵایەتیدا، مەزدەکیەکان لەو باوەڕەدابوون کە خواوەند بە شێوەیەک رزق و رۆزیی لەسەر زەوی دروستکردووە کە هەموو خەڵک بتوانن بەپێی پێویستیی خۆیان کەڵکی لێوەربگرن و هیچ کەسیش بێبەش نەمێنێتەوە، بەڵام بەهۆی، زوڵمی تاک لە تاکێکی دیکە، ئەم بارودۆخە گۆڕدراوەو لە ئەنجامدا دوو چینی تێر (دەوڵەمەند) و برسی (هەژار) لەنێو کۆمەڵگەدا پەرەیانگرت. ئەم نابەرابەری و نایەکسانییە، دەبوو لەناو بچێت و هەوڵدان بۆ نەهێشتنیشی، بەخۆپارێزی و خواپەرستی دادەنرا. پێدەچێ مەزدەک خوازیاری بەشکردنی ژنانیش بووبێت، هاوکات خاڵێکی جێگەی سەرنجیش ئەوەیە کەلە نووسراوەکانی مەزدەکدا هیچ باسێکی سیستەمی کۆیلایەتی نەکراوە، بەڵام بناغەی ئەم دوو روانگە کۆمەڵایەتییەی مەزدەک چ بووە؟

هەبوونی ئەم روانگەیە لەوڵاتی ئێراندا پێشینەیەکی دوورودرێژی هەیە، تەنانەت باس لەوە دەکرێ کە زوحاک خوازیاری بەشکردنی ژن و ماڵ بووە. دروشمی دابەشکردنی زەوی و زار بە سەر هەموو خەڵک، لەمیزۆپۆتامیای دێریندا، لەسەردەمی شارستانییەتی سۆمەرییەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت،

تەنانـەت بەڵگـەش لەبەردەسـتدایە، کـە جوتیارەکـان لـەو سـەردەمەدا بـۆ خاوەنـدارێتیی گشـتیی زەوی و زار و سـامانەکانی خواوەنـدی شـاری ئـەو سـەردەمە، راپـەڕیون. لەراپـەڕینی بـەردیای درۆیـین (گێئۆماتـە)شـدا بـۆ گەڕاندنـەوەی زەوی و زارەکـان بـۆ خاوەنـە راسـتەقینەکانیان، بـەرەوڕووی خاوەنە نوێیەکانیان دەبینەوە.

بەهـەر شـێوەیەک بووبێـت، دروشـمی دابەشـکردنی زەوی و بەرابـەریی دارایی، لەنێو گوندنشینە ئێرانییەکاندا هەتا سەردەمی هێرشی مەغۆلەکان لە ئارادا بووە. ئەگەری زۆرە کـە ئـەوان خوازیـاری گشـتگیربوونی ئـەم داوایـەی خۆیـان لەناوچەکانیدیکەشـدا بـووبن، بـەڵام پرسـی ژن، کـە بـەو شـێوەیە باسـکراوە، جێگـەی پرسـیارە، کـە ئایـا مەبەسـت لـە دابەشـکردنی ژنـان دیوەخـانی دەوڵەمەنـدەکان بـووە؟ بـەم پێیـە نـەدەکرا هـەزاران ژن لـەنێوان ملیۆنان خەڵکدا دابەش بکرێت. کەوابوو ئەمە پێشنیارێکی عەقڵانی نییە.

لەلایەکی دیکەوە، ئێمە زانیاریی پێویستمان لەسـەر رێوڕەسـمی سـاڵانەو سـەرەتاییەکان، هـەروەها خـۆش رابـواردنی ئـاییني و مەزهـەبیی خـەڵکی دەشتەکی و گوندنشینی ئێرانی لەو سەردەمەوە هـەتا ئێسـتا هەیـە، کـە زۆر جار یاسا و بڕیـاری کۆمەڵایـەتی بـۆ ماوەیـەکی زەمـەنیی کـورت هەڵـدەگیراو پەیوەندیی ئازادانەی نێو رەگەزە جیاوازەکان لەگوندێک، یان بەشێکی شـاردا دروست دەبوو.

هەتا رادەیەکی زۆر ئاگاداری ئـەم جـۆرە پەیوەندییانـە لـە نێـوان خـۆڕەم دینـان و هینـدێک تـاقمی دینـی - مەزهـەبیی سـەردەمی ئیسـلامیداین، کـە سەرچاوەکەی مەزدەکی بووە.

زۆر کەس نکوڵی لەهەبوونی ئەم پەیوەندییانە لەنێو خۆڕەمدینانیدا دەکەن و ئەمـەش بـە تۆمـەتێکی دوژمنـان دەزانـن، لەحاڵێکـدا کـە رێـوڕەسـمی

خۆشڕابواردنی دینی - مەزهەبی لەمەودای زەمەنییەکی تایبەت و دیاریکراودا، بە پێچەوانەی هاوسەرگیری و داوێن پاکیی بنەماڵە، لەو ماوە زەمەنییەی پەیوەندیی نێوان خورەمدینیاندا بووە.

کەوابوو، ئەگەری زۆرە دروشمی کۆمەڵایەتیی مەزدەکیان پەیوەندی بەپێکهاتە و بیروباوەڕی کۆمەڵگەی گوندنشین و ڕەمەکییەوە بێت. واتە دروشمی بەرابەری و دادگەریی مەزدەکی، دەبێتە دروشمی بەرابەری دارایی و هەروەها ئازادیی بەڕێوەبردنی دابونەریتی زەردەشتییەکان، یان کۆمەڵگەی گوندنشین، تیایدا ڕەنگدانەوەی هەبووە.

پاش هاتنی ئیسلام، درێژەی ئایینی مەزدەکی زیاتر لەهەموو ئایینەکان لەنێو خورەمدینیاندا بەرچاوبووە. کۆبەندی بیروباوەڕەکانیان بە کورتی بەم شێوەیەیە :

١. لە دەسپێکدا، دوو ئەسڵی ڕووناکی و تاریکی بوونیان هەبوو. تاریککردنی ڕووناکی و لە ناو بردنی ڕووناکی بوو.

٢. خواوەندی مەزن ڕێکخەری کاروباری جیهان نییە.

٣. سەرهەڵدان و ئاشکرابوونی پێغەمبەران، حۆری و فریشتەکان سەرجەمیان لە ناوەڕۆکدا یەک سەرچاوەیان هەیە.

٤. خۆحەشاردان و گەڕانەوەی ئیمامانی ئایینی ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

٥. سروشی غەیبی تەنیا پەیوەندیی بە پێغەمبەرێکی تایبەتەوە نییەو لە سەردەمە جیاجیاکاندا بەردەوام دەبێ.

٦. باوەڕمەندی بەهەبوونی ئیمام، بە واتای ئایین لەقەڵەم ئەدرێت.

٧. باوەڕمەندی بەواتای ناوەڕۆکی کتێبە ئاسمانییەکان، نەوەک واتای ڕواڵەتییەکانیان.

٨. ئەبوو موسلیم وێناکردنی ڕۆحی ئاسمانەکانەو مردنیشی نییە.

٩. زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوەی دوای مەرگ بوونی نییە.

١٠. زیندووبوونەوە واتایەکی دەروونیی هەیە، کە هەمان وێناکردنی ڕۆح لە ئاسمانەکانە.

١١. ئەشێ خۆ لەخوێنڕشتن لا بدەیت، مەگەر بە ناچاری و لە کاتی ڕاپەڕیندا.

١٢. پێویستە بۆچوون و ڕوانگەی ئایینی خەڵک قەبووڵ بکەیت، هەتا ئەو شوێنەی کە زەبر وەبەر بیروباوەڕی خۆت نەکەوێ.

١٣. حورمەتگرتن و میوانداریەتی، ئەرکی هەموانە.

١٤. خۆش ڕابواردن ئازادە هەتا ئەوکاتەی زیانی بۆ خەڵک نەبێت.

١٥. پێویستە پاک و خاوێنی بپارێزرێت.

١٦. خواردنەوەی شەراب و خواردنی نان لە ڕێوڕەسمەکان، بەتایبەت لە ڕێورەسمی هاوسەرگیریدا، ئازادە.

سەرچاوەیەکی دیکەی ئیسلامی کە لە ناسینی بیروباوەڕی مەزدەکیاندا ڕۆڵی هەیە، باوەڕە دەروونییەکانن.

لەنێو باوەڕە دەروونییەکاندا، هیچ زانیارییەک لەسەر بناغەداڕێژ، یان سەبارەت بە دەسپێکی ئەو ڕێبازە بوونی نییە، هەروەها لە دەسپێکی ئەو ڕێبازەشدا هیچ نیشانەیەک لە بیروباوڕی ئیسلامی لەنێو لایەنگرانی ئەم ڕێبازەدا نابینرێت. ئەمڕۆکە زۆر کەس لەو باوەڕەدان کە بنیاتی باوەڕە دەروونییەکان بۆ سەردەمی پێش ئیسلام لە ئاسیای ڕۆژئاواو باشووری ڕۆژهەڵات دەگەڕێتەوە. هەرچەند وردەکارییەکانی ئەم بۆچوونە زۆر ڕوون نییە، بەڵام دەتوانین بڵێین بیروباوڕی زۆر پێشتر ڕۆڵیان لە دروستبوونی بیروباوەڕی دەروونیدا هەبووەو بیر و باوەڕێکی تێکەڵکراوی گنووسی ئێرانی، سریانی و بابلییان دروستکردووە، بەڵام کاریگەریی قووڵی بیروباوڕی خوڕەم دینان بەسەر لایەنگرانی ئەو ڕێباز و بیروباوەڕە دەروونییەوە دیارە. ڕوون و ئاشکرایە کە بیروباوڕی خوڕەم دینی پاشکۆی ڕوانگەی مەزدەکییە.

دەکرێ بیروباوەڕە دەروونییەکان بەم شێوەیە لێک بدەینەوە :

١. باوەڕهینـان بـە خواوەنـدێک کـە لەگـەڵ توانـای تێگەیشـتنی ئێمـەدا ناگونجێت.

٢. باوەڕهێنـــان بـــە دوو خواوەنـــدی ئافرێنـــەر کـــە لەنێوانیانـــدا رووبەڕووبوونەوەو شەڕ لەئارادایە.

٣. جیهانی گەورە و بچووک، وێکچووی یەکترن.

٤. لێکدانەوە و راڤەی پیت و وشـەکان، هـەروەها نهێنییـەکانی ئـایین بـۆ کەسی ئیماندار روون دەکاتەوە.

٥. تێگەیشتنی دەروونی گەوهەرهی ئایینە، تاکە رێگەی رزگارییە.

٦. لایەنگرانی رێبـازی دەروونـی، باوەڕیـان بـە هاتنـە خـوارەوەی پێخـەم (پەیامی ئاسمانیی یەزدان واتە وەحی) و زیندووبوونەوەی پاش مەرگ بووە، واتە کاتێک سەرجەم رۆحـەکان لـە گونـاه پـاک بوونەتـەوە، جیهـان کۆتـایی پێهـاتووە. بـەم شـێوەیە، دەتـوانین بڵێـین لـە سـەدەی پێنجـەمی زایینیـدا زەردەشت خۆرگان، کـە رۆحـانیی پەرسـتگەکانی شـاری فەسـا لـە ئوسـتانی شیراز بوو، لە ئایینی زەردەشتیدا کۆمەڵێک داهێنانی کردو رایگەیاند: ئەشێ لێکدانەوەیـەکی نـوێ لـە ئاڤێسـتا بکـرێ. رەنگـە ئـەمیش درێـژەی کارەکـانی بوندوسـی گرتبێتەبەر، کە پێشتر لە وڵاتـی رۆم بانگەشـەی بـۆ کردبـوو، کـە بیروباوەڕەکەی بنیاتێکی گنووسیی هەبوو. بیروباوەڕی ئەم زەردەشتـــە بـۆن و بەرامەی گنووسی پێوە بوو، کە لەو سـەردەمەدا لـە رۆمـەوە هـەتا ئێرانـی خسـتبووە ژێـر رکێفـی خـۆی، هەرچەنـد لـە رۆژئـاوا لـە بەرانبـەر ئـایینی مەسـیحیدا پاشەکشـەی دەکـردو لـە رۆژهــەڵات بـەرەورووی هەڵسـوکەوتی توندوتیژی دەوڵەتی ساسانی بووەوە.

پێدەچی ئەم زەردەشتە، پێی وابووبێت خواوەندێکی دوورەدەست بوونی هەیە، کە کاری ئافراندن و بەڕێوەبردنی جیهانی بە دوو ئافرینەریدیکە سپاردووە. ئەو دوو ئافرێنەرە دوژمن و دژبەری یەکتری بوون. لە ناخی ئینسانیشدا رۆحێک هەبوو کە پەیوەندی بە خواوەندەوە هەبووە و بە ئاواتی جێهێشتنی ئەم جیهانە پڕ لە ناحەزی و خراپەکارییە و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی نوور و راستییەکانەوە بووە. رۆحی ئینسان بۆ ئەم گەڕانەوەیە پێویستی بە زانستی خۆرزگار کردن هەبوو، کە ئەو زانستەش تەنیا لەدەستی پێغەمبەر و ئیمامەکاندا بووەو بۆخۆیان وێنای ئینسانیی خواوەند بوون و بۆ هەتا هەتایە لەسەر جیهان دەمێننەوە، ئەم وێناکردنانە چەندین قۆناغی حەوت لایەنەیەی هەبووە.

بە پێی ئەم جۆرە بیرکردنەوانە، ئینسان هەر لەسەر ئەم جیهانە پاداشت دەکرێ و سزا ئەدرێ و لە دایکبوون و مردن رێگەی رزگاریی رۆحە هەتا لە ناپاکی بشۆرێتەوەو بەرەو جیهانی رووناکی بگەڕێتەوە.

لە رەهەندی ئەخلاقییەوە، پەیڕەوانی ئەم ئایینە لایەنگری ئاشتی و تەبایی و عەدالەت بوون و لەو باوەڕەدا بوون هۆکاری چەوساندنەوەی ئینسان، کە هەڵاواردن و جیاوازی دانان بوو، دەبوا لەناو بچێت. هەڵاواردنێک کە بەهۆی فێڵ و تەڵەکەی دێوەکانەوە خویا بووەو ئەشێ هەموو مەخلوقات لە بەرانبەریدا یەکڕیز و یەکگرتوو بن.

ئەگەری زۆرە ئەم بیروباوەڕە هەتا سەردەمی قوباد درێژەی بووبێت و لەبەر ناسەقامگیریی سیاسی و نیزامییەوە، کە لە چاخی فیرۆزەوە دەستی پێکردبوو، دەوڵەتی بەرەو لاوازی بردبێت. ئەم ئایینە لەلایەن مەزدەکەوە بڵاو بووەوەو بەهێزبوو.

سەرەنجام دوابەدوای هێوربوونەوەی دۆخەکەو بەهێزبوونی خوسرەوی ئەنەوشیروان، گوشار بۆسەر مەزدەکیان رووی لە زیادبوون کردو کوشتنی مەزدەک و پەیڕەوان و کەسانی نزیک بە مەزدەکی لێکەوتەوەو لە گوندەکانیش شۆڕشی مەزدەکی سەری هەڵداو تێکیان شکاندن.

بیروباوەڕی مەزدەکی بەتایبەت لەنێو هەژار و دەستکورتی گوندەکانو هەتا رادەیەکیش لە شارەکاندا رەگی داکوتابوو، کە لە سەردەمی ئیسلامدا بەشکڵێکی نوێوە خۆی نواندەوە. لەهەر قۆناغێکی ئیسلامدا بە شکڵێکی جیاوازترەوە خۆی دەنواند.

# بەشی هەشتەم

## ئایینی مەسیحی لەئێــران

لە سەدەی یەکەمی زایینییەوە، شوێنپێی هیندێک بازرگان و ئۆسقۆفە مەسیحییەکان لەشارەکانی تیسفوون، شووش و فارس دەبیندرێ. زۆرێک لەو مەسیحییانە ناویان جووانەبووە، ئەمەش دەریدەخات کە ئەوانە ئایینی خۆیان لە جووەوە بۆ مەسیحییەت گۆڕیبێت.

لەسەدەی دووەمی زایینیدا، کە هاوکات بوو لەگەڵ فەرمانڕەوایی ئەشکانییەکان، رێکخراوە مەسیحییەکان لە ئێران دامەزران، کە بریتی بوون لە : ئازادیی ئایین، بەتایبەت لە شارو گوندەکان، ئایینی مەسیحیش هەروەک ئایینەکانی دیکە لە ئێران رەگاژۆی کرد، بەشێوەیەک لە ساڵی ٢٠٠ی زایینی بەملاوە، هاوکات لەگەڵ کۆتایی فەرمانڕەوایی ئەشکانییەکان، ئایینی مەسیحییەت لە ئێراندا پەرەی گرت. یەکێک لە نیشانەکانی پەرەگرتنی ئایینی مەسیحییەت لە ئێران، کاریگەرییەکانی ئایینی مانەوییەت لەسەر مەسیحییەت بوو. یەکێک لە خواوەندەکانی رزگاریدەری مانەوی، ناوی عیسای نوورانی بوو. نزا مانەوییەکان لەژێر کاریگەریی ئایینی مەسیحی دایە. زەبووری مانەوی بەیەکێک لە بەرهەمە ئەدەبی ـ ئایینییەکانی مانەوییەت دادەندرێت، تەنانەت مانی بۆخۆی ئینجیلێکی تایبەتیی بەناوی ئینجیلی زیندوو هەبووە، کە ئێستاش چەند بەشێکی لێماوەتەوە. ئاسەواری قەبرستانە مەسیحییەکان لە دوورگەی خارک* ماوەتەوە، کە ١٥٠ قەبرێک دەبن، ئەم قەبرانەش بۆیە لەوێن، چونکە دوورگەی خارک ناوەندێکی بازرگانیی گرنگی ئەو سەردەمە بووە. مێژووی کەنیسە و ئاسەواری مەسیحییەکان لە دوورگەی خارک، بۆ ساڵی ٢٥٠ی زایینی دەگەڕێتەوە. لە دەوروبەری ساڵی ٢٢٨ی زایین، کرتیر لە بەردەنووسەکانی زەردەشتیدا باس لە مەسیحییەکان دەکات و کوشتنی مەسیحییەکان ئاشکرا دەکات. لەم بەردەنووسانەدا وشەی = "n, cl, y" ناسری و = "klystyd, n"

کریستیان بۆ ناوهێنان و ئامـاژەکردن بە مەسیحییەکان بەکار هاتووە. پێدەچی ناسرییەکان تاقمی ڕۆژهەڵاتی مەسیحییەت (باکووری میزۆپۆتامیا)و مەسیحییە خۆجێیەکانی شاهەنشایی میزۆپۆتامیا بوون. سەبارەت بە کریستیانەکان دەوترێ کە زیاتر بۆ هۆی کۆچکردنەوە لە یۆنانەوە بەرەو ئێران ڕۆیشتوون. ئەوانە تاقمێکی مەسیحیی یۆنانیی زمان بوون کە دوابەدوای داگیرکارییەکانی شاپووری یەکەم لەڕۆژئاوای ئاسیا، ئەنتاکیە و ئاسیای بچووکدا بەدیل گیرابوون.

تاقمێکیدیکەی مسیحییەکان لە ئێران لەدەقە پەهلەوییەکاندا بە anşarîg (ناخۆجێی) ناویانهاتووە. هەڵبەت ئەم دەستەواژەیە بۆ هەموو دیل و کۆیلەکان بەکار براوە. دووبەرەکی لەنێوان ئەم دوو تاقمە خۆجێی و مەسیحییەی نیشتەجێی وڵاتی ئێراندا هاتە ئاراوە، بۆ نمونە لە ریواردشیر / ری ئەردەشیر (= بوشێهر) دوو کەنیسەی ناسری و کریستیانی لێبوو. لەشاری شووش گرژی لەنێو ئەم دوو تاقمەدا دروستبوو. دوومناش، ئێرانناسی بەناوبانگی فەرەنسی دەڵێ کریستیانەکان پێدەچێ پەیڕەوییان لە مەرقیوون داهێنەر و بنیاتنەری گنووسی،کردبێت. بەمەسیحیی تاقمەکانی دیکەش "Noseay ، Mîşîha یان Meşîhaya وتراوە.

لەکۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی مەسیحیدا، تاقمەکانی کریستیانی و ناسری هەوڵئەدەن یەکگرتوو بن و ئێران بەسەر ناوچە ئۆسقۆفنیشینەکاندا* دابەش بکەن.

لە دەوروبەری ساڵی ٣٠٠ی زایینیدا، زۆرێک لە گروپە مەسیحییەکانی ئێران یەکیانگرت و خەڵکیدیکەش دژایەتییان دەکردن، بەڵام ئەم یەکگرتوویە سەرتاسەری ئێران دەگرێتەوە. لە ساڵی ٤١٠ی زایینی، سەرجەم کەنیسەکان یەکدەگرن، کە ڕێبەرەکەیان ناوی "ra şa" (رەئس، سەر) ، واتە ڕێبەری سەرجەم مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات بووە.

لە ئەدەبیاتی مەسیحییەکاندا، چەند دەقێکی پەهلەوی و سۆغدی ماوەتەوە. زەبووری مەسیحی بە زمانی پەهلەوی نووسراوەو سۆغدییەکانیش

بەرهەمی مەسیحییان لە پاش خۆیان بەجێهێشتووە. لەساڵی ٤١٠ی زایینیدا، کەنیسەی ئەسقەفنیشینی ئێران بەسەر شەش بەشی ئۆسقۆفنیشیندا، دابەش دەبن: تیسفوون، خووزستان، نسیبین، میشان، ئەدیابن (ئەربل) و بەیت سەلووک*. لە ساڵی ٤٢٤ی زایینیدا، ئۆسقۆفەکانی شاری فارس، رەی و ئەبەرشار (نەیشابوور) لە شۆرای کەنیسەییەدا بەشدار دەبن و لەم کاتە بەدواوە کەنیسەی رۆژهەڵات سەربەخۆیی بەدەستهێنا.

لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی زایینیدا، مەرڤ، هەرات و ناوچەکانیدیکەی خۆراسان و بەحرەین بەشێک لە کەنیسەکانی ئێران بوون، بەڵام دەسپێکی یەکگرتنی کەنیسەکان بۆ ساڵی ٤١٠ی زایینی دەگەڕێتەوە. مەسیحییەت لە رێگەی ئێرانەوە بەرەو هیند، ئاسیای ناوەڕاست (تاتار و تورکمەنەکان)و چین رەگاژۆی کرد و کەنیسەی مەسیحییان تێدا دروستکرا.

لە دەسپێکی مەسیحییەتدا، ئایینی زەردەشتی، وەک ئایینی فەرمیی وڵاتی ئێران، بە تەواوەتی رەگی داکوتاو ئایین و دەوڵەت، لەم قۆناغەدا، ئاوێتەی یەکتر دەبن. ئەمەش کێشە بۆ مەسیحییەکانی نێوخۆی ئێران دروست دەکات. زۆربەی توێژەرانی ئایینی مەسیحی لەو باوەڕەدان تاقمی رۆژهەڵاتیی مەسیحییەت لە ژێر گوشاری ساسانییەکاندا دروست بووە، بەڵام هێندێکیدیکە لە توێژەران ئەم بۆچوونە بە دروست نازانن و پێیانوایە کوشتاری مەسیحییەکان تەنیا بەهۆی بەرچاوتەنگیی ئایینییەوە بووەو هیچ هۆکارێکی سیاسیی لەپشت نەبووە..

لە دەسپێکی فەرمانڕەوایی ساسانییەکاندا، لە وڵاتی ئێران سەرکوتی جوو و مەسیحییەکان روو ئەدات و لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا ئەم مەسەلەیە شێوازێکی توندوتێژتر بەخۆیەوە دەبینێت.

هاوکات لەگەڵ شەڕی نێوان ئێران و رۆم، ئایینی مەسیحی لە وڵاتی رۆم دەبێتە ئایینی فەرمی و ئەم مەسەلەیەش رەنگی سیاسی بەخۆیەوە دەگرێت و زۆربەی ئەو مەسیحییانەی کە لایەنگرییان لە بیزانس و قوستەنتەنییە (ئەستەمبووڵی ئەمڕۆ) دەکرد، بەدەستی ئێرانییەکان کوژران. لە هەموو

سەردەمی ساسانییەکاندا، قوستەنتەنییە بۆ وڵاتی ئێران سەرچاوەی کێشە بوو. زۆربەی پاشای ساسانییەکان یارمەتیدەری مەسیحییەکان بوون و هیچ کاتێک رقەبەرایەتی لەنێوانیاندا نەبووە. لە سەردەمی شاپووری سێیەمدا (۳۸۳ی زایینی)، مسیحییە دیلەکان لە زیندان ئازاد دەکرێن و ئەو پەیماننامانەی کە لەگەڵ دەوڵەتی بیزانس واژۆ دەکرێن، بەرژەوەندیی مەسیحییەکان لەبەرچاو دەگرن.

مەسیحییەت لە ئێران تووشی دووریان دەبێت. یان دەبوا ملکەچی پاتشای ئێران بن، یان پەیرەوییان لە قەیسەر(پاتشا)ی رۆم بکردایە. رۆحانییە زەردەشتییەکان لەکوشتاری مەسیحییەکاندا بەشدار بوون، کە ئەمەش لە سەرگوزەشتەی شەهیدە مەسیحییەکاندا بەرچاو دەکەوێت. لەسەردەمی بەهرامی دووەمدا (۲۷٦ هەتا ۲۹۳ی زایینی)، بە هۆی دەستتێکەڵکردنی پاتشا و رۆحانییە زەردەشتییەکان، کوشتارێکی یەکجار زۆری ئایینی لەو وڵاتە روو ئەدات و کرتیر (رۆحانییەکی زەردەشتی و جێگرەوەی شاپووری یەکەم، کە لە کوشتنی مانەوییەکاندا بەشدار بووە)، هێزێکی مەزن پەیدا دەکات.

لە ساڵەکانی دەوروبەری ۳۰۰ی زایینیدا، کۆنستانتین (ناوی دوو کەس لە پاتشایانی یۆنانی) دەبێتە پشتیوانی مەسیحییەت و دواتر وەک ئایینی فەرمیی بیزانس (قوستەنتەنییە، یان ئەستەمبوڵی ئەمرۆ) رایدەگەیەنێت. لە ئێران کوشتاری مەسیحییەکان لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی شاپووری دووەمەوە بۆ ماوەی ٤۰ ساڵ درێژەی دەبێ. لەلایەکیدیکەشەوە مەسیحییەکان دەبوا بەرەورووی ئایینی زەردەشتی ببنەوە، بۆ نموونە، دژایەتیی نزاکردن و پەرستنی " ئاو، ئاگر و رۆژ"یان دەکرد، پرسی خۆوێدۆدە (هاوسەرگیری لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵە)یان دێنایەگۆڕێ. یەکێکیدیکە لەو پرسانە کە مەسیحییەکان دەیانکردە بیانووی هێرش بۆ سەر زەردەشتییەکان، مەسەلەی زۆروان بو،و کە بەباوکی هۆرمەزد و ئەهریمەن دادەنرا، بەڵام رەخنەی زەردەشتییەکان زیاتر بۆ مەسیح، کوڕی خواوەند، دەگەڕایەوەو دەیانگوت

چۆن دەبێ کوڕی خواوەند بە دیل بگیرێ و لە خاچی بدەن و بەرەو ئاسمان هەڵزنێ. رەخنەیەکی دیکەی زەردەشتییەکان ئەوەبوو، کە خواوەندی مەسیحییەکان ئافرێنەری چاکە و خراپەیە و چۆن دەکرێ خواوەند لەداوێنی ژنێک (مریەم) کەوتبێتەوە؟ شکەند گومانیک و زار( گوزارشتی گومانڕەوێن) یەکێک لەو نووسراوە پەهلەوییانەیە کە سەبارەت بە رەتکردنەوەی جوو، مەسیحییەت و مانەویگەرییە.

لەم سەروبەندەدا، مەسیحییەکان ئاتەشگەکانی زەردەشتیان سوتاند و زۆرجاریش بەدەستی رۆحانییە زەردەشتییەکان ئەشکەنجە ئەدران.

لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی زایینیدا، مەسیحییەکانی ئێران رێچکەیەکی نوێ دەگرنەبەر، کە ئەم رێچکەیە پەیڕەویکردن لە نستووریووس بوو. ئەو لە ٤٢٨ی زایینیدا، رۆحانیی گەورەی زەردەشتی بوو لە قوستەنتەنییە، کە شوێنکەوتوەکانی بەنستووری بەناوبانگبوون. نستوورییان لەسەر ئەو باوەڕەبوون کە نابێ بڵێن عیسا لەسەر زەوی جەستەی هەبووە، چونکە ئەمە کەسایەتییە بەهەشتی و ئاسمانییەکەی خەوشدار دەکات.

لەساڵی ٤٣١ی زایینیدا، شورای کەنیسەیی سەرجەم مەسیحییەکان لە شاری ئێفێسووس پێکهات. لەم شورایەدا، روانگە و بیروباوەڕی نستووریووس رەتدەکەنەوەو رەوانەی شاری ئەنتاکییەی دەکەن، پاشان پلەکەی لێدەستێننەوەو بۆ لیبی دووری دەخەنەوە، بەڵام نستریووس لە بیروباوەڕی خۆی پاشگەز نابێتەوەو لە دوایین ساڵەکانی تەمەنیشیدا کتێبێک لەسەر روانگەو بۆچوونەکانی خۆی دەنووسێتەوە. سیریل، ئۆسقۆفی ئەسکەندەرییە، سەرەکیترین دوژمنی نوستووریووس بوو، کە ئەوی مەحکومکرد.

مەسیحییەکانی ئاسیای بچووک و سوریا چاویان بەرایی ئەم شکستەی نستووریووی نەبوو، بۆیە لەکەنیسەی سەرەکی جیا دەبنەوە و (ساڵی ٤٥١ی زایینی) شورایەک پێکدێنن و سەربەخۆیی کەنیسەی نستووریوو رادەگەیەنن.

مەسیحییەکانی ئێرانیش دەچنە ریزی کەنیسەی نستوورییەوەو بەم شێوەیە ئۆسقۆفەکانی مەسیحیی نستووریوسی دەتوانن ژیانی هاوبەش

پێکبێنن و خۆپارێزی و نزا و پاڕانەوە بایەخێکی ئەوتۆی نامێنێت. کەنیسەی نستووری هەتا ئیستاش لەوڵاتی ئێران ماوەو دەوروبەری ١٠٠ هەزار کەس پەیڕەوی هەیە. لایەنگرانی نستووری و بیروباوەڕی نستوورییوس بەلای زەردەشتییەکانەوە، بە بەراورد لەگەڵ مەسیحییەکان، وەک دوژمن سەیر دەکرێن.

لەساڵی ٤٨٦ی زایینیدا، قەشەیەک بەناوی تێئۆدۆر مووپسوونستیا بەرپرسارێتیی کاروباری پلانڕێژیی نستوورییەکانی لەئەستۆبوو. کەنیسەی نستووری، بەشێوەی فەرمی، لە نێوان ساڵەکانی ٤٩٧ هەتا ٥٠٢ی زایینی لەئێران دروستکران.

لە سەردەمی ئیسلامیدا، کەنیسەی نستووری لەلایەن موسڵمانەکانەوە بەباشی وەرگیراو لە ئەنجامدا پێنج ناوچەی ئۆسقۆفی درووستبوون. نستوورییەکان لە هیند، چین و ئاسیای ناوەڕاست بڵاوبوونەوەو لە مەغۆلستان هێزێکی یەکجار زۆریان بەدەستهێنابوو.

لەسەدەی ١٤ی زایینیدا، لە سەردەمی تەیموورییاندا، پەرەگرتن و هێزی نستووریان کەمیکرد. لەسەدەی ١٦ی زایینیدا (١٥٥١ی زایینی)، ئەو نستوورییانەی لەنێوان گۆلی ورمێ و گۆلی وان دەژیان، دەستیان لە تاقمی نستووری هەڵگرت و روویان لە کەنیسەی کاتۆلیکیی رۆم کرد، کە بە کلدانی ناوبانگیان دەرکرد. ئەو مەسیحییە نستوورییانەی مابوونەوە بەئاسووری دەناسرێن. ئاسوورییەکانی ئێران هیچ پەیوەندییەکیان بە هۆزەکانی ئاشوورەوە نییە، بەڵکو بەجێماوی نستوورییە مەسیحییەکانی ئێرانن.

## پەراوێزەکان:

Harapà.1

Dnepr .2

Yenisey .3

Minusink. 4

Afanasievska .٦

Andronovo .6

٧. یەکێک لە هۆزە دێرینەکانی هیند و ئەورووپایی لە Mitannis هەزارەی دووەمی پێش زاییندا.

٨. یەکێک لە هۆزە جەنگاوەرەکانی هیند و ئێرانی کە کڵاوی :sakas نووک بزمارییان لەسەر دەکرد. سکستان یان سیستان، ناوەندی ژیانی ئەوان بوو.

٩. باختەر یان بەلخان، وڵاتی دێرینی نێوان چیاکانی :Bacteria هیندوکیش و چۆمی جەیحوون.

١٠ George Dumezil.

١١. یەکێک لە هۆزە دێرینەکانی ئاسیای بچووک. :Hittite

١٢. Boghàzkoy .

١٣. کۆمەڵە شیعرێک بە زمانی نەرویجی کە لە دەسپێکی :Eddas سەدەی سێزدەیەمی زاییندا کۆکراوەتەوە.

١٤. هۆزەکانی سکەندەناڤی، کە لەگەڵ هۆزە ئەڵمانییەکان :Nordic ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر یەک.

١٥. Godesses.

١٦. یەزدان خاتوونی مەزنی یۆنانی، هاوسەری زێئووس، :Hera خواوەندی خواوەندەکان.

١٧. یەزدان خاتوونی ئەڤین و جوانی و هاوسەری :Aphrodite هێفائیستووس لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، هاوتای ڤێنووسی ڕۆمییەکان.

١٨. Baldr

١٩. یەزدانی شەراب و زاوزێ لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، :Bacchus ناوێکی دیکەی دیونیسووس.

٢٠. خواوەندی شەراب و زاوزێ، ناوێکی دیکەی باکووس. :Dionysus

٢١. کۆنترین بەیتی ئازایەتیی چیرۆکی سانسکریتـــە، :Ràmayana کە لە دەوروبەری ٢٠٠ هەتا ٥٠٠ ساڵ پێش زایین لەلایەن والمیکی، هەڵبەستڤانی دێرینی هیندییەوە هۆنراوەتەوە. رامایەنە لە نێو کتێبە پیرۆزەکانی هیندواندا بە پلەی سێیەم دادەنرێ، بەڵام لەنێو خەڵکدا ناوبانگێکی باشی هەیە. ئەم بەرهەمە بەشێوەکانی هەڵبەست و پەخشان وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فارسی. لە ساڵی ٩٩٧ی کۆچیدا مەلاعەبدولقادری بدایوانی یەکەم کەس بووە کە لەسەر داوای ئەکبەرشا، وەریگێڕایە سەر شێوەی هەڵبەستی فارسی. ئەو بەرهەمە، هەنووکە هیچ ئاسەوارێکی نەماوە، بەڵام وەرگێڕانەکەی مەلا سەعدوڵڵا مەسیح و چەند هەڵبەستڤانێکیدیکە لەبەر دەستدان. لە ساڵی ١١١٧ کۆچیدا، ئەمیرسنکهە، یان ئەمیر سینگ کاری وەرگێڕانەکەی لە قاڵبی پەخشاندا تەواو کردووە. رک. کورتکراوەی رامایەن، کۆنترین بەرهەمی حەماسەت و ئازایەتیی هیندوان، نووسین و گەڵاڵە داڕێژەر ئێقباڵ یەغمایی، بونیادی فەرهەنگ، تاران ساڵی ١٣٥٥.

٢٢. یەزدان خاتوونی ئەڤین و شەڕ، هاوتای ئینانا، هەسارەی :Ishtar وێنووس، لە سوریا و فەلەستین، ناوی عستارت و عشتارۆتـــە و بە "عێشتەر"یش ئەخوێندرێتەوە.

٢٣. Dyaus pîtr

٢٤. Zeus Pater

٢٥. Jupiter

٢٦. Ahura Mazda

٢٧. لەئەفسانەکانی نۆروێژیدا، یەزدانی مەزن و ئافرێنەری :Odin کەیهان و ئینسان، یەزدانی زانایی، شەڕ، هونەر، فەرهەنگ و یەزدانی

یان Woden مردووەکان. زۆر کەس لەگەڵ یەزدان تیووتۆنیی ڤۆدێن بە هەڵە دەیانگرێت. Wolten

٢٩. یەکێک لە هۆزە دێرینەکانی ئەورووپایی کە لە باشوور و :Gauls
رۆژئاوای چۆمی راین، رۆژئاوای ئاڵپ و باکووری پیرنە دەژیان. هەنووکە هەرێمێکی فەرانسە و بلژیکی ئێستایە.

٣٠. یەزدانی ئاگر لە ئەفسانەکانی ڤیدایی هیندا :Agni .

٣١. Hestia

٣٢. Vesta

٣٣. Ugnis Szventa

٣٤. Figurines

٣٥. ناوی شارێکی گرنگ لە باشووری میزۆپۆتامیا کە پەرستگەی :Uruk
مەزنی ئینانا لەوێ هەڵکەوتبوو. لە کتێبی پیرۆزدا بەشێوەی ئەرخ هاتووە و بەرمابەر بە شاری وێرقای ئێستا هەڵکەوتووە. یەکەم پاتشاکانی ئەم شارە، ناوبانگی دۆمۆزیـیان بۆ خۆیان دیاری کردبوو، گیلگمش یەکێکیدیکە لە پاتشاکانی ئەم شارە دێرینە بووە.

٣٦. یەزدان خاتوونی مەزنی شاری ئۆرووک، ناوی لە :Innin
ئەفسانەکانی سۆمەریدا بە واتای "خاتوونی ئاسمان" دێت و ناوی مێژوویی لەوە سەرچاوەی گرتووە، زۆر جار بە ئینانـاش ناوی هێندراوە، کە Nin.an.ah
یەزدان خاتوونی ئەڤین و زاوزێ و کۆمەڵێک پێناسەی دیکەی ئاسمانی بەوێنەی هاوتا سامیـیەکەی، ئیشتر، بووە.

٣٧. ناوێکی دیکەی ئینین، یەزدان خاتوونی میزۆپۆتامیایی. :Inànna

٣٨. یان "خواوەندی زەوی"، یەزدانی سۆمەری و و هاوتای ئێئا. :Enki
، یەزدانی زەوی (Ea)

٣٩. دیوی ئاوە شیرینەکان، ئاوە هەتاهەتاییەکانیسزەوی، :Apssu
هەر بەواتای "مغاک و ژرفا" و لەگەڵ وشەی ئینگلیزیی Abzu :سۆمەری یەک چاوگیان هەیە. "abyss"

٤٠. یەزدانی شوانی لە ئەفسانە سۆمەرییەکاندا، لە مانادا " :Dumuzi
ڕۆڵەی ڕاستبێژ یان ئیماندار" دەگەیەنێت. زۆر جاریش ناونیشانی پاتشاکان،
بەتایبەت پاتشاکانی ئۆرووک بووە. وشە هاوتا بابلییەکەی تەمووز
(Tammuz) ـە. بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە دۆمۆزی و خواوەندەکانی
میزۆپۆتامیا رک،ساندرز، سەردانی کتێبی "بەهەشت و دۆزەخ لە
ئەفسانەکانی میزۆپۆتامیادا"، چاپی ١٣٧٣ی تاران، وەرگێڕانی فارسیی
"ئەبولقاسم ئیسماعیلپوور" بکەن.
٤١. یەزدانی خێر و بەرەکەت و بارێنەری باران لە :Ba, l and Anath
ئاخی کەنعان.
٤٢. خواوەندی مەرگ. :Mot
٤٣. Hatti
٤٤. یەزدانی بارێنەری باران لەنێو باوەڕی هۆزە هیتییەکان. :Teshub
٤٥. یەزان خاتوون دایکی وڵاتی میسرییەکان، کچی تووس، :Isis
هاوسەر و خوشکی ئۆزیرێس و دایکی هۆرووس.
٤٦. یەزدانی ڕزگاریدەری میسری، یەکێک لە یەزدانە گرنگەکانی :Osirs
مەرگ، تاکە یەزدانێک کە بەرەوڕووی ئایینی هەتاویی ڕع بووەوە.
٤٧. بکوژی ئۆزیرێس و جێگری لە وڵاتی میسر. :Set
٤٨. منداڵی ئۆزیرێس و تۆڵەئەستێنی باوکی. :Horus
٤٩. منداڵی هەتاو، یەزدانی مەزنی بابل و پاڵەوانی چیرۆکی :Marduk
ئافرێنەری بابلی.
٥٠. ناوی خواوەندی وڵاتی ئاشوور. :Ashur .
٥١. دێوی ئاوە هەتاهەتاییەکان، یەکێک لە بوونەوەرە :Tiàmat
نەمرەکان، هەروەها بە پانتایی دەریا، ئاو و گۆلەکان دەوترێت.
٥٢. لەئەفسانە یۆنانییەکاندا، دێو ـ خواوەندی یەکەم و :Chronus
خواوەندی کات بووە کە بەرلە زێئووس ژیاوە.

٥٣. خواوەندی کات، لە ئەفسانە ئێرانییەکاندا باوکی هۆرەمەزد Zurvàn:
و ئەهریمەن بووە.

٥٤. دێو ـ خواوەندی یەکەم لە ئەفسانە هیندییەکاندا. Purusha:

٥٥. خواوەند ـ باوکی دێرینی دۆڵی سێند. Prajàpati:

٥٦. Brahma: ٥٦. یەکێک لە سێ خواوەندی گەورەی هیندووەکان، خواوەندی ئافرێنەری جیهان، لەپەنا "وینشوو"دا پارێزەر و لەپەنا شیوادا وێرانکەر.

٥٧. لەئەفسانە یۆنانییەکاندا، گایا یەزدانی سەر Gaya, Uranus:
زەوی و ئۆرانووس یەزدانی ئاسمان بووە.

٥٨. یەزدان خاتوونی چۆم لەئەفسانەی ڤیدایی هیندیدا. Sarasvati:

٥٩. یەزدانی باران لە ئەفسانەکانی میزۆپۆتامیادا. Ninurta:

٦٠. ناوی ٦ مندالّی ئۆرانووس و "گایا"یە، کە سەربە بنەماڵەی Titans:
یەکەمین خواوەندەکانەو لە هەمووشیان گەنجتر "کرۆنووس" بوو، کە لەلایەن خواوەندەکانی "ئالّمپ"ەوە خولّقێندرا.

٦١. یەزدان خاتوونی ئاو و باران بووە لە ئەفسانە Tishtar:
ئێرانییەکاندا.

٦٢. لەئەفسانە ئێرانییەکاندا دێوی وشکانی و وشکەساڵی Aposh:
بووە.

٦٣. یەزدانی شەڕ و ئەفسانەی هیندی. Indra:

٦٤. لەئەفسانەکانی هیندیدا دێوی وشکەساڵی بووە، کە Vrtra:
بەدەستی ئیندرە دەکوژرێ.

٦٥. یەزدانی ئاسمان و ئەفسانەی میزۆپۆتامیاییەکان. Anu:

٦٦. لەئەفسانە هیتییەکاندا، ناوی یەزدانێکیان بووە، کە Appu:
بەدەستی یەزدانی خولّقێنەری شەڕ و خێر دروستکرا.

٦٧. یەزدانێکی دێرینی هۆزی هیتییەکان بوو، :Kumarbi
هاوشێوەی زۆروان لەئەفسانە هیتییەکاندا رۆلی خواوەند - باوکی لە ئوستۆ بووە.

٦٨. خواوەندی عەقروون. سەردانی. کتێبی پیرۆز، :Ba, alZebub
کتێبی دووەمی پاتشاکان، فەسڵی یەکەم.

٦٩. هێمای راستی و کرداری راست لە نێو ئەفسانەی گاتاکانی :aşa
زەردەشت.

٧٠. هێمای درۆ و لەنێو ئەفسانەی گاتاکانی زەردەشت. :drauga

٧١. Macrocosm

٧٢. Microcosm

٧٣. Aköman

٧٤. Andar

٧٥. Sàwul

٧٦. Nàgh

٧٧. Tariz

٧٨. Zariz

٧٩. نیزامی دەرەبەگایەتیی سەردەمی ئەشکانی :Kardag Xawadàyih
و ساسانییەکان.

٨٠. کتێبێکی پەهلەوی لە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی :Bundahişn
فەرنبەغ دادگی، یەکێک لە مووبد (رۆحانی)ە زەردەشتیەکان بووە.

٨١. کتێبێکی پەهلەوی لە نووسینی :Wizidagihài Zàdisparm
زادسەپرەم، منداڵی جەوان جەم، هیربەدی نیمرووز، لە ناوەڕاستی سەدەکانی سێیەمی کۆچیدا.

٨٢ . بەپێی چیرۆکێک ، لەنێو منداڵدانی هاوسەری زۆرواندا یان، بە واتایەکی دیکە، لە منداڵدانی خۆیدا، چونکە ئەو هەم باوک بوو، هەم دایک.

٨٣. ئەم چیرۆکە لە زۆربەی نووسراوە پەهلەوییەکاندا بەرچاو ناکەوێ.

٨٤. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئافراندن، چاو لە کتێبی توێژینەوەیەک لەمەڕ ئەفسانە ئێرانییەکان، بەشی دەیەم، لاپەڕەی ١٥ بکەن.

٨٥. بۆ خوێندنەوە و زانیاری لەسەر کۆتایی جیهان، چاو لە هەمان سەرچاوە، بەشی ١٩، ٢٠، ٢١، سەبارەت بە زۆروان چاو لە Zaehner, Zurvan a zorosatrion Dilema . New York 1972 بکە.

٨٦. بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەوە چاو لە شەهرستانی، ملل و نەحل بکەن.

٨٧. بەپێی باوەڕی زەدەشتییەکان، پردێکە کە لە ڕۆژی :Cïnvad زیندووبوونەوەی پاش مەرگدا بۆ خاوەن چاکە و مێرخاسەکان، بە ئەندازەی نۆ گوریس پان دەبێتەوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لێی بپەڕنەوە، بەڵام بۆ ئەوەی خراپەکاران و ئەهریمەنییەکان بەر ببنەوە بۆ نێو جەهەنەم، بە ئەندازەی تاڵە موویەک باریک دەبێتەوە.

٨٨. چاو لە شەهرستانی، ملل و نەحل، فەسڵی "سەبارەت بە ئایینی زەردەشتی و مەزهەبەکانی" بکە.

٨٩. angra. Mainyu

٩٠. Spanta. Mainyu

٩١. سەردانی یاداشتی ژمارە ٣٨ی ئەم بەشە بکە.

٩٢. بڕوانە وتاری وەرزشی دێرینی ئێران و بنچینەی مێژووییەکەی"، گەڕانێک بە دوای فەرهەنگی ئێرانیدا، چاپی تاران ساڵی ١٣٧٣.

٩٣. لەئەفسانە یۆنانییەکاندا وەک: یەزدان خاتوونی :Demeter وەرزێری، زاوزێ و هاوسەرگیری، هاوتای سرێس، یەزدان خاتوونی ڕۆمی، سەیر دەکرێت.

٩٤. samaria

٩٥. ڕێبەری ئایینی گنووسی لە سەردەمی ئیپراتۆرەکانی :Basilides هادریان و ئانتونیۆس لە ئەسکەندەرییە ـ پیوس. بڕوانە ئایینی گنووسی و

مانەوی لە نووسینی میرچا ئەلیادە و وەرگێڕانی ئەبولقاسم ئیسماعیلپوور، چاپی ١٣٧٣ی تاران.

٩٦. یەکێک لە بناغە دارێژەرانی ئایینی گنووسیی Valentine: ئەسکەندەرییە، کە دەووبەری سالّی ١٠٠ی زایینی لە ئاورێژگەی نیل لەدایک بوو و لە ئەسکەندەرییە نرایە بەر خوێندن. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣، ٣٥.

٩٧. یەکێک لە بناغەدارێژەرانی ئایینی گنووسی Simon the Magus: لە سەرەتای مەسیحییەت بوو، کە پرسی سۆفیا (حیکمەت)، یان هاوسەری خواوەند و رۆحولقودووسی هێنایە گۆڕێ. هەمان سەرچاوە. ل ٢٣، ٢٤، ٥٩.

٩٨. Helen

٩٩. Tyr

١٠٠. Selena

١٠١. Gnosis

١٠٢. logos

١٠٣. Nous

١٠٤. Sophia

١٠٥. خۆری هەتاهەتایی بەهەشت. زۆر جار بە ناوچەی ژێر aeons: دەسەلاتی یەزدانیش دەوترێ.

١٠٦. Pleroma

١٠٧. یەکێک لە بناغەدانەرانی ئایینیی گنووسی کە لەنێوان Marcion: خواوەندێکی نەناسراو و خواوەندێکی ئاست نزمتردا، کە ئافرێنەری جیهانی مادی بوو، جیاوازی دادەنا. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١ بەدوا.

١٠٨. Antitheses

١٠٩. Demiurge

١١٠. Capharanaum

۱۱۱. سەرچاوەی سەرەکییەکانی نووسەر لەم بەشەی ئەم کتێبەی ژێرەوەدا بووە :
کە Hans jonas. The Gnostic Religion, Boston 1963
بەشێوەیەکی پوختەتر، لەبەشی یەکەمی کتێبی ئەدەبیاتی مانەویدا هاتووە.
۱۱۲. Frawahar
۱۱۳. لەئایینی مانیدا، خواوەند ـ باوکێکە کە لە :Pidari Wuzurgih
سەروو هەموو خواوەندەکانەوە دادەنرێت، فەرمانڕەوای بەهەشتی ڕووناکییە.
ناسناوێکی دیکەی زۆروانە.
۱۱٤. ڕۆحی پاک یان ڕۆحی زیندوو، :Wäxš Yözdahr, Wäxš Zindag
یەزدان خاتوونی مانەوی، کە هەمیشە لە پەنا باوەگەورەییدا یادی دەکرێتەوە.
۱۱٥. دایکی ژیان و بەدیهێنەری هۆرمەزدبەغ، مرۆڤە :Mädar I Zinagän
سەرەتاییەکان بووە.
۱۱٦. مرۆڤە سەرەتاییەکان، یەزدانێک کە :Ohrmizdbag
یەخسیرییەکەی هێمای یەخسیریی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوییە.
۱۱۷. ناوی ٥ منداڵەکەی هۆرمەزدبەغ، خواوەندێکی :Amahraspandän
ئافرێنەری ئەفسانە مانەوییەکانە.
۱۱۸. Ränaän xwärist
۱۱۹. بناغەدارێژەری جیهانی مادی. :Bämyazd
۱۲۰. ئافرێنەری جیهانی مادە، واتە ۸ زەوی و ۱۰ ئاسمان :Mihr Yazd
و ڕزگاریدەری هۆرەمەزد لەدەست دێوەکان.
۱۲۱. یەکەمین منداڵی میهرئیزەد، :The Keeper of Splendour
خواوەندی یەکێک لە ئاسمانەکان.
۱۲۲. دووەمین منداڵی میهرئیزە ، ناوێکیدیکەی :The king of Honour
مرزبد بووە.
۱۲۳. سێیەمین منداڵی میهرئیزەد، :The Adanas of light
ناوێکیدیکەی ویسبد بووە.
۱۲٤. چوارەمین منداڵی میهرئیزەد، ناوێکیدیکەی :The king of Glory
زندبەد بووە.

١٢٥. پێنجەمین مندالّی میهرئیزەد، پارێزەری :Mänbed یا Atlas زەوییەکانە، ناوێکیدیکەی پرمانگین ئیزەد بووە.

١٢٦. یەزدانی رزگاریدەر ئافرێنەری سێیەم لەئەفسانە :Narisah yazd مانەوییەکاندا.

١٢٧. Bemä

١٢٨. Arahang

١٢٩. Kephalaia

١٣٠. گرنگترین توێژینەوەکانی هاوچەرخ سەبارەت بە ئایینی مەزدەک بریتین لە: توێژینەوەی کریستنسین، لە کتێبێکدا، کە لەلایەن رەشید یاسەمییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی، بەناوی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا. بەرهەمێکی کەلیما، کە لەژێر ناوی مێژووی بزووتنەوەی مەزدەکی، بە زمانی فارسی چاپ و بلّاو کراوەتەوە. هەروەها وتارێکی بەپێزی ئیحسان یارشاتر، لەمێژووی ئێراندا:

The Cambridge Histoty of Iran Vol. 3 (2), Mazdakism, pp. 991.١٠٢٤ـ کە پێدەچێ تۆکمەترین توێژینەوە لەسەر مەزدەکیان بێت.

١٣١. Bunds

١٣٢. Drist — dxnän

١٣٣. نووسراوەکانی ئەم بەشە لەلایەن "میهردادی بەهار"ـەوە وتراون و لەلایەن هەڵەچنی ئەم کتێبەشەوە نووسراونەتەوە.

١٣٤. بڕوانە، پیکولوسکایا، شارەکانی ئێران لە سەردەمی پارتیان و ساسانییەکاندا، لە وەرگێڕانی عینایەتوڵڵا رەزا، چاپی ١٣٦٧ی تاران.

١٣٥. Acts of Martyrs

١٣٦. Cmbri History of Iran vol 3 (2)بڕوانە، Zurwan بکەن. Zaehner,هەروەها لەم پەیوەندییەدا دەتوانن چاو لە A Zoroastrian Dilema.

١٣٧. Nestorius

١٣٨. Cyril

١٣٩. Theodor Mopsuestia

سەرچاوەکان :

ئێدی ساموئێل. نەریتی پاتشایەتی لە ڕۆژهەڵات، وەرگێڕانی فەرەیدون بەدرەیی، چاپی ١٣٤٧ی تاران.

بنووسنیت، ئیمیل. ئایینی ئێرانی، وەرگێڕانی بەهمەن سەرکاراتی، چاپی ١٣٥٢ی تەورێز.

بەهار، میهرداد. توێژینەوەیەک لەسەر ئەفسانە ئێرانییەکان، چاپی ١٣٦٢ی تاران.

پووررداود. یەشتها، بەرگی ١ و ٢، چاپی ١٣٤٧ی تاران.

پووررداود. گاتاکان، چاپی ١٣٥٦ی تاران.

دادگی، فەرەنبەغ. بەندهێش، ڕاپۆرتی میهرداد بەهار، چاپی ١٣٥٦ی تاران.

کریستیسن، ئارتوور. ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا، وەرگێڕانی ڕەشید یاسەمی، چاپی ١٣٥١ی تاران.

لووسکایا، پیکۆ. شارەکانی ئێران لە سەردەمی پارتیان و ساسانییەکاندا، وەرگێڕانی عینایەتوڵڵا ڕەزا، چاپی ١٣٦٧ی تاران.

Boyce, M. A History of Zoroastrianisn, Leiden 1975

- A Reader in Manichacan Middle Persian and Parthian, Acta Iranica, Leiden 1975

Duchesn. Gullemin, Religion of Ancient Iran, Bombay 1973.

Jonas, Hanas. Gnosic Religion, Boston 1963.

Openheim, Ancient Mesopotamia, Chicago 1972.

Yarshater, E (ed) Camberidge History of Iran, Cambridge 1985.

Zaehner, Zurvan, A Zoroastrion Dilwma, Oxford 1985

. The Dawn and Twilight of Zoroastrianism, London 1961.

## گوتاری دووەم

## بەشی دووەم
## ئایینی هیندی

### ئایینی ڤیدایییەکان
### هیندستان پێش هاتنی ئارياییەکان

هیندستان بە شێوە دوورگەیەکی گەورەی باشووری ئاسیا دەوترێت، کە چیا سەرکەشەکانی هیمالایا، سەرتاسەری باکووری ئەو وڵاتەی لەخۆ گرتووەو دوو چۆمی گەورەی دۆڵی سێند لە ڕۆژهەڵات و گەنگ - برەهماپوترا لە ڕۆژئاوای هیندستان بوونی هەیە. ئۆقیانووس (دەریا)ی هیند ڕۆژهەڵات، باشوور و ڕۆژئاوای نیمچە دوورگەی هیندستانی لەخۆگرتووە. لەڕۆژهەڵاتەوە جگە لە ئۆقیانوس، لێڕەوارەکانی بێرمە (میانمار)، لە ڕۆژئاواشەوە جگە لە ئۆقیانوس، پێدەشتەکانی ئێران و بەلوچستان، هەڵکەوتوون.

درێژی و پانایی ئەم وڵاتە بەرلە سەربەخۆیی و دابەشبوون، ٢٩٠٠ لە ٢١٩٠ کیلۆمەتربوو.

ئەم وڵاتە لەلایەن هیندووەکانەوە بە بێهارتە ورشە٢، واتە وڵاتی بەهاران، دەناسرێت. بێهارەتە ناوی پاشایەکی ناودار لە سنت پوورانە٣ بووە. بێهارەتە بەشێک لە جەمبوو دووپیە٤ یان هەرێمی ناوەڕاستی نێوان حەوت هەرێمی جوگرافیای دێرین بووە، بەشێوەیەک کە ئێرانیش، بەپێی جوگرافیای ئەفسانە ئێرانییەکان، لە خونیرس کە هەرێمی ناوەڕاستی ئەو حەوت هەرێمەبوو، هەڵکەوتبوو٥.

لە سەرچاوە ئێرانی و عەرەبی و تورکییەکاندا هیند، هەروەها India لە سەرچاوەی یۆنانی و ڕۆژئاواییەکان، هەردووکیان ئەسڵدا لەHi(n)du ، لە فارسیی دێرینەوە هاتوون.٦ کە ئەمەش لە ناوی چۆمی سێندەوە وەرگیراوە.

لە سەرەتادا S بەرانبەر بە H لە ئێرانی دێرین (ئاڤێستا - ویدیواد - Hapta Hindu، بەرانبەری Sapta Sindhava لە وێدا) دایە.

دواتر وشەگەلی هیند و هیندستان لەسەر ئەم بنەمایە دروستبوون و لە نووسراوە فارسی و عەرەبییەکاندا بەکار دەهێنران. وشەی India بەهۆی کێشەی فۆنێتیکیی نێوان زمانە ئێرانی و یۆنانییەکان، لەسەر بناغەی وشەی ئێرانیی دێرینی Hindu دروست بوو.

زمانی پراکریت ٨ لە سەدەی سێیەمی پێش زایین زمانی ئاخاوتنی سەرجەم خەڵکی هیندستان بوو و چیرۆکی ئازایەتیی رامایینە ٨ و مهابهارته١٠ سەبارەت بە تمیلەکان١١ لە باشوور و سەبارەت بە ئەدەب ناسیی تکسیلا ١٢ لە پەنجابی رۆژئاوا بە ئۆگری و رێز و حورمەتەوە دەخوێندرانەوە. هەتا ئێستاش ئایینی ڤێدایی و "پووران"ەکان دەبێتە هەوێنی ئۆقرەگرتنی خەڵکی ئەو وڵاتە. پەرستگەی شیوا و وینشوو، کە شوێنی بەڕێوەچوونی رێورەسمە پیرۆزە ئایینییەکانە، هەموو ساڵێک لە کوێستانە سەربە بەفرەکانی باکوور لە هیمالایا بەڕێوە دەچێت و پەرستگەکانی کریشنا و کاوێری کەلە سەرچاوەی چۆم و رووبارە بەرینەکاندا هەڵکەوتوون میوانداریتیی زۆڤاران دەکەن، هەردووکیان ئاماژە بە بەربڵاویی بیروباوەڕی ئایینیی گشتی لە نیمچە دوورگەی هیندستان دەکەن. تەنانەت زۆربەی ئایینە هیندییەکانی جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە.

## هیندستان پێش مێژوو

کۆمەڵێک ئاسەواری دێرین لە ناوچە جیاجیاکانی هیندستان لەجۆری بەردی کوارتێز دۆزراونەتەوە، بەم شێوەیە خەڵکی ئەو چاخەی هیند بە "خەڵکی کوارتێزی" ناوبانگیان دەرکردووە.

پێدەچێ خەڵکی ئەو چاخە بەردینە بە رەگەز بچنەوە سەر تیرەیەکی رەشپێست، کە خەڵکی دوورگەکانی و ئەندامانی ئێستا لە کەنداوی بەنگال لە یەک تۆرەمە بن. ئەمانە خەڵکێکی کورتەباڵا، رەشپێست، قژ لوول و لووت پان بوون.

لە چاخی نوێی بەردیندا، خەڵکی هیند جیا لە بەردی کوارتێزی، چەندین بەردی دیکەیان بەکار دەهێنا و خاوەن کەرەستەگەلێکی بە دەست دروستکراو و داتاشراو بوون. نمونەی کۆمەڵگەی چاخی بەردینی نوێ

بەفراوانی لە هەموو شوێنێکی هیندستان بەرچاو دەکەون. خەڵکی ئەم چاخە بە وەرزێری و باخدارییەوە سەرقاڵ بوون، ئاژەڵیان ماڵی کردووە و مەڕوماڵاتیشیان بەخێو کردووە. ئەوان ئاگریان لەرێگەی ساوینەوەی قامیش و چێو بەڕووی یەکترداکردۆتەوە و هەروەها کاسەی گڵێنەشیان لە سەرەتادا بەدەست و پاشان بە کەڵک وەرگرتن لە چەرخ دروست دەکرد. ئەوان کە لەنێو ئەشکەوتەکاندا دەژیان، وێنەیان لەسەر دیواری ئەشکەوتان دەکێشا، بەلەمیان هەبووەو بە پێیان چوونەتە دەریاکان. توانیویانە خوری بڕیسن و پارچەو تیتۆڵیش بچنن. مردووەکانی خۆیان دەناشت و قەبرەکانیان هەنووکە لە زۆر شوێنی هیند هەن و بەرچاو دەکەون. هیندێک جار تەرمی مردووەکانیان لە شەراب خستووە و زۆرێک لەو شەرابانە لە ئەنجامی هەڵدانەوەکاندا دۆزراونەتەوە. جۆرێکی دیکەی ئەو قەبرانە کە بە دۆلمێن١٧ بەناوبانگن، کۆڵەکەیەکی بەردی و لەشێوەی بازنەییدا دروست کراون و لەچەندین شوێنی دیکەی جیهانیش کۆمەڵێک گۆڕی لەم چەشنە دۆزراونەتەوە.



وێنەی قەبرە دۆلمێنییەکان

زۆرێک لە توێژەران لەو باوەڕەدان خەڵکی چاخی بەردینی نوێی هیند لە تۆرەمەی خەڵکانی چاخی بەردینی کۆن بن، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە هیچ پەیوەندییەکی رەگەزی لەنێو خەڵکی ئەم دوو چاخەدا نەبوو‌بێت و تەنیا بۆ ماوەی زەمەنییەکی دووروودرێژ لە دوو سەردەمدا ژیابن.

لە چاخی کانزادا، هەمان خەڵکی چاخی بەردینی نوێبوون کە فێری زانستی تواندنەوەو دروستکردنی کەرەسەی کانزایی بوون. ئەم وەرچەرخانە لە بەردەوە بۆ کانزا زۆر بەخاوی تێدەپەڕ دەبوو و بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ کەرەسەی بەردی و کانزایی کاریان پێدەکرا و تەنانەت شکڵی یەکەم کەرەستە کانزاییەکان، هاوشێوەی کەرەستەی بەردیی چاخی نوێی بەردین بوون. لە باکووری هیند کەرەسەی مسی جێگەی کەرەسەی بەردیی گرتەوە و چەکی مسی دروستکرا و لەنێو خەڵکدا بڵاو بوونەوە.

پاش چەند سەدەیەک، چاخی ئاسنی لە هیند هاتەگۆڕێ و هێدی هێدی جێگەی مسی گرتەوە، بەڵام لەباشووری هیند، کە هێشتا لە چاخی بەردیندا مابۆوە، لەناکاو چاخی ئاسن هاتەگۆڕێ، بەبێ ئەوەی چاخی مس گەیشتبێتە ئەو ناوچەیە.

ئەم خاڵە هەتا ئیستاش جێگەی پرسیارە، کە ئایا ریگ ڤیدا، کۆنترین بەشی ڤیداکان، پەیوەندیی بە چاخی ئاسنییەوە هەیە یان بۆ چاخی مسی دەگەڕێتەوە؟ بەگشتی خەڵک پێیانوایە هێشتا چاخی ئاسن نەهاتبوو، کە ریگڤویدا هۆنراوەتەوە، بەڵام ریگ ڤیدا سەربە هەرکام لەم دوو چاخە بێت، گومانی تێدا نییە لە دۆڵی سێند لە چاخی مسیدا شارستانییەتێکی مەزن هاتە ئاراوە، کە هاوکات لەگەڵ پشکوتنی خۆی، بەشێکی بەرچاو لە وڵاتی هیندی خستەژێر رکێفی خۆیەوە. ئەم شارستانییەتە بەشارستانییەتی دۆڵی سێند ناوبانگی دەرکردووەو بۆ ناسینی فەرهەنگ و ئایینی خۆجێیی دۆڵی سێندی پێش هێرشی ئارییایەکان، ئەشێ بە وردی سەرنجی لێ بدرێت.

## شارستانییەتی دۆڵی سێند

لەماوەی چەند دەیەی رابردوواو لە ئەنجامی هەڵدانەوەی شوێنەوارە مێژووییەکانی دۆڵی سێند، کۆمەڵێک ئاسەواری ژێر خاکیی بەنرخ دۆزرانەوە. ئەو لێکۆڵینەوانە لەشوێنەکانی موهنجوو درو لەناوچەی لەرکەنە، لە هەرێمی سێند، هێرپا لەناوچەی مونتێمێگری لەپەنجاب ئەنجامدراون. ئەم هەڵدانەوە ئاسەوار ئاسییانەی دۆڵی سێند، بەلووچستان، پەنجاب و تەنانەت ناوچە دوورەکانیدیکەش لە رۆژهەڵات و باشوور، دەرخەری ئەوەن کە لە دەورووبەری چوار هەتا پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا کۆمەڵگەیەکی یەکجار پێشکەوتوو لەم ناوچەیە هەبووە، کە لەگەڵ شارستانییەتی میسر و میزۆپۆتامیا هاوکات بووە.

بەداخەوە بەڵگەیەکی نووسراوەی هاوشێوەی میسرو میزۆپۆتامیا لەسەر ئەم شارستانییەتە لەبەردەستدا نییە. تەنیا ژمارەی مۆر، کە چەند پیتێک لەسەریان هەڵکەندراوە، لەبەردەستدا هەن، بەڵام نەتوانراوە بە دروستی بخوێندرێنەوە. بەم پێیە مێژووی سیاسیی دۆڵی سێند لەو سەردەمەدا بەناروونی دەمێنێتەوە، تەنانەت بەدروستیش نازانین کە فەرهەنگ و شارستانییەتیان چی بووە.

زانیارییەکانی ئێمە بەنیسبەت ئەم چاخەوە تەنیا لە تاوتوێکردنی ئاسەوارە بەجێماوەکانیدا سنووردار دەمێنێتەوە، بەتایبەت ئاسەوارە بەجێماوەکانی مۆهێنجوو ـ دەرۆ و هەرەپا کە لە گرنگترین ئەو ئاسەوارانە دێنە ئەژمار.

مۆهێنجوو ـ دەرۆ ـ تەپۆڵکەی مردوان ـ ناوی ئەو شوێنەیە کە لە پێدەشتەکانی "لەرکەنە" هەڵکەوتووە. زەوییەکانی ئەو ناوچەیە یەکجار پڕ پیت و بەرەکەتە، کە ئێستا بە نەخلستان ناودێر کراوە. پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا لەو شوێنە شارێک درووستکرا و لە ماوەی چەند ساڵێکدا، حەوت جار هێرشی کرایە سەر و تێک رووخێنرا، سەرلەنوێ دروست و نۆژەن دەکرایەوە.

دوایین شار، شارێکی نیمچە گەورە بوو، کۆمەڵێک خانووبەرەی تێدابوو، لە خانووی دوو ژوورییەوە بگرە هەتا کۆشکی یەکجار گەورە، کە درێژایی ٢٦ میتر لە ٢٩ میتر و نیو پانایيان هەبوو، بینا کرابوون، دیوارەکانیان نزیک بە ١ میتر و نیو ئەستوربوون. بینای گەورە گەورە کە زۆربەیان لە دوو نهۆم بەرزتر بوون. رووکاری ژوور و نێو حەوشەکان خشتکاری کرابوون، هەر خانووبەرەیەک بیری ئاو، چاڵی زێرابی تێدابووە.

گەرماوی گەورەی شار بە گرنگترین بینای ئەو شارە لە قەڵەم ئەدرێت، کە چەندین داڵان و ژووری گەورەی تێدا هەڵکەوتووە، حەوزێکی گەورە لە ناوەڕاستی ئەو بینایە دایە. ئەو حەوزە ١٢ میتر درێژی و حەوت میتر پانایی هەیەو قووڵییەکەی دەگاتە ٤/٢ میترو لە هەر دوولاوە پێ پلیکانی هاتووچۆکردنی بۆ دانراوە و لە ڕێگەی بیرە ئاوێک، کە لە یەکێک لە ژوورەکاندا لێدراوە، ئاوەکەی دابین دەکرێ. ئاوەڕۆیەکی گەورەش بۆ کەلاوەکەی دروستکراوە. گەرماوی ئەو بینایە لە رووبەرێکی ٥٥ لە ٣٣ میتریدا دروستکراوە و دیوارەکانی دیوی دەرەوەی ٤/٢ میتر ئەستوورییان هەیە. ئەم بینایە بە چەشنێک قایم دروستکراوە کە پاش تێپەڕبوونی پێنج هەزار ساڵ هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووەو وەک خۆی ماوەتەوە.

شەقامەکانی نێو شار بەرین و بێ پێچ و پەنا دروستکراون و ئاوەڕۆی شارەکە بە شێوەیەکی ئەندازیارانە دەرچووە. بەگشتی ئەو شارە زۆر ڕێکوپێک دروستکراوە.

هەروەها دانەوێڵە، خورما، گۆشتی مەڕ، بەراز، ماسی و مریشک و هێلکە، خواردنی خەڵک و دانیشتوانی ئەم شارە بوون. پارچە و تیتۆڵی کەتانی و پەشم و خوری بۆ جلوبەرگ و هەروەها ملوانکە، ئەنگوستیلە و بازنەش بۆ جوانکاری کەڵکیان لێ وەرگیراوە، کە بە زۆری لە زێڕ و زیو، عاجی فیل، مس و بەردی گرانبەها دروستکراون.

سواڵت و گلێنەی سادە و رازاوە، بە چەرخ دروستدەکران و زۆر جاریش کاسە و کەوچکیش لە بەرهەمە کانزاییەکان دروست دەکران، بەڵام پێویستە

ئەوە لەبیر نەکەین، کە هێشتا ئاسن لەو سەردەمەدا نەناسرابوو، هەروەها شمشێریش دروست نەکرابوو. هونەر لەو ناوچەیە تا رادەیەک پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیبوو. ئەو وێنانەی کە لەسەر مۆر و پەیکەری هێرەپا دۆزراونەتەوە، ئاماژە بە پێشکەوتنی هونەری نیگارکێشی و پەیکەرتاشی لەدۆڵی سێند دەکەن.

لەنێوان دۆڵی سێند و سەرجەم ناوچەکانی دوور و نزیکدا، بازرگانی لە ئارادا بووە. قورقوشم، مس و بەردی گرانبەها لەدەرەوەی هیند دابین دەکرا.

## ئایین لەشارستانییەتی دۆڵی سێند

ئەو ئاسەوارانەی کەلە مۆهێنجۆ – دەرۆو دۆزراونەتەوە، ئاماژە بە هەبوونی ئایینی دۆڵی سێند، بەرلە هاتنی ئارییایەکان، دەکات. رێورەسمی دایکی خواوەند پانتایی خاکی ئەو ناوچەیەی تەنیبوو، کە هەبوونی رێژەیەکی زۆری پەیکەرە بچووکی ئیلاهەی دایک سەلمێنەری گشتگیربوونی ئەم ئایینەیە. سروشتییە ئەم رێورەسمە لەگەڵ ستایشکردنەکانی دواتر وێکچووی یەک نەبووبێتن، بەلام یەک ناوەرۆکیان هەبووە کە بریتی بوو لە : باوەڕهێنان بە وزەیەکی مێینە، کە سەرچاوەی هەموو ئافرێنەرانە. جیا لەمەش، لەم ئایینەدا خواوەندێکی نێرینە هەبووە. یەکێک لە مۆرە دۆزراوەکان وێنەی شیڤای لەسەر هەڵکەندراوە، کە بە حاڵەتی یۆگا دانیشتووە و ئاژەڵ و بوونەوەری کێوی بەشێوەی بازنەیی لە دەوری کۆبوونەتەوە. "شیڤا" لەسەر ئەم مۆرە سێ دانە سیمای شیاوی دیتنی هەیەو دوو دانە شاخیش لەملاو ئەولای کڵاوەکەیەوە هەن.

شیڤا بە مهایوگتین۲۳ بەناوبانگە، کە بە مانای یۆگاکاری مەزنە. هەروەها ناسناوی "پشتوپتیش"ی هەیە، کە بەمانای گەورەی ئاژەڵانە. سێ چاو و نێزەیەکی سێ سەری۲۵ هەیە. حاڵەتی یۆگا دانیشتنی لەسەر مۆرەکە لەگەڵ ناوبانگی مهیایوگین و هەبوونی ئاژەڵ و بوونەوەری کێوی لە دەوروپشتی لەگەڵ گەورەی ئاژەڵان یەکدەگرنەوە و بوونی سێ سیما و وێنەی سەر

مۆرەکە ئامـاژە بـە سـێ چـاویی شـیڤا دەکـات. تەنانـەت دوو شـاخی سـەر کڵاوەکەی دەتوانێ پەیوەندیی بە نێزە سێ سەرەکەیەوە هەبێت.

ئـەم وێکچوونـەی وێنـەی سـەر مۆرەکـە لەگـەڵ شـیڤا، وەک دۆزرانـەوەی پارچە بەردێک لە نێوان ئاسەوارەکانی ئـەو سـەردەمەدا سـەیر دەکرێت کە تەواو شێوەی shiva – Linga بیروباوەڕی هیندووەکانی ئەمڕۆ ئەدات.

جیا لە پەرستنی شیڤا و شکتی، تێکڕای بیروبـاوڕە دێرینـەکان، چ لـە پەیکـەری مرۆڤـدا و چ لـە شـکڵێکی هێماییـدا، وەک جانگـەرایی لـە دۆڵـی "سێند"دا دەبینرێن. پەرستنی بەرد، دار و ئاژەڵـەکان لـەم رووەوە کـە گۆیـا پێگـەی رۆحـە باشـەکانیان دۆزیوەتـەوە، بەشـێوەی پەرسـتنی "ناگـەها و یەکەشـەها" خویـا دەبـن و خۆیـان دەرئەخـەن. مۆوێهنجـۆ - دەرۆو، دەیـان ئاسەواری سەیر وسەمەرەی جانگەراییان (ئەنیمیستی) تێدا دۆزراوەتەوە.

کەوابوو، هیندوئیسـمی ئێسـتا کـە سـەرجەم نیشـانەی بـاوەڕە خۆجێییـە دێرینـەکانی پێـوە دیـارە، هـەتا رادەیـەکی زۆر منـەتباری فەرهـەنگی دۆڵـی سێندەو پەیوەندیی رابردوو و ئێستای هیند نیشان ئەدەن.



دوو پەیکەری شیوا

**ئەفسانە بەراوردکارییەکان و ئایینی لەهیند**

بە کەڵکوەرگرتن لە تاوتوێکردنی بەراوردکارانەی ئەفسانە و چیرۆکە حەماسییە دێرینەکانیش دەتوانین پەیوەندیی فەرهەنگی دۆڵی سێند و فەرهەنگی خۆجێیی بیابانەکانی ئێران و میزۆپۆتامیا بدۆزینەوە. روون و ئاشکرایە کە بڵاوبوونەوەی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا لە ناوەڕاستەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زایین، لەرێگەی بیابانەکانی ئێران، کەنداو و دەریای عومانەوە گەیشتۆتە دۆڵی سێند.

هیندێک لەچیرۆکی ئایینی و پەهلەوی ئێرانی و هیندی، کە مێژووەکەیان بۆ سەردەمی پێش ئارییەکان دەگەڕێتەوە، دەردەکەوێ کە بیابانی ئێران، بە تایبەت رۆژهەڵاتی ئێران و دۆڵی سێند، پەیوەندییەکی یەکجار قووڵیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە. دوو چیرۆکی ئەفسانەیی و حەماسیی رامە و سیاوەش لەو دەستە چیرۆکانەن کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووە. لەم دوو چیرۆکەدا لایەنی هاوبەش و وێکچوویان هێندە زۆرن، کە مرۆڤ بەسانایی تێدەگا، ئەو دوو چیرۆکە تاقە یەک سەرچاوەیان هەبووە. رامە، کە بە واتای رەنگی رەش دێت، لەگەڵ سیاوەشدا هەردووکیان لەگەڵ رەشایی - ژیانی ژێرزەوی - پەیوەندییان هەیە، هەرچەند "هەمرامە" لە هیند دەچێتە ژێرزەوی، بەڵام خودی رامە لە سەر زەوی دەمێنێتەوە. لەلایەکی دیکەوە هەر دوو چیرۆک، باوکی جوامێر جیا لە دایکی جوامێر، چیرۆکی هاوسەرێکی دیکەی هەیە، کە رێگری لە فەرمانڕەوابوونی جوامێر دەکا و جوامێریش بە ناچاری سەری خۆی هەڵدەگرێ.

خاڵی جێگەی سەرنج، سەفەری چواردە ساڵەی رامەیە، کە پێدەچی پەیوەندیی بەمانگی چواردەوە بێت. مانگیش، هەموو مانگێک، بۆ ماوەی یەک دوو رۆژ خۆی ون دەکات و دواتر خۆی نیشان ئەداتەوەو پاش چواردە رۆژ پڕ دەبێت. مانگ، رامەو سیاوەش، واتە هەرسێکیان پەیوەندییان بەزاوزێ و بەرەکەتەوە هەیە. رامە روو لە هەر شوێن و دەڤەرێک دەکات، ژێر پێی گژوگیای لێدەڕوێ و هەندێک جاریش بەخوێنی سیاوەش شین دەبن.

لەهەر دوو چیرۆکەکەدا گەڕانەوەی جوامێرێک بەدیدەکرێ. گەڕانەوەی کەیخوسرەو، کوڕی سیاوەش، لە تووران لەگەڵ گەیشتن بەدەسەڵات، لەخۆیدا هاوتای گەڕانەوەی جوامێر، یان پاڵەوانە لەچیرۆکە ئەسڵییەکەدا. رامە پاش چواردە ساڵ دەگەڕێتەوەو فەرمانڕەوایی دەگرێتەدەست. کوژران و چوونە ژێرزەوی لەهەردوو چیرۆکدا بەرچاو دەکەوێ. سیاوەش لەتووران دەکوژرێ. لەهیند ئەم چیرۆکە بە شێوەیەکیدیکە دەگێڕنەوەو پێیانوایە، هاوسەرەکەی سیاوەش بەناوی سیتا بۆ ماوەیەک دەچێتە ژێر گڵ و پاشان دەگەڕێتەوە. لە هەر دوو چیرۆکدا هەر دوو شازادە لەگەڵ دوژمنێکی غەدار بە شەڕ دێن و شکستیان پێدێنن.

ئەم دوو چیرۆکە ئێرانی و هیندییە پەیوەندییان بە چیرۆکە کۆنەکانی دۆمۆزی ـ تەمووزەوە هەیە، کە لە خۆیدا ئاماژە بەپەیوەندیی فەرهەنگیی تێکڕای ناوچەکە دەکات.

دوو چیرۆکیدیکەی ئێرانی و هیندی، کە باس لە جۆرێک بەستێنی هاوبەشی خۆجێیی فەرهەنگیی نێوان بەشی رۆژهەڵاتی بیابانی ئێران و دۆڵی سێند دەکات، بەشێک لە چیرۆکەکانی وینشوو و چیرۆکی ئارەشی کەمانگەرە لە ئێران. وینشوو خواوەندێک بووە، تەنانەت لە ریگ ڤیدای یەکەمدا باسی لێکراوەو ئەفسانەی بەناوبانگیش لەم بەشەدا پێوانی زەوی و ئاسمان بە سێ هەنگاو بووە. ئەم بابەتە، کە ئینسانە باشەکان بە سێ پلە زەوی و ئاسمان دەپێون و بەرەو بەهەشت دەچن، لە ئەفسانە ئێرانییەکانیشدا رەنگیداوەتەوە.

لە ئەسڵدا، وینشوو بەشێک لە هەتاو بووە، کە ئاماژەی بەهاتوچۆی خێرای هەتاو کردووە، کە لەسەر چیاکان ژیاوەو دواتر لەئەدەبیاتی پاش ریگ ڤیداکان، بە فەرمانڕەوای چیاکان ناودێر کراوە.

لە پووڕانە و حەماسەکانی دواتردا چیرۆکێکی ئەفسانەیی بوونی هەیە، کە گوزارشت لە وینشوو دەکات، کە لە ڤیداکاندا بەدی ناکرێت و پێدەچێ چیرۆکێکی دەشتەکی و خۆجێیی بێت، کە لەو سەردەمەدا بۆیان

هەڵبەستووە. چیرۆکێک، کە لەنێوان دوو سەردەمدایەو لە براهمنەکاندا بەدیدەکرێت. دواتر شێوەی مرۆڤی کورتیلەو فیسقەلی بەخۆوە دەگرێ، هەتا بتوانێ بەفێڵبازی و درۆ، زەویی لەدەستچووی خواوەندەکان لەچنگی ئەفسانەکان (لەم قۆناغەی ئایندا ئەفسانەکان بەهێزەکانی شەڕ ئەژمار دەکرێن) دەربێنێتەوە.

کاتی خۆی خواوەندەکان (Dēvas) لەشەڕکردن لەگەڵ دێوەکان (Asuras)شکستیانخوارد و زەوی لەژێر دەسەلاتی خواوەندەکاندا نەما. خواوەندەکان داوای وەرگرتنەوەی زەوییەکانیان لە دێوەکان کرد، دێوەکان قبوڵیان کردو پاشان خواوەندەکان وینشوویان کردە قوربانی و تێکڕای زەوی وەرگیرایەوە (چیرۆکی پێستەی مانگاو دەست بەسەرداگرتنی هەموو چیاکان بەپارچە پارچەکردنی ئەو پێستەیە) لەچیرۆکێکی دیکەدا باس دەکرێ، کە وینشوو بەچوونی خۆی بۆ ئاسمان زەوییەکە لە چنگی خواوەندەکان دەردێنێتەوە.

لەچیرۆکێکیدیکەداو لە یەکێک لەبراهمنەکاندا (ŚB. 14, 1, I) هاتووە، وینشوو بەخۆقوربانیکردن بووە بەناوبانگترین خواوەند، وەلێ بەهۆی کەوانەکەی خۆیەوە سەری پەڕی و بۆخۆی بوو بەهەتاو، بەلام وینشوو بەهۆی پەڕینی سەریەوە، زەویی لەدەست دێوەکان سەندبوەوە، گیانی لەدەستدا. دواتر لە ئارنییەکا، ئەشوینها کەپزیشکی خواوەندەکان بوون، سەری وینشوویان هینایەوە سەر جێگەی خۆی.

لە چیرۆکی ئارەشی کەمانگیرو چیرۆکی پێستە لەتلەتکراوەکان و وەرگرتنەوەی زەوی، لە چیرۆکەکەی وینشوودا بەدیدەکرێ. ئارەش چووە سەر چیا بەرزەکان و بەهاویشتنی تیرێک بە کەوانەکەی، ولاتی ئێرانی لەژێر دەستی توورانییەکان دەرهێنا. نەبوونی ئەم چیرۆکانە لە کتێبی ڤیداکان و هاتنە ئارای ئەم چیرۆکانە لە براهمنەکاندا کە پڕاوپڕ لە ئەفسانە و چیرۆکی دەشتەکی و خۆجێی و هەروەها هاتنە ئارای ئەم چیرۆکانەیە لە ئەفسانە

ئێرانییەکانـدا، نیشـانەی پەیوەنـدیی ئەفسـانە خۆجێیـەکانی دۆڵـی سـێند و ئێرانە، کە مێژووەکەی بۆ پێش هاتنی ئارییاییەکان دەگەڕێتەوە.

نموونەیەکیدیکـەی پەیوەنـدیی فەرهـەنگیی خـۆجێیی ئێـران و فەرهـەنگی بەشـکۆ و دێرینـی میزۆپۆتامیـا پـێش هـاتنی ئاریاییـەکان بـۆ دۆڵـی سـێند، گۆڕانێکی یەکسان لەنێوان ئەفسانە ئارییاییە هیندوەکانی دۆڵی سیند و پـێش هاتنی ئارییان و ئەفسانە ئێرانییەکانی پاش هاتنی ئارییاییەکان بووە.

ئێسـتا زۆر کـەس لـەو بـاوەڕەدان ئەفسـانە سـەرەتاییەکانی کتێبـی ڕێـگ ڤیـدا، ئامـاژە بـە ئەفسـانە ئاریاییـەکان دەکـەن. کـە سـوێند خـواردنی میتانییەکان (چینی باڵادەستی ئارییاییەکان حۆریها لە بـاکووری میزۆپۆتامیـا لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمدا) ئەم ئیدیعایە پشتڕاست دەکاتـەوە، واتـە ئێرانییـەکان و ئاریاییـەکانی هینـد، پـێش جیابوونـەوەی خواوەنـدەکان، کۆمەڵێک ئەفسانەی هاوبەشیان هەبووە، کە لە کتێبـە سـەرەتاییەکانی ریـگ ڤیدا، چەند ئاسەواریکیان بەرچاو دەکەوێت.

لەم ئەفسانە هیند و ئێرانییانەدا (ئاریائی) دوو دەسـتە خواوەنـدی وەک: ئەسـوورەکان و دێوەکـان لەهینـد، هـەروەها لـە ئێـرانیش ئـەهوورەکان و دەئیوەکان یان دێوەکان، بوونیان هەبووە. ئەسوورە / ئەهووەکان زیـاتر بیـر لەبابـەتی مەعنـەوی و هـەروەها دێوەکـان زیـاتر بیـر لەپرسـە جیهانییـەکان دەکەنەوە.

پاش هاتنی ئارییاییەکان بۆ دۆڵی سێند لەبیابانەکانی ئێران، ئـاڵوگۆڕێکی هاوبەش لـە ئـایینی هینـدووە ئاریاییـەکانی و ئاریاییـەکانی ئێرانـدا پێکهـات. لەهەر دوو وڵاتدا دوو دەستە خواوەندی چاکە بەسەر دوو دەسـتە خواوەنـدی چاکە و خراپەدا، دابەش دەبن. ئەم گۆڕانە بەرهـەمی کاریگەرییـەکانی ئـەوان لەسەر یەک نەبووە، چونکە ناولێنانی ئەو دوو دەستەیە لە هیند و ئێـران بـە پێچەوانەی یەکترن. لە هیند، ئەسورەو دێو و دێوەکان دەبنە خواوەنـدەکانی چاکە، لە ئێرانیش بەپێچەوانـەی ئـەهوورەکان، خواوەنـدەکانی دێـو و چاکـە، دبنە خواوەندی شەڕ و خراپە.

وەک ئاشکرایە، پیویستە قبوڵ بکەین کە لە بیروباوەڕی خۆجێی هیند و ئێرانییەکان پێش خواوەندەکانی خێر و شەڕ بوونیان هەبووەو پاش ئاوێتەبوونی فەرهەنگە خۆجێییەکان، لەگەڵ ئارياييەكاندا بووە هۆی دابەشبوونێکی نوێی جیهانی خواوەندەکان و دژە خواوەندەکان. پێویستە لەبیر نەکەین، کە ئەم دابەشبوونە نوێیە لەهیند و ئێران، پێشینەیەکی دوورودرێژتری لە میزۆپۆتامیاو فەرهەنگی ئاسیای رۆژئاوادا هەبووە، کە لە درێژەدا دەپەرژێینە سەری و باسی لێدەکەین.

## بنەمای بیربـاوەڕی ئوستوورەکانی میزۆپۆتامیـا و بڵاوبوونەوەیان لەئێران و هیند

بەپێی ئەفسانە میزۆپۆتامیاییەکان، کە لەسەردەمی سۆمەری (دەسپێکی هەزارەی چوارەمی پێش زایین) هەتا سەردەمی هەخامەنشی (سەدەی شەشەمی پێش زایین) و تەنانەت پاش ئەویش، کاریگەریی لەسەر تێکڕای فەرهەنگ و بیروباوەڕی ئاسیای رۆژئاوا، بیابانەکانی ئێران و تەنانەت دۆڵی سێندیش بووە، دوو دێو - ئەژدیها یەکەم بەناوەکانی تیامت (ژن، فەرمانڕەوای ئاوە سوێرەکان) ئەپسوو (پیاو، فەرمانڕەوای ئاوە شیرینەکان) کە هاوسەری یەکتربوون و یەکیان فەرمانڕەوای ئاوە شیرینەکان و ئەویدیکەشیان فەرمانڕەوای ئاوە سوێرەکانی دەکرد، هاوکات دایک و باوکی خواوەندەکانی خێر و شەڕیش بوون.

بەپێی ئەفسانە دێرینەکانیدیکە، ئەپسوو دەچێ ئەنکی دەکوژێ و بۆخۆی فەرمانڕەوایی ئاوە شیرینەکان بەدەستەوە دەگرێ. ئەنکی یەکێک لە خواوەندە مەزنەکانی سۆمەرییەو یەکێک لە خوڵقێنەرانی مرۆڤیش بووە. ئەنکی لەهەزارەی دووەمی پێش زاییندا، دەبێتە خواوەندی مەزن و یەکسانی، هەروەها فەرمانڕەوایی و خوڵقاندنی ئینسان بەدەستی ئەو دەبێ و هاوکات دۆستی ئینسانیشە. لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، کە هۆگریی یەکتاپەرستی لە رۆژئاوای ئاسیا پەرەدەسەنێ، مەردۆک

(مەردۆخ)، کوڕی ئەنکی، دەبێتە خواوەندی بابل و "تیامت" دەکوژێ و فەرمانڕەوایی جیهان بەدەستەوە دەگرێ و ئافراندنی جیهان بەدەستی ئەوە.

لە دەسپێکدا دێو - ئەژدیهایەک بووە، کە خواوەندەکانی خێر و شەڕی خولّقاندووە، پاشان خواوەندێک، یان چەند خواوەندێک دێو دەکەنە قوربانی، جیهان دروست دەکەن و فەرمانڕەوایی بەدەستەوە دەگرن.

هەندێک زانیاری لەسەر ئەفسانەکانی وڵاتانی ئاسیای ڕۆژئاوا، بیابانەکانی ئێران و دۆڵی سێند، تەنانەت یۆنانیش لەبەردەستن. لە یۆنان دوو دێو - ئەژدیهای یەکەم، بە ئورانووس URANUS ، ئاسمان و گایا (GAIA) ، ناودێر کراون، لە داوێنی ئەم دوانە، تیتانییەکانیدیکەی وەک: کرونووس (CRONUS)و هاوسەرەکەی (RHEA) کەوتنەوە. پێشبینی ئەوە کرابوو کە بەدەستی منداڵەکەی خۆی دەکوژرێ و زێئووس (ZEUS) باوکی خۆی لە فەرمانڕەوایی وەلا دەنێ و فەرمانڕەوایی جیهان بەدەستەوە دەگرێت.

پێدەچێ لەئەفسانە خۆجێییەکانی ئێراندا، کە لەسەردەمی ساسانییەکاندا، کە لەنێو خەڵکدا بەهێز و گشتگیر دەبێت، هاوکات زۆروانیش دوو منداڵی بەناوەکانی ئورمەزد و ئەهریمەن لەسکدایە. ئەهریمەن بەهەڵدڕینی منداڵدانی زۆروان، دێتەدەرێ، ئورمەزد جیهان دەخولّقێنێ و ئەهریمەنیش بۆ ماوەی نۆ هەزار ساڵ فەرمانڕەوایی تێدا دەکات، پاش ئەو نۆ هەزار ساڵە، ئورمەزد دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێ. ئورمەزد ئافرێنەری خواوەندەکان و ئەهریمەنیش ئافرێنەری دێوەکان بووە.

لە کۆتاییەکانی سەردەمی ریگ ڤیدایی سەرەتادا لەهیند، کە هێمای ئەفسانەی ئاریایی (هیند و ئێرانی) بوو، تەنیا دوو دەستە خواوەند بەدیدەکران، کە لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی خۆجێیدا بوون، کە لە ئاسیای ڕۆژئاواوە ڕەگاژۆی کردبوو، دوو دەستە خواوەندی خێر و شەڕ دێنەئاراوە.

لەهیند، خێرو شەڕ بەشێوەی دوو دەستە (DÉVA) و ئەسوورە (ASURA)، لە ئێرانیش بەشێوەی دوو دەستەی (AHURA) و

دێئیـوە (DAEVA) خۆیـا دەبـن و تەنانـەت ئاسـەوارەکەی لەسـەر گاتاکـانیش بـەدی دەکرێت. وەک دیـارە لـە هـەر دوو وڵاتـی هینـد و ئێـران، ئاریاییـەکان لـە سـەرەتای هـەزارەی یەکـەمی پـێش زاییـندا، کەوتنـە ژێـر کاریگەریی ئایینە خۆجێیەکان، کە گرێدراوی فەرهەنگی میزۆپۆتامیـایی بـوو. ئەم کاریگەرییە لەناوەڕاستەکانی ریگ ڤیدا و گاسا (گاتا) بەملاوەو تەنانـەت لە بەردەنووسەکانی هەخامەنشیدا دەبینرێ، کە ئەمە لەخۆیدا یەکێکیدیکە لە چۆنایەتییەکانی شارستانییەتی خۆجێیی هیند و ئێرانییەکانە، هـەروەها وەک بنەمای بیروبـاوەڕی ئـایینی ڤیـدایی هینـد و ئـایینی زەدەشـتیی ئێرانییـەکان سەیر دەکرێت.

## هیند و ئەوروپاییە سەرەتاییەکان

بۆ ناسینی سـەرچاوەی هینـد و ئەورووپاییـەکان و پێشـینەی فەرهـەنگ و شارستانییەتەکەیان، دوو کەرەسە لەبەر دەستدان. یەکەم زمان و ئەفسـانەی هـۆزە هینــد و ئەوروپاییــەکان، کــە تیایــدا لایەنــە هاوبەشــە زمــانی و فەرهەنگییەکان رەنگیان داوەتەوە، دەتوانن بەرەو ناسینی کۆمەڵی سەرەتایی هیند و ئەورووپاییـەکان رێنوێنیمـان بکـەن. بـەم فاکتەرانـە دەوتـرێ بەڵگـەی شاراوە. دووەم ئاسەوارە مێژووییەکانن، کەلـە ئـەنجامی هەڵدانـەوەی شـوێنە مێژووییەکانـدا دۆزراونەتـەوەو ئەگـەر تـاوتوێ بکـرێن و لێیـان بکۆڵدرێتـەوە، لایەنــە شــاراوەکانی ژیــانی مــادی و هەنــدێک جــار مەعنــەویی هینــد و ئەورووپاییەکان لەچاخەکانی دێریندا ئاشـکرا دەبـن. بـەم فاکتەرانـە دەوتـرێ بەڵگەی ئاشکرا.

لە ئەنجامی کۆبەندیی ئـەم بەڵگانـەدا دەتـوانین بـاوەڕ بکـەین، کـە هـۆزە هیند و ئەورووپاییە سەرەتاییەکان، کەلە زانستی ئاسەوارناسیدا بە کورگـان ناودێرکراون، لە پێدەشتەکانی باشـووری روسـیا، ناوچـەکانی رۆژهـەڵات و باشووری دێنێپر، باکوور قەفقاز و رۆژئاوای چیاکـانی ئۆراڵـدا ژیـاون. بـەپێی لێکارییە زمانناسی و ئەفسانەییەکان، ئەو ناوچانە ئاو و هەوایەکی وشـکیان

هەبووە. هاوینان گەرم و باراناوی، زستانانیش هەوایەکی ساردی هەبووە و هاوکات بەفرێکی زۆریشی لێ باریوە. بە سەرنجدان بەوەی کەلە هیچکام لەزمانە هیند و ئەوروپاییەکاندا وشەی دەریا بوونی نییە، رەنگە چۆمە گەورەکانی روسیا و ئۆکراین وەک: دۆن، ڤۆڵگا و دینێپر، هیند و ئەوروپاییەکانیان سنووردار کردبێت و رێگریی لە هاتوچۆی ئەو هۆزانە کردبێت.

هیند و ئەوروپاییە سەرەتاییەکان لە رەهەندی ئابووری و پێشکەوتنی زانستییەوە، لەقۆناغی نێوان چاخی بەردینی نوێ و چاخی حەوت جۆشدا ژیاون، کە بە چاخی Chalcolithic ناودێر کراوە. ئەوان تەنیا یەک جۆر کانزایان ناسیوە، بەڵام پێدەچی بۆخۆیان بەرهەمیان نەهێنابێت. ئەم کانزایە مس بووە و وشەی ( roudhos* کوردی = رۆح)یان بۆ دیاریکردبوو، کە پێدەچێ ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەری و لە رێگای ئاڵوویر و بازرگانی لەگەڵ ئەو وڵاتە وەریان گرتبێت. ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا (u) urudبووە. دروستکردنی چەکی جۆراوجۆر بەشێک لە بەرهەمەکانی ئەوانی پێکدەهێنا. گورز، قەڵماسک، تیر و کەوان، نێزە و خەنجەر ئەو چەکانەبوون، کە دروستیاندەکردن. جووت و گا و ئاژەڵداری سەرچاوەی خواردەمەنی و بژیوی ژیان بوو. راوکردن گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. پێدەچێ کەرەسەی جووتکردنیشیان بووبێت. ئاژەڵە سەرەکییەکان بریتیبوون لە ئەسپ *ekwa یان *ekwo کە زیاتر بۆ راکێشانی بار و خێشک کەڵکیان لێوەرگرتووە هەتا سواری. مەڕ(Owis*) ، بەراز(Sus*) ، بزن (aig*) و مانگا (gwou*) ئامازە کردن بە مانگا و کارکردن بە مانگا، کە لەئەفسانە هیند و ئەرووپاییەکاندا بەجێماون، لێکۆڵەرانی هێناوەتە سەر ئەو قەناعەتەی کە مانگا گرنگترین کارکرد و رۆڵی لەلای هیند و ئەورووپاییە سەرەتاییەکان هەبووە و بەخێوکردنی مانگا بایەخی لەجووت و گا زیاتر بووە.

سەبارەت بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ئەم کۆمەڵگەیە تیۆری و بۆچوونی جۆرج دۆمزیل لەهەموو بۆچوونەکانیدیکە باوترە. بەپێی ئەو تیۆرییەی دۆمزیل، لەدەسپێکی دوایین بڵاوبوونەوەی هۆزە ئارییاییەکاندا، (٢٥٠٠ ساڵ پێش زایین) هیند و ئەورووپاییەکان لەسێ چینی کۆمەڵایەتی پێکهاتبوون. هەروەها بەپێی بەڵگە زمانناسییەکان، دەردەکەوێ کە جۆرێک پاشاگەردانی لەنێویاندا باوبووە و پاشایان بە رێگ (reg*) ناودێر کردووە. هەرچەند زانیارییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە چۆنییەتیی فەرمانڕەوایی رێگ و ئەو یەکە کۆمەڵایەتییەی کە ئەو بەسەریاندا دەسەڵاتی هەبووە، لەبەردەستدا نییە.

لە قۆناغی کورگان II ٣٥٠٠ هەتا ٣٢٠٠ ساڵ پێش زایین ئەم فەرهەنگە کە بەسەر چەندین ناوەندا دابەش ببوو، بەهەموو ناوچە و شوێنە جیاجیاکان رەگاژۆی کردبوو، ئاسەوارەکانی ئەم قۆناغە پەرەگرتنەی هیند و ئەورووپاییەکان، کە بەکورگان IIبەناوبانگە، لە ئەورووپای ناوەندییەوە هەتا ئاسیای ناوەڕاست بەدیدەکرێ. پێدەچێ ئەم قۆناغە هاوکات بووبێت لەگەڵ دوایین قۆناغی یەکگرتنە زمانییەکەیان، ئەگەر هیچ کاتێکیش یەکگرتنێک لە گۆڕێدا نەبووبێت.

ئەم فەرهەنگەی چاخی بەردینی نوێ، کە رەنگە لە ئەنجامی چەند شەپۆلێکدا بڵاوبووبێتەوە، لە رۆژهەڵات، لەسیبریا، بۆ بەشی لای سەرووی چۆمی ینیسی، بەتایبەت بۆ ناوچەی مینوزینسک رەگاژۆی کرد و لە چاخی حەوت جۆشدا زیاتر بڵاوەی کرد.

چاخی حەوت جۆش لە سیبریا، واتە لەهەمان بەشی سەرووی چۆمی ینیسی، بە فەرهەنگی "ئافاناسیۆڤ" دەست پێدەکات. لەم فەرهەنگەش، وەک فەرهەنگەکانی پێشووی هیند و ئەورووپایی، تەنیا قەبرەکانیان ماونەتەوە. قەبرەکانی پێشتر پان و تەخت بوون و دەورەکەیان بەشێوەی بازنەیی بەردەچن کرابوو، کە ئەمەش ئاماژە بەپەیوەندیی نێوان ئەم فەرهەنگە و پەرستنی هەتاو دەکات، بەڵام قەبرە نوێیەکان تەپکێکی بەرزیان هەیە و هەروەها دەورەکەشیان بەشێوەی بازنەیی بەردەچن کراوە.

فەرهەنگی ئەندرۆنۆڤۆ لەباکووری دەریای ئاراڵ و نێوان لقەکانی باشووری چۆمی ئۆب هەڵکەوتووە، ئەم فەرهەنگە کە جێگەی فەرهەنگی حەوت جۆشی "ئافاناسیۆڤ" دەگرێتـەوە، مێژووەکـەی بـۆ هـەزارەی سـێیەم هـەتا هـەزارەی یەکەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، کە هەر لە دەسپێکەوە بە تەوژمیکی بەهێز لەئاسیای ناوەڕاست و باشووری سیبریادا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام ناوەنـدی ئـەو فەرهەنگە لەناوچەکانی باشووری رۆژئاوای سیبریا و قازاقستان دەمێنێتـەوە. بەقوڕ دروستکردنی ماڵ، ئاماژە بە نیشتەجێبوونی یەکجارەکی و پـەرەگرتنی جووت و گا، لەو ناوچانە دەکات. هاوکات ئاژەڵداریش برەوی هەبووەو چـەک و کەرەسەی کانزاییشیان بەکارهێناوە.

پێدەچێ بەهۆی ئەو گوشارانەی کە لەلایەن باکووری رۆژهەڵاتەوە خرابێتە سەریان، یان رەنگە بەهۆی پەرەگرتنی ئاژەڵداری، یان بەپێی بۆچوونی ئیبن خەلـدوون، بـەهۆی جیرانـەتیی ئـەم هـۆزە هەژارانـە لەگـەڵ هـۆزە دەوڵەمەندەکانی باشوور، یان لەبەر هەموو ئـەم هۆکارانـە، بەشـێکی بـەرچاو لەدانیشـتوانی ناوچـەکانی سـەربە فەرهـەنگی ئۆنـدرۆنۆڤۆ روویـان لەباشـوور کردبێت، ئەمەش لەخۆیدا بووە هۆکاری جێگۆڕکێ و تێکەڵبوونی ئەو هۆزانـە لەگـەڵ یـەکترو لـە ئاکامـدا، لەباشـوور، فەرهـەنگی ئۆنـدرۆنۆڤۆ تێکـڕای ناوچەکانی باشوورو رۆژهەڵاتی قازاقسـتان و وڵاتـی قێرقیزسـتانی ئێسـتای و دۆڵی بەرفراوانی فرغانەی تەنییەوە.

ئەم فەرهەنگـە دواتـر بـەرەو دۆڵـی چـۆمی وەخـش، یـەکێک لـە لقـەکانی دەریـای ئـاموو، رەگـاژۆی کـرد. لـە دۆڵـی بیشـکەند، لـە رۆژئـاوای چـۆمی کافرنهان لە تاجیکستان، گۆڕستانێک دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی بـۆ چـاخی حـەوت جـۆش ئۆنـدرۆنۆڤۆیی دەگەڕێتـەوە. لـەم گۆڕسـتانەدا مـردووی سـێ ئایینی جیاواز نێـژراون، کـە لـەدوو ئایینیانـدا هـیچ ئاسـەوارێکی سـووتاندنی مردووەکان نابینرێت، بەڵام لە جۆری سێیەمدا مردووەکە بەپێی رێوڕەسمێکی تایبەت سووتێنراوەو پاشان خۆڵەمیشەکەی لـەگۆڕنراوە. گۆڕەکـان کۆمـەڵێک هێمـاو نیشـانەی هـەتاویـان پێوەیـەو ئەمـەش ئامـاژە بـە چـوونی فەرهـەنگی ئۆندرۆڤۆ بۆ ئەو ناوچەیە دەکات. پێویستە بوترێ کە رێوڕەسمی سـووتاندنی

مردووەکان، لەنێو هۆزە هیند و ئەورووپاییەکانی چاخەکانی دێرین، وەکو سکاندینافی و یۆنانییەکاندا، بەدیدەکرێت.

لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین، جێگۆڕکێیەکی بەرین لە پێدەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو باشووروو بەرەو لای تورکمانستان و ئەفغانستان و پاشان لە هیند و ئێران دەستی پێکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو هۆزانە لە١٢٠٠ ساڵ پێش زایین بەرەو دۆڵی سێند و لەسەدەی دەیەمی پێش زایینیشەوە بەرەو پێدەشتەکانی ئێران دابگەڕێن. هەر لەم کاتەدا جموجۆڵێک لە باکووری قەفقاز هاتەگۆڕێ و لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین، سەرمەشقە فەرهەنگی و مێژووییەکان لە رۆژئاوای پێدەشتەکانی ئێران گۆڕانیان بەسەردا هات و ئەو هۆزانەی کە بەزمانە هیند و ئەورووپاییەکان دەئاخاوتن، یەک لەدوای یەک هاتنەگۆڕێ و هەرکامەیان بۆ خۆی دەوڵەتێکی کاتیی دادەمەزراند و لەناو دەچوو. ئاندرۆنۆڤۆیی دەوڵەتی میتانی یەکێک لەو گرنگترین هۆزانە بوو، کە لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین بەسەر باکووری میزۆپۆتامیا و بەشێک لە زاگرۆسدا دەسەلاتیان هەبوو. ئەم هۆزانە کاتێک گەیشتنە هیند و ئێران، خۆیان بە ئاریایی ناساند، کە بۆخۆیان بەشێک لە هیند و ئەورووپاییەکان بوون.

جیا لەئارياییەکان، هۆزەکانی وەک: سلافییەکان، ئەڵمانییەکان، یۆنانییەکان، رۆمییەکان، ئالبانی و سێلتەکان، ئەو هۆزانەبوون، کە هۆزە هیند و ئەورووپاییەکانیان پێکدێنا.

## گەیشتنی ئاریاییەکان بەدۆڵی سێند

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئاریاییەکان لە دەوروبەری هەزار و دووسەد ساڵ پێش زایین گەیشتنە دۆڵی سێند و بەسەر خەڵکانی خۆجێیی ئەو ناوچەیەدا زاڵ بوون و بە تێپەڕبوونی زەمەن تێکەڵی ئەو خەڵکە بوون و لەگەڵ ئایینەکەیان زیاتر ئاشنابوون، ئەم هۆزانە بەچەشنێک تێکەڵی

یەکتربوون کە چیدیکە جیابوونەوە لەنێوانیاندا نەهاتەئاراوە و بە تێکەڵبوونی ئەمانە، هۆزێکی نوێ، بەشارستانییەتێکی نوێوە، دروست بوو.

تێکـەڵبوونی ئـەم دوو فەرهەنگـە خـۆجێی و ئارياييـە پێشـینەیەکی کۆنتریشی هەیە، ئەویش ئەو ئایینەیە کە فەرهەنگی هیند و ئەورووپایی لە قۆناغی کورگان II لەمیزۆپۆتامیای وەرگرتبوو. کەڵکوەرگرتن لە خێشکی چەرخدار و کەلوپەلی مسیی وەک: خەنجەر، تەورزین، شیشەی نووک تیژ، بازنەی مارپێچی کە لەناوچەکانی میزۆپۆتامیاو دەوروبەری دروستدەکران، تەنانەت گۆزەی گڵێنەی رەنگ سوور و بن تیژی فەرهەنگی مینوزیسنک، کە لاسـاییکردنەوەی ئاسـیای رۆژئـاوا بـوو، لەلایـەک و لەلایەکیدیکەشـەوە کەڵکوەرگرتن لە ئەسپ، لە فەرهەنگی میزۆپۆتامیادا کە ئاژەڵێکی خۆجێی باشووری رووسیا و سیبریا بوو، لەجێگەی گوێدرێژ، ئاژەڵی خۆجێیی و بارهەڵگری میزۆپۆتامیاو پێدەشتەکانی ئێران، لە هەزارەی دووەمی پێش زایین، ئاماژە بەهەبوونی پەیوەندییەکی یەکجار کۆنتری نێوان هیند و ئەورپاییەکان و فەرهەنگی میزۆپۆتامیا دەکەن. بەدڵنیاییەوە هیند و ئێرانییەکان (ئارياييەکان)یش بەناسینی تەواوی ئەم فەرهەنگە، بەرەو دۆڵی بەرفراوانی سێند و پێدەشتە بەرینەکانی ئێران رۆیشتوون.

## ئایینی ئاریياييەکان، ڤیداکان

سـوێندنامەی میتانییـەکان بـە کـۆنترین ئاسـەواری ئـایینی ئارياييـەکان دادەنـدرێت، کەرلـە بۆغـازکۆی ئاسـیای بچـووک و لەسـەر بەردەنووسـێک دۆزراونەتەوە. میتانییەکان، کە هۆزێکی ئاریایی بوون، لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین، لەرێگەی قەفقازەوە بەرەو ئاسیای بچووک بەرێکەوتن، لەوڵاتی حورییەکان، لە باکووری ئاشوور، دەوڵەتێکیان دامەزراند و لەگەڵ پاشای حیتی (هیتی)یەکان بە شەڕدەهاتن و لەگەڵ فیرعەونەکانی میسریش پەیمانی دۆستایەتییان هەبوو.

له سوێندنامەکاندا باسی میترە ـ ڤروونە، ئیندرە و دوو ناستیە کراوە. لەم ریزبەندییەدا، میترە ـ ڤروونە هەمان ئەو دوو خواوەندەی فەرمانڕەواو رۆحانیی ئارياييەکان لە کۆنترین بەشی ڤیداکان (کتێبی پیرۆزی ئاریاییە میندییەکان)ـە، کە خواوەندی مەزن، ڤروونە و میترەی لەگەڵدایە. ئیندرە خواوەندی جەنگاوەریش لە سوێندنامەکاندا لەپاش ڤروونە و میترە لە پلەی دووەمدا دێت کە فەرماندەیی شەڕی جیهانیی خواوەندەکانی بە دەستەوە. دوو ناستییەکانیش کە هێمای بەرهەمهێنانن، ناویان لە بەشی کۆنی ڤیدایی ئەشویندا هاتووە. سوێندنامە میتانییەکان بەڵگەی سەلمێنەری کۆنترین بەشی ڤیداییەکانن و دەریدەخەن کە هیند و ئێرانییەکان لە ١٥٠٠ ساڵ پێش زایینەوە، پێش داگەڕان بەرەو هیند و ئێران، ئایینێکیان هەبووە کە لەنێو کۆنترین ڤیداکان، بەتایبەت لە سوێندنامە میتانییەکاندا، ئاماژەی پێکراوە.

لەلایەکیدیکەوە دابەشکردنی خواوەندەکان لەسەر بنەمای گەلاڵەی سوێندنامە میتانییەکان و کۆنترین بەشی ڤیداکان، راستیی بۆچوونەکەی جۆرج دۆمزیل بیرمەندی زماناناس و کۆمەڵناسی فەرەنسی دەسەلمێنێت.

ئەم بۆچوونە لەسەر بنەمایەکی شیکاریی بەراوردکارانەی (مێژوویی، کۆمەڵناسانە، بنەماناسانە و ئایینی)ی ئەفسانەکانە، هەرچەند بەتەنیا پرژاوەتە سەر ئەفسانە هیند و ئەورووپاییەکان، بەڵام دەکرێ گشتگیر و بڵاوببێتەوە. دۆمزیل لەو باوەڕەدابوو، هۆزە هیند و ئەورووپاییەکان میراتێکی هاوبەشیان هەبووە، ئەگەر لە رێگەیەکی دروستەوە بۆی بچین، دەکرێ ئەم میراتە تاوتوێ و شیبکرێتەوە. دواتر هاتەسەر ئەو قەناعەتەی کە ئەفسانە هیند و ئەورووپاییەکان پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و بناغەی هاوبەشی هۆزە هیند و ئەوروپاییەکاندا هەیە .

دۆمزیل پێیوابوو ئەفسانەی هیند و ئەورووپاییە سەرەتاییەکان، ئەفسانەی بەرایی نین و ئاماژە بەکۆمەڵگەیەک دەکەن کە پێکهاتەیەکی دیاریکراوو رێکخراوی سیاسیی پشت ئەستوور بەوەرزێری هەیەو لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێش زایین لەگەڵ شارستانییەتی پێشکەوتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و میزۆپۆتامیادا پەیوەندییەکی قووڵیان هەبووە. دۆمزیل رایگەیاندووە کە لەنێو دابونەریتی هیند و ئێرانییەکان، بەتایبەت هیندی، رۆمی و ئەڵمانی نیشانەی پێویست لەبەردەستدان بۆ ئەوەی بتوانین

ئایدیۆلۆژییـەکی تۆکمـەی سێ بەشـی، کـە تێکـڕای ئەزموونـە (فەرهـەنگی، کۆمەڵایـەتی، سیاسـی، ئـابووری و ئەفسـانەیی) هینـد و ئەورووپاییـە سەرەتاییەکان، لە دەسپێکەوە دروست بکەینەوە.

ئەم ئایدیۆلۆژییە سێ بەشییە، سێ ئـەرکی کـۆنی ئیلاهـی ـ کۆمەڵایـەتی لەخۆ دەگرێت:

١. فەرمانڕەواییـەکی دوولایەنـە، کـە ڕەهەنـدی جـادوویی و ڕەهەنـدی پەیمانی یان قەزایی لەخۆبگرێت.

٢. جەنگاوەری.

٣. بەرهەمهێنانی ئابووری.

هەر یەک لەم سێ ئەرکە، لەئاسـتی ڕێکخـراوە کۆمەڵایـەتی ـ سیاسـی و پێکهاتەی ئایینییەکان، یان ئەفسانەییەکاندا، دیاری دەکرا.

**پوختەی ئەو سێ ئەرکە:**

| ئەرکەکان | هیندی | ئێرانی (ئاڤێستایی) | ڕۆمی | ئەڵمانی (ئیسکاندیناڤی) |
|---|---|---|---|---|
| I- فەرمانڕەوایی دوولایەنە<br>٢.چینی کۆمەڵایەتی | وەروونە- میترە (براهمنە) | وەهوومەنە (بەهمەنە) ئەشە(ئاسروونان) | ژووپیتێر، دیوس‌فیدیوس | ئۆدین، تیر |
| II- جەنگاوەری<br>٢.چینی کۆمەڵایەتی | ئیندرە، مرووتها (کیشەتریە) | خێشەشرە وئیریە(شەهریوەر) (ئەرتشتاران) | مارس | سڤۆر |
| III- بەرهەمی ئابووری<br>٢.چینی کۆمەڵایەتی | ئەوشوینها و ئیلاهەی سەرەسوەتی (وەئیسیە) | (ئەمرداد)-(خورداد) ئەمرتات،هێئوروتات (واستریوشان) | کیرێنووس | نیڤۆرد، فێرەی و ئیلاهە فەریا |

بەم شێوەیە، ڕوون و ئاشکرایە کە ئـایینی کـۆنی ئاریـایی پەیوەندییـەکی قووڵی لەگەڵ هیند و ئەورووپاییەکان، هەیە.

ریگ ڤیدا لەپاش سوێندنامەی میانییەکان، بە کۆنترین بەرهەمی نووسراوەی هیند و ئێرانی ئەژمار دەکرێت. پێدەچێ نووسینی بەشێکی ریگ ڤیدا لەگەڵ نووسینی سوێندنامەی میتانییەکان، هاومێژوو بێت. (١٥٠٠ ساڵ پێش زایین)

بەگشتی ڤیداکان بە چوار بەرهەم دابەش دەکرێن، کە دابەشبوونێکی زیاتر بەدوای خۆیدا دێنیت. ئەو چوار بەرهەمە بەپێی زەمانبەندی بریتین لە: ریگ ڤیدا، سامەڤیدا، ئەتروە ڤیدا و یەجوور ڤیدا. هەتا ئەمڕۆش ریگ ڤیدا بە کۆنترین بەرهەمی نووسراوەی هیند ئەژمار دەکرێت .

ئەفسانە ڤیداییەکان لە کۆنترین بەشی نووسراوەکانی خۆیاندا، سەردەمێکی یەکجار کۆنی ئایین دەر ئەخەن، کە تیایاندا دیاردە سروشتییەکانی وەک (هەورە تریشقە، خۆر، مانگ و...) دەبنە خاوەن کەسایەتی و مرۆڤەکان دەیانپەرستن. ئەمەش بەکۆنترین قۆناغی ئایین ئەژمار دەکرێت، کە لە بەرهەمە ئەدەبی و ئایینییەکاندا باسی لێکراوە. بیروباوەڕی ئایینیی زۆربەی هیندووەکانی هاوچەرخی ئێمە بۆ ئەو قۆناغە دەگەڕێنەوەو ئەوەش بە تاقە ئایینی هیند و ئەورووپایی دادەندرێت، کە نەچوونەتە ژێر رکێفی یەکتاپەرستی. ئەفسانەکان بەشێوەیەکی هێندە روون دەتوانن پەیوەندیی خواوەندەکان بە جەستەیەکی مادییەوە نیشان بدەن، کە دەبێتە هۆی سەرسوڕمان. بۆ نمونە، ئووشەس کە خواوەندی بەرەبەیانە، جلوبەرگێکی تەسکی لەبەردایە. هەروەها ئەگەنی خواوەندی ئاگرە و کەسایەتییەکەی بە تایبەتمەندییەکانی ئاگرەوە پێناسە دەکرێت.

بیروباوەڕی ئەفسانە ڤیداییەکان لەسەر ئەم بناغەیە کە هەموو ئەو دیاردە سروشتییانەی بوونیان هەیە، گیانلەبەرن و پەیوەندییان بەخواوەندەوە هەیە. ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی پەرێشانیی رۆح، یان ئەگەر بتوانێ کاریگەرییەکی ئەرێنی یان نەرێنی لەسەر ژیانی ئینسان دابنێت، دەکرا لە چاخی ڤیداییدا لەلایەن خەڵکەوە سوژدەی بۆ ببردرێت. دەکرێ ئاسمان، زەوی، چیا، چۆم و گژوگیاکان وەکو خواوەند ستایش بکرێن،

هـەروەها دەكـرێ داوای یارمـەتی لـە ئەسـپ، مانگـا، باڵنـدە و ئاژەڵـەكانی دیكەش بكرێت. تەنانەت كەلوپەلەكانی وەكو تەپڵ، بەردی هاونـگ، چـەك و كەلوپەلەكانی تایبەت بە شەڕكردن كە بەدەست دروستكراون، دەكرێ هاوتای خواوەند ستایش بكرێن. ئـەم شـێوە سـەرەتاییەی ستایشـكردنی كەلوپـەل و دیاردە سروشتییەكان، لە ئایینی ڤیداییدا رەنگدانەوەیەكی كەمی هەبووە. لـە ئایینی ڤیداییدا ئینسانە شكۆمەندەكان خواوەندی راستـەقینەبوون، بـەڵام بـە یـەك جیاوازییـەوە، كـە ئـەمان مـەرگیان نـەبوو. ئەوانەشـی كـە نوێنـەر و ناسێنەری دیاردە سروشتییەكانن، بوونەتە خاوەن كەسایەتییەكی خواوەندی. كاتێك كە ناوی خواوەند، لەگەڵ سیمای راستەقینەی خۆی جیاوازی نـەبێت، پێدانی كەسایەتی و گەورەكردنەوەی كارێكی زۆر سەیر و سەمەرە نییە. بـەم پێیـــە دیئـــووس Dyaus، ئاســـمان، پـــەرتڤی prthivi، زەوی، ســـووریەsurya، هـــەتاو، ئوشـــسUsas، ســـپیدە، ناوەكانیـــان نـــاوی دیاردەكـانی سروشـت و هـەروەها نـاوی خواوەندێكـە. سـەبارەت بـە ئەگـەنی (ئاگر) و سۆمەSoma)، هۆم، دیـاریكردنی جـۆری كەسـایەتییەكەیان زۆر دوور لە سیمای سروشتیی خۆیان نییە، ئەگەر ناوی خواوەندێك جیا لە ناوی ئەو دیاردە سروشـتییە بێـت كـە تیایـدا دەسـەڵاتداری و خواوەنـدی دەكـات، ئـەوە بـە تێپـەڕبوونی كـات لەئەسـڵ و سـەرچاوەی سروشـتیی خـۆی دوور ئەكەوێتەوەو خەسڵەتەكانی ئینسان تیایدا بەگوڕ دەبێت. بۆ نمونە مەرووتها Marut)، تۆفان، لە ڕێبازی خۆیان لایان داوە، بەڵام وایووVayu) ، با، بـەهۆی روونیـی پەیوەندییەكـەی لەگـەڵ بـا، گـۆڕانێكی ئـەوتۆی بەسـەردا نەهاتووە .

لەلایەكیدیكەوە گەورەكردنەوەی خواوەندە هیندییـەكان هـیچ كـات ناگاتـە ئاستی ئەم پێشكەوتنەی یۆنانییەكان و هیچ كات شكڵ و خەسڵەتی ئینسان بەخۆیانـــەوە نـــاگرن و زۆر لـــە خواوەنـــدەكانیش خـــاوەن خەســـڵەت و تایبەتمەندییـەكی هاوبەشـن، هـەروەها لـە ئەفسـانە ڤیداییەكانـدا شـكڵی خواوەنـدەكان نەخراوەتـەڕوو، بـەڵكو ئامـاژە بـە چۆنایـەتی و خەسـڵەتی خواوەندەكان كراوە.

## سەرچاوەی ئەفسانە ڤیداییەکان

ئێستاشی لەگەڵ بێت ریگ ڤیدا (کۆنترین بەرهەمی ئەدەبیی هیند) بەگرنگترین سەرچاوەی ئەفسانە ڤیداییەکان دادەندرێت. ئەفسانە ریگ ڤیداییەکان لەگەڵ هەندێک خواوەندی سروشت کەین و بەینیان هەیە. ئەم فرە خواوەندییە کە هێدی هێدی بەرەو یەکتاپەرستی دەڕۆیشت، لە کۆتاییەکانی سەردەمی ریگ ڤیداییدا خواستی تاقە خواوەندی، تیایدا گوڕ و تینێنێکی یەکجار بەهێزی بەخۆیەوە بینی. شیعرەکانی ریگ ڤیدایی بە سەرنجدان لە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی قوربانیکردن هۆنراونەتەوە، بەتایبەت ڕێوڕەسمەکانی پەیوەندیدار بەبەرهەمهێنان و خواردنی گیای سومە (هوم)، بەشێکی مەزن لە نووسراوە ئەفسانەییەکان دەخاتە بەردەست. خواوەندە مەزنەکان لە ڕێوڕەسمی قوربانیکردنی سومەدا جێگەیەکی تایبەتییان هەیە، بەڵام لە نووسراوەکانی ""ریگ ڤیدا"دا هۆنراوەی ئەفسانەیی سەبارەت بە رۆح، سیحر و ژیانی پاش مردن لە ریگ ڤیدادا نییە و کەسایەتیی ئەو خواوەندانەی کە لە ڕێوڕەسمی سوومەدا بەرشداری دەکەن، بە وردی شیکراوەتەوە، بەڵام هیچ ئاماژەیەک بە ئاکار و کردەوەیان نەکراوە، چونکە ئەم ئاکارانە پەیوەندییان بە ئایینی سومەوە نەبووە. وردەکاری و زانیارییەکان سەبارەت بە رۆح، سیحر و ژیانی پاش مەرگ تەنیا لەدوایین بەرهەمی ریگ ڤیداییدا بە شێوەیەکی نیوەچڵی دەخرێنەڕوو. ستایشکردنی رۆحی باب و باپیرانیش لە ئایینی ریگ ڤیداییدا جێگەیەکی تایبەتی هەیە.

ئەم ڤیدایە کە لەساڵانی نێوان هەزار و پێنجسەد هەتا هەزار و دووسەد ساڵ پێش زایین کاری نووسینەکەی دەستی پێکرد، هەزار و بیست و هەشت شیعری لەخۆگرتووە. دوو شێوە دابەشکردن لەم شیعرانەدا بەدی دەکرێن: یەکەم ئەوەی کە ریگ ڤیدا بەسەر هەشت بەشی هاوئەندازەی ئەشتکە دابەشکراوەو هەر بەشێکیش هەشت باس لەخۆ دەگرێت. دووەمیش، ریگ ڤیدا دابەشی دە فەسڵ کراوە، کە هەربەشێک پەیوەندیی بەهۆنراوەی جۆراوجۆرەوە هەیە.

پێکهاتەی Rigveda لە rik > rig بە واتای بریقە، سروودی پیرۆز Veda بە واتای خواناسی / زانستی پیرۆز، لە ریشەیVid ـەوە بەواتای زانین دێت، کە لەگەڵ وشەی "نەوید"ی ئێران یەک ریشەیان هەیە.

کتێبی دووەم ڤیدا، سامە ڤیداSamaueda ، هەمان هۆنراوە ریگ ڤیداییەکانی لەخۆ گرتووە، جیا لە حەفتا و پێنج هۆنراوە کە تایبەتن بە سامە ڤیدا، دەنا سەبارەت بە ئەفسانەکان گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە.

پێکهاتەی Samaueda دوو بەشی Saman و Veda لەخۆ دەگرێت، بە واتای تێگەیشتن لە سامە، تێگەیشتن لە کۆمەڵە شیعرییەکانی سامە. سامە بەمانای وتەی "خۆش" دێت.

کتێبی سێیەمی ڤیدا کە زۆر جار بە کتێبی چوارەم ناو دەبرێت، یجوروودا (Yajurveda)یە. مەکداول پێیوایە ئەم کتێبە دوایین ڤیدایە و لەڤیداکانیدیکە نوێترە و ئەتەروە ڤیداش بە وڵات ناو دەبات. ناوەڕۆک و دەربڕینەکەی شیاوی بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمەکانە و راستەوخۆ ئاماژە بەو خواوەندە ناکات کە لەو سەردەمەدا پەیوەندییەکی کەمڕەنگیان لەگەڵ ڕێوڕەسمی قوربانیکردندا هەیە. تاقە لایەنی بەرچاوی ئەفسانە ڤیداییەکان هەبوونی خواوەندێکی مەزنە بەناوی پەرجاپتی و گرنگیی زیاتری وینشوو و هاتنی خواوەندی دێرینی پێش ئارییەکانە بەناوی شیڤا. بەهۆی بارودۆخی لاوازی خواوەندەکان لەم ڤیداییەدا سەبارەت بە ڕێوڕەسمی قوربانیکردن، ئەم ڤیدایە هیچ بابەتێکی ئەفسانەیی تێدا بەدیناکرێت. "یجوروودا" لە دوو بەشی یجور و ودا پێکهاتووە. یجور لە وشەی yaj بەواتای ستایش و قوربانیکردن وەرگیراوە. یجوروودا پەیوەندیی بەتێگەیشتن و ناسینی دەقە پەیوەندیدارەکانی ڕێوڕەسمی قوربانیکردنەوەیە.

ئاتەروە ڤیدا دوایین کتێبی ڤیداییە کە بابەتی زۆر سەرنجڕاکێشتری تێدایە و بەگشتی پەیوەندیی بەلایەنی دەروونی و نەریتی سیحربازییەوە هەیە. دوایین بەشی ئەو کتێبەدا دنیایەک زانیاریی بەنرخی لەسەر جیهانی ڕۆح و دێوەکانی تێدایە. ئاتەروە ڤیدا لە بەشی پێشتریشیدا کۆمەڵێک

نووسراوی کۆنتری پەیوەندیدار بە سەردەمی پێش ریگ ڤیدای تێدایە. هەروەها گرنگترین ئاتەروە ڤیدا زانیاریی بەنرختری لەکتێبی ڤیدایی لەخۆگرتووە. کۆمەڵێک خواوەندی دیاریکراو لەئاتەروە ڤیدادا هزرێکی نوێ دەخەنەڕوو، زۆرێک لە مەسەلە فکرییەکان بەرەو پرسی ئایینی رۆیشتوون، ئەمەش لە حاڵێک دایە، کە ئایین شکڵی یەک خواوەندی بەخۆیەوە گرتووە. بەکەمی هۆنراوەیەک لە ستایشی خواوەندێکی تایبەتیدا بەرچاودەکەوێت. ئاتروە ڤیدا هیچ تایبەتمەندییەکی گرنگی ئەفسانەیی نییە کە لەو سێ کتێبەیدیکەدا بوونی نەبێت. ئاتروە پارێزەری ئاگرە. بەرهەمێکیش لەپاش سەردەمی ڤیداکان بوونی هەیە، کە مەودای نێوان ڤیداکان هەتا براهمنەکان پڕدەکاتەوە، کە ئەیتریە (Aitareya) و شەتەپتە (Satapatha) بەو دوو بەرهەمە گرنگە ئەژمار دەکرێن. لەم دوو بەرهەمەشدا قوربانیکردن بەچوارچێوەو گرنگترین رێوڕەسمی ئایین دادەندرێت.

هێشتا هەندێک خواوەندی بێگیان هەن و ماونەتەوە. هێشتا پەرجاپتی بەکەسایەتیی شکۆمەندی هاوچەشنی خواوەند - باوک دادەندرێت. یەکتاپەرستیی براهمنەکان لەم دوو بەرهەمەدا دیارو بەرچاوە. "هەموان" پەرجاپتی دەخوێننەوە.

خواوەندەکان، تایبەتمەندییە تاکە کەسییەکانی خۆیان لەدەستداوەو ئەو خواستەی هاتۆتە ئاراوە کە خواوەندەکان بەسەر چەند تاقمێکدا دابەش بکرێن، لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەم هێزە یان سروشتییانە بەسەر دوو تاقم بەناوەکانی دێوە (Deva) یان خواوەندەکان و ئەسوورەکان (Asura)کە هێمای شەڕن، دابەش دەکرێن. خواوەندەکانیش بۆخۆیان بەسەر سێ تاقمی: خواوەندەکانی سەرزەوی (Vasu)، فەزایی (Rudar)و ئاسمان (Aditya)، دابەشدەبن. زەقترین گروپی سێ قاقەیی لە ئاگر، با و هەتاو پێکدێت. لەم سەردەمەدا بەپێی ئەرکی لاوەکیی خواوەندەکان، بەرەوڕووی دابەشبوونێکیدیکەش دەبینەوە.

وشەی ئەیتریە لە ناسناوی سروودبێژەکانەوە وەرگیراوەو وشەی شەتەپتە، بەمانای سەد رێگە و ئامۆژگاری دێت.

شەتە = سەد، پتە = فارسی، پەند – رێگە.

## ئامۆژگاری

١. لەخوێندنــەوەی بەرهەمــە کۆنــە ئایینییەکانــدا پێویســتە ئــەم خاڵــە لەبەرچاو بگیردرێت کــە نــاکرێ بەچەشــنی بیرکرنــەوەی ئینســانیی ئــەمڕۆوە، بیرۆکەی ئایینیی سەردەمانی کۆن بناسیت. بۆ ئەم مەبەستە ئەشێ خۆمــان بێنینــە ســەر شــێوەی بیرکردنــەوەو ژیــان ئــەو ســەردەم و چۆنایــەتیی ئــەو ســەردەم بناســین، تــا بتــوانین وەک پــەیڕەوانی ئــایینیی ئــەو ســەردەم بیربکەینــەوە. بەدڵنیاییــەوە لەئێستاشــدا زۆر کــەس هــەن کــە دەتــوانن وەک ســەردەمانی کــۆن بیــر بکەنــەوە، بــەڵام نــاتوانن پرســە هەنووکەیــەکانی دەورووبەری خۆیان لەم سەردەمەدا تاوتوێ بکەن، چونکە دەستیان بــەئامرازو بنەما زانستی و عەقڵییەکانی سەردەم راناگات. بەبەرچاوتەسکیی زانستییەوە نــاتوانین بنیــاتی عــەقڵی و تێگەیشــتنی ســەردەمانی رابــردووی مرۆڤایــەتی بناسین و بەهەمان شێوە بە بەرچاوتەسکیی ئایینیشەوە ناکرێ شێوەی ژیان و عەقڵییەتی ئەمڕۆیی بناسرێت. بێگومــان بەرچاوتەســکی لــە زانســتدا تــەنیا بەواتای ناشیرینکردنی زانستە، دەنا لە زانســتی راستەقینەدا بەرچاوتەسکی مانایەکی نییە .

ئێمــە هەوڵــدەدەین بــەم ئــازادیی بیرکردنەوەیــەوە ئــاوڕ لــەمێژووی گۆڕانــە ئایینییەکان لەهیند بدەینەوە، وەلێ بۆ ناسینی گۆڕانی ئایین لە هیند، ئەشێ ناسیاویی تەواومان لەسەر دۆخی مەعنەوی و ماددیی ئەو سەردەمە هەبێت .

٢. فاکتــەرەکانی ئێمــە بــۆ لێکۆڵینــەوە لەدەســپێکدا بــریتین لــە: بەرهەمــەکانی پــێش ئارياييــەکان، ڤیــداکان و ئاســەوارە میژووییــەکانی ئــەو سەردەم کە لەنێویانــدا ڤیــداکان بــە گرنگتــرین ئاســەوار دادەنــدرێن. ڤیــداکان شــیعری شــاعیرانی لــەخۆگرتووە کــە لــە مــەتحی خواوەنــدەکان، رێورەســمی قوربانیکردن و ئایینەکاندا هۆنراونەتەوەو زۆرجاریش پرژاوەتە سەر کاروبــاری سیحربازی و یەکجار کۆن. هۆگریی ئەم شاعیرانە لەگەڵ سروشت بە رادەیەک بووە کە بەتەواوەتی لەگەڵ مرۆڤی ئەم سەردەمە نامۆیە .

ئەم دەقە شیعرییانە، بە ئەستەم زانیاری لەسەر ئەفسانەکان دەخەنەڕوو، ئەمەش شیکردنەوەی نووسراوەکان یەکجار دژوار دەکات.

٣. وەرگێڕ و شرۆڤەکەرانی ڤیداکان هەر یەکەیان بە هەوای خۆیان تێیان خوڕیوەو وەکو چێشتی مجێور بەسەر یەکدا هەڵیانشێلاوە، کە ئەمەش کاری توێژەر و لێکۆڵەرانی ئەوەندەیدیکە دژوارکردووە و کارەکانیان بەنیوە چڵی ماونەتەوە.

٤ . مەکدانیل جیاوازتر لەوانەیدیکە، زانیاریی تەواوی لەسەر هەریەک لەخواوەندەکانی کۆکردەوەو تاوتوێ و پۆلێنبەندییکردن و پاشان گۆڕانی ڤیداکانی بەپێی زەمەنی ئەو کات لێکدایەوەو خستنیەڕوو. ناوبراو بەم شێوەیە تێگەیشت کە ڤیداکان لە مەودای زەمەنییەکی دیاریکراودا نەنووسراون، بەڵکو بەرهەمێکە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا کۆکراوەتەوەو وەرچەرخانێکی فیکریی یەکجار زۆری بەخۆیەوە گرتووەو تیایدا باس لە بیروباوەڕی ئانیمیستی (Animisme) گیانگەرایی، خواوەندەکانی سەر زەوی و یەکتاپەرستی دەکرێت. دۆزینەوەی وەها رێگەیەک کە ئاڵوگۆڕی ئایینی تێیدا ئەنجامدراوە، تێگەیشتن و بیروباوەڕی لێکۆڵەرانی مێژووی ئایینەکان زانستییانەتر دەکات. نمونەیەکیدیکەی ئەم وەرچەرخانە لە مێژووی ئایینەکانی ناوچەی میزۆپۆتامیادا، لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە تا بابلییەکانی ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی پێشزایین، بەرچاو دەکەوێت. رەنگبێ مێژووی ئایین لە میسریش بۆ وەها خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەیەک، یارمەتیدەر بێت .

٥. بۆ ئەم مەبەستە ئەشێ ئەفسانەی هەریەک لە خواوەندەکان لەگەڵ هێنانی ناوەکەیدا یادیشی بکرێتەوەو هەر چەند جارێکیش کە ناوی دەهێندرێ، پێویستە ببژێردرێت. کەوابوو، ناوی خواوەندەکان بەپێی، هەرچەند جار کە یادی دەکرێتەوە، بەپێی، ئەرکەکانی خۆی، دیاریدەکرێت .

هەرکات کە هەموو ئەم وردەکارییانە جێبەجێکران، ئەودەم دەتوانین لەسەر بنەمای لێکدانەوەی بەراوردکاریی ئەفسانە هیند و ئێرانییەکان، هیند و ئەورووپاییەکان و ئاسیای رۆژهەڵات، بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەفسانە ڤیداییەکان چ پەیوەندییەکیان لەگەڵ هەر یەک لەو جۆرە بیرکردنەوانە هەیە.

## بیروباوەڕی ڤیدایی
## سەبارەت بەجیهان و سەرچاوەکەی

شاعیرانی ڤیدایی پێیانوایە، ئەو جیهانەی خواوەندەکان تیایدا فەرمانڕەوایی دەکەن بەسەر سێ بەشی "زەوی، فەزا و ئاسمان"، دابەش دەکرێت.

کاتێک لەڤیداکاندا باس لە ئاسمانی بان زەوی دەکرێت، ئاسمان و فەزا ئاوێتەی یەکتر دەبن و جیهان لەدوو بەشی سەر و ژێردا سنووردار دەمێنێتەوە.

دیواری (naka)، ئاسمانی سەرەوە کە دەبیندرێت، لە ئاسمانی سێیەم کە نابیندرێت، جیا دەکاتەوە. ئاسمانی سێیەم کە نابیندرێت، لە جیهانی نوور و کۆشکی خواوەندەکان دروستبووە. سێینەی ئاسمان، فەزا و زەوی لە ریگ ڤیدا- دا یەکجار جێگەی بایەخ و خۆشەویستن. ئەگەر باسی جیهانی سەر زەوی دەهاتە گۆڕێ، "هەورەتریشقە، باران و با" بە مڵکی ئاسمان ئەژمار دەکران. کەوابوو لەم پێکهاتەیەدا زەوی، فەزا و ئاسمان (ناکە) و ئاسمانی سەروو (ناکە)، بوونیان هەیەو لەدابەشکردنیدیکەدا، زەوی، ئاسمان، ناکە و ئاسمانی سەروو ناکە، هەن.

هەریەک لەم بەشانە بەسەر سێ بەشی: "سێ زەوی، سێ فەزاو سێ ئاسمان" دابەش دەکرێت. ئەگەر ئاسمان بەسەر دوو بەشی زەوی و ئاسماندا، دابەش بکرێ، ئەوە شەش جیهان بوونیان دەبێت.

بە زەوی bhumi ksa، بەرفراوان (Prthvi)، بێ کۆتا (apara) دەگوترێت. زەوی، بەچەرخێکی بازنەیی شکل وەسف دەکرا. ریگ ڤیدا باسی چوار جەمسەری کردووە، کە ئەمەش بۆ خۆی واتای تێکڕای زەویی هەیە. هەندێک جار باس لە پێنج جەمسەر کراوە، جەمسەری پێنجەم ئاماژەبووە بۆ چەقی زەوی. ئاتروە ڤیدا ئامازە بە شەش حەوت جەمسەر دەکات. پێدەچی ئامازە بە شەش هەرێمی لاوەکی، یان سەرجەم ئەو حەوت هەرێمە بێت.

ئاسمانیان بە (div) دیو ناودێرکردووە، یان هەندێک جاریش بە (Vyoman)و یومەن ناوی دەبردرێت، یان (Rocana) بە واتای فەزای تابان دێت. ئاسمان سەرەڕای ناکە، خاوەنی چگاد، (Sanu)، بەستێن، زنجیرە چیا (Prstha) و زنجیرە چیای دیواری ئاسمان بووە. ئەگەر سێ نهۆمی ئاسمان دیاریکرابێت، لە نهۆمی سێیەمدا خواوەندەکان، باوکان و سوومە، تیایدا دەژین.

زەوی و ئاسمان وەکو ژن و مێردێک باسیان کراوە (dvyavaprthivi)و بە "دوو کەرتی یەکسان" لەقەڵەمدراون و بە "دوو کاسە کە نیوەی یەکترین" دادەندرێن.

ریگ ڤیدا باسی مەودای نێوان زەوی و ئاسمانی نەکردووە، بەڵام ئاتروە ڤیدا دەڵێ باڵندەی زەرد (هەتاو) لەئاسماندا هەڵدەفڕێ، سەفەرێکی هەزار رۆژەیە. بەرهەمەکانی دوای ڤیدا باسی هەزار رۆژ سەفەرکردنی بە ئەسپ، هەزار گای کردووە کە لەسەر یەک راوەستابن. فەزا (Antariksa) هێندە روون نییە. بە ئاودار ناودێر کراوە، چونکە هەور مژ لەوێ راوەستاون. ئاو و سوومە لە نهۆمی سێیەمی فەزا دان و ئاوری ئاسمانی بە وجوود دێت. فەزای سێیەم بۆ ئێمە ناناسرێت، چونکە بە مڵکی وینشوو ئەژمار دەکرێت. لەو سێ نهۆمەی فەزا، پێدەچی نهۆمی ژێرەوەی ژێرزەوی بێت، کە خۆر بتوانێ نێواران دابچێت و بەیانیانیش لە کەل بێتە دەر. لە ئەیتریەدا هاتووە کە خۆر لە شەودا ئاسمان و بە رۆژیش زەوی روونـاک دەکاتەوە. فەزا لەلایەن زۆرکەسەوە بە دەریا ناوی دەبرێ و بە کانی و سەرچاوەی سەرەکیی ئاوەکانی دەزانن. هێندێک جار سموودرە، پەڵە هەوریشی تێدایە.

لە ڤیداکاندا هەورەکان بە تەختە بەردیش لەقەڵەم دراون کە ئەو مانگایانەی لە دەستی ئیندرە و خواوەندەکانیدیکە هەڵاتوون، کۆ دەکاتەوە. لە ڤیداکاندا، هەورەکان بە مانگا شوبهێندراون، کە شیرەکەیان وەک باران وایە.

سیستەمی جیهان (rta) لەژێر چاودێریی خواوەندەکان دایە. ئەم وشەیە بە واتای سیستەم لە جیهانی ئەخلاقیشدا دێت و بەهەقیقەت و راستی ئەژمار دەکرێت. لەجیهانی ئایینیدا قوربانیکردن و رێورەسمی قوربانیکردن ناوی رتەی لەسەر داندراوە.

### ئافراندنی جیهان

ئافراندنی جیهان لە ریگ ڤیداکاندا لەسەر دوو روانگە دارێژراوە، بەڵام هیچ جیاوازییەکیان نییە. یەکێک لە روانگەکان پێیوایە جیهان لەلایەن دارتاشێکی پسپۆڕ و لێزانەوە دروستکراوەو بۆچوونەکەیدیکەش پێیوایە جیهان بەشێوەی خۆڕسک و سروشتی دروستبووە.

شاعیرانی ریگ ڤیدا بۆ دروستکردنی جیهان لە "بەننا" کەڵکیان وەرگرتووە. پێوانەکردن لەپرۆسەی دروستکردندا ئاسایی بووە. ئیندرە قەبارەی شەش هەرێم دەپێوێ و راستایی و هەراویی زەوی بەدیدێنێ و میچی بەرزی ئاسمان دروست دەکات. کەرەسەی پێوانەکردنی ئەو کارە، هەتاو بوو کە وەروونە ئەنجامیداوە. چەندین جار ئاماژە بەوە کراوە کە زەوی لەلایەن خواوەندەکانەوە گەورەتر کراوەتەوە - ئەو خواوەندانەی کە دەستیان لەم کارەدا هەبوو بریتین لە: ئەگنی (خواوەندی ئاگر)، ئیندرە (خواوەندی جەنگاوەر) و کۆمەڵێک خواوەندیدیکە. لەریگ ڤیدا بەزۆری باسی دار و درەخت کراوە. " ئەو دارستانە کامەیە و ئەو دارانەش کامانەن کە زەوی و ئاسمانیان لێدروستکراوە؟" (ریگ ویدا / ١٠). لە براهمنەکاندا وەڵامەکەی بەم شێوەیە هاتووە کە" براهما بۆ خۆی هەم دارستانە و هەم دار.

باس لەو کۆڵەکانە دەکرێ کە ئاسمان و زەوییان راگرتووە skambh ، فارسی: مۆم، داگیرساندنی مۆم بۆ راگرتنی بەننا، وەلێ باس لەوە دەکرێ کە بۆ خۆی راوەستاوەو بەرنەبوونەوەی جێگەی سەرسوڕمانە.

دەرگای ئەم جیهانە هەمان شوێنی هەتاو هەڵاتنە کە رووناکییەکەی دەکەوێتە سەر زەوی.

بەگشتی خواوەندەکان و هەندێک جاریش چەند خواوەندێکی تایبەت بە ئافرێنەری جیهان دادەندرێن، بەڵام کاتێک کە لەپرۆسەی دروستکردنی ئەم جیهانەدا پێویست بەخواوەندێکی لێزان و شارەزا بێت، یەکسەر باسی تووشتەر دێتە گۆڕێ .

هەتا ئێستاش روون نییە کە بۆچی خواوەندەکان وەها خانووبەرەکیان دروستکردووە، بەڵام کە باسی وینشوو دێتە ئاراوە، روونە کە بۆ خەڵکی دروست دەکات (٦ـ٩٤).

لە نیزام و یاسای جیهاندا، دروستبوونی هەر شتێک پەیوەندی بە فاکتەرێکیدیکەوە هەیە، بەم شێوەیە هەتاو لە داوێنی بەرەبەیان دەکەوێتەوە، هەروەها بەرەبەیان بۆخۆی منداڵی شەوە.. بە تێپەڕبوونی زەمەن، کە روانگەو بۆچوونەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە، لەهۆنراوە ڤیداییەکاندا جیاوازی و ناکۆکی دەبیندرێت. بۆ نموونە کاتێک بەرەبەیان بەقوربانیبوونی باوکەوە گرێ ئەدەن، لێرەدا ناکرێ پاساو بهێندرێتەوە کە بەرەبەیان منداڵی شەو نییە.

هەندێک جار باوک بە فاکتەری سەرەکی دادەندرێت. تیرهاوێژەکان بەباوکی تیر و کاولان بەباوکی شمشێر دادەندرێن. ئەمە پەیوەندیی نێوان هەست و نەستە. بەپێی ئەم یاسایە خواوەندییەکانیش بە وجوود هاتن. باسەکە درێژە ناکێشێ و شاعیریش لە خەیاڵ و بیری خواناسیدا نوقم بووە. شاعیرێکیدیکە پرۆسەی ئافراندن بەم چەشنە دەبینێت: لە گوڕ و تین (Tapas)ئەزمی جیهان (rta) سەریهەڵدا. پاشان شەو، ئۆقیانوس و ساڵ هاتنە گۆڕێ، و دادار = dhata ئافرێنەریش "خۆر و مانگ، ئاسمان و زەوی، فەزا و هەوا"ی یەک لەدوای یەک دروستکرد.

ئەم بیرۆکەیە دواتر گەیشتە براهمنەکان: پێشتر هیچ شتێک لەگۆڕێدا نەبوو، نە ئاسمان، نە زەوی و نە فەزا، بۆیە بڕیاریاندا روو لە جیهانی هەستی بکەن.

تێڕوانینی براهمنەکان بۆ ئافراندنی جیهان ئەوەیە خوڵقێنەری جیهان بوونی هەیەو هەمیشەش خاڵی دەسپێک نییە. لەنێو براهمنەکاندا ئەم ئافرێنەرە، پەرجاپتی، یان هەمان "براهما"یە کە نەتەنیا خواوەند، خەڵک و دێوی دروستکردووە، بەڵکو بۆ خۆی مانای هەموو ئەمانەیە. لەهەموو ئەمانەشدا پەرجاپتی خاڵی دەسپێکە و ئاواتی منداڵ و خەڵک دەخوازێ، یان ئاوی (ئاسمانی) هەتاهەتاییە کە هێلکەی زێڕین (=هەتاو)ی جیهان تیایدا دەسوورێتەوە. هەر ئەویش جیهان دروستدەکات.

جیاوازیی نێوان ئەم دوو بۆچوونەو هەروەها جیاوازی لە ناوەڕۆکی ئەم دوو دەقە کە خواوەندەکان خوڵقێنەری پەرجاپتی بوون و چەندین کێشە و جیاوازییدیکەیان تێدایە کە لەهەموو ئایینە دێرینەکاندا بەرچاو دەکەون .

چیرۆکێکیدیکەش لە چاندووگیە براهمنەدا بوونی هەیە کە دەڵێت، جیهان بوو بە دوو کەرت و ئاسمان و زەویی لێدروستبوو.

یەکێک لە سەرنجڕاکێشترین ئەفسانەکانی ئافرێنەریی جیهان لە براهمنەکاندا بەم چەشنەیە کە زەوی لە ئاودا ڕۆچووبوو. بەرازێک لە ئاوی کێشایەدەرو دواتر لە ئەفسانەکانی پاش ڤیداییەکاندا، ئەم ئەفسانەیە بۆ ویشنوو و یەکێک لە "ئاڤاتار"ـەکان گەڕێندرایەوە.

## دەسپێکی خواوەندەکان و خەڵك

بەگشتی ڤیداکان دەڵێت : خواوەندەکان لەدایک و باوکی خۆیان (زەوی و ئاسمان) دروستبوون. جیا لەمەش، هەندێک جار لە ئاو دروستبوون. هەندیک جار دەگوترێت خواوەندەکان لە ئەدیتی، یان ئاو، یان لە زەوی دروستبوون، کە ئەمەش بۆ دابەشبوونی کۆمەڵگەی خواوەندەکان بە سێ دەستەی ئاسمانی، فەزایی و زەوینیدا، دەگەڕێتەوە. لەحاڵێکدا کە زاوزێ یەکەم خواوەندەکان کردوویانە، هەندێکیش لە خواوەندەکان زاوزێیان کردووەو منداڵیشیان هەیە. هەندیک جار بەرەبەیان، وەک دایکی خواوەندەکان پێناسە دەکەن و سوومە (هووم)یش بەباوکی لەقەڵەم ئەدرێت

(٩،٨٧ و ١،١١٣). دەستەیەکی حەوت هەتا هەشت کەسی لە خواوەندەکان، بە ئەدیتیەکان واتە مندالآنی ئەدیتی ناودێر کراون.

ڤیداکان سەرجەم مرۆڤەکان بەمرۆڤە سەرەتاییەکان پێناسە دەکەن و بەمندالّی ویوەشوەت لە قەڵەم ئەدەن و بەمەنوو ناودێریان دەکەن. کە بەیەکەم قوربانی ئەژمار دەکرێن (٣, ٦, ١٠) و بەباوکی مەنوو دادەندرێت. جیا لە مەنوو، یەکێک لەکورەکانی ویوسووت بەناوی یەمە کە بەباوکی خەڵک ئەژمار دەکرێ، هاورێ لەگەڵ خوشکەکەی خۆی یەمی رەگەزی مرۆڤیان ئافراند.

لە ریگ ڤیدادا، باوکی دیئووس بەباوکی هەتاهەتایی دادەندرێت و خواوەندی ئاسمانی و هەروەها واتای ئاسمانیش دەگەیەنێت. ئووشس، ئیلاهەی سپێدەیە و بە مانای سپێدەش دێت، بەربەیان لەهەموو شوێنێک بەکچی دێئیووس دادەندرێت. پێرێتووی، ئیلاهەی زەوی، کە لەسەر سینگی بەرفراوانی خۆیدا گیا دەڕوێنێ، بە دایک دەناسرێت. دایک و باوکی ئەبەدی بەدایک و باوکی جیهان بەناوبانگن. ئاسمان باران دەرژێنێتە سەر زەوی و ئاوسی دەکات و گوڕ و تینی پێ دەبەخشێت، هەردووکیان خواردن و خۆراک بۆ بوونەوەرەکان دابین دەکەن. ئەم دوو خواوەندە بەدایک و باوکی خواوەندەکانیدیکەش ئەژمار دەکرێن. لە دوایین ڤیداکاندا، خوڵقاندنی زەوی و ئاسمان بە کاری ئەم خواوەندانە لە قەڵەم ئەدرێت، بەم هۆیەوە کێشەیەک دێتە ئاراوە کە ئایا دوو خواوەندی هەتاهەتایی واتە دیئیووس و پێرێتووی، زەوی، ئاسمان و خواوەندەکانیان خوڵقاندووە، یان خواوەندەکان ئەم دوو خواوەندەیان لە داوێنی خۆیاندا پەروەردە کردووە؟

بۆ نموونە دایک و باوکی خۆی لە جەستەی خۆی دروست کردووە (١،١٥٩: ١٠،٥٤). هەوری بارانـاوی کە بەمانگا دادەندرێ، دایکی هەورەتریشقە، یان ئاوەکانی ئاسمان دەژمێردرێ. لەم نێوانەشدا، خواوەندی هەورەتریشقە کە هەمیشە لە ئاسمانەکاندا دەخولێتەوەو خواوەندی ئاگریشە، بەئاپم نپات، کوڕی ئاوەکان، دەناسرێت.

لەڤیداکاندا جۆرێکیدیکەی باوک و دایک، ئەوەبوو کە بەهێزترین کەس باوکی هەموان بوو. بەچەشنێک کە وایو، خواوەندی با، باوکی خواوەندەکانی تۆفان بوو (١/١٣٤)، سوومە باوکی گژوگیاکان و سەرەسوەتی، ئیلاهەی ئاو، دایکی چۆم و رووبارەکان بووە.

هەروەها، خواوەندە کوڕەکان بەواتای سەڵت و چەمکێکی هزریش دێن: خواوەندە کوڕەکان هەتاهەتایی و نەمرن. ئەگنی کوڕی هێزە و فەرمانڕەوایە (٤،٢٤. savasah؛ میترە و وەروونە بە منداڵی هێز و فەرمانڕەوای مەزن دادەندرێن. هەندێک جار ناسناوی باوک بە میرات دەگاتە کوڕەکەی، بە چەشنێک کە ویشوەروپە، ناسناوی توەشتەر، بەمیرات بۆ کوڕەکەی، ئەژدیهایەکی سێسەر مایەوە کە دواتر بە دەستی تریتە دەکوژرێت.

لەدوایین هۆنراوەکانی ریگ ڤیداییدا بەرەورووی باسێکی ئەفسانەیی دەبینەوە کە نە لەسەر بنەمای دورستکردنی وەستاکارانەی جیهان و نە لەسەر بنەمای پەیوەندیی دایک و باوکی داڕێژراون. هەر چەند هۆنراوەی بەناوبانگی پوورووشە - سووکتە (١٠،٩٠) لەنێو نووسراوەکانی ریگ ڤیداییدا بەشتێکی نوێ دێتە بەرچاو، بەڵام ئەو خاڵەی کە ئاماژەی پێ دەکات، یەکجار کۆنە. کەوابوو، هۆنراوەی کەیهان لەداوێنی دێوەزمەیەک کەوتۆتەوە. خواوەندەکان هاوڕێ لەگەڵ پوورووشە - سووکتە، قوربانییەکی سەیروسەمەرەیان خستۆتەڕێ: لە کەللە سەری کەیهان ئاسمان، لە ناوکی کەیهان فەزا و لە لاقەکانیشی زەوییان دروستکرد. لە زارییەوە مانگ، ئیندرە و ئەگنی، لە چاوییەوە هەتاو، لە هەناسەکەیشەوە با، سەریان هێنایە دەر. چوار توێژی خەڵکیش بەدەستی ئەو دروستبوون: ئەو چوار توێژە بەم شێوەیە پێکهاتبوون لە دەستەکانی، جەنگاوەرەکان، لە رانی وەئیشیە توێژی سێیەم، لەزاریشی براهمنە واتە رۆحانییەکان و هەروەها لە لاقیشی شوودرە دورستبوو. هەر لەوێدا باس کراوە کە پوورشە بەواتای "هەموو ئەمانە" دێت و شیکاری و لێکدانەوەیەکی یەکتاپەرستانەیان بۆ کردووە.

هەندێک جار ئاماژە بەم بۆچوونە دەکرێ کە هەستی (Sat) لەنیستی (asat)دروستبووە.

ریگ ڤیدا باس لەوە دەکات: لە دەسپێکدا هیچ بوونەوەرێک لە گۆرێدا نەبووە، هەموو شوێنێک چۆڵ و هۆڵ بووە، ئاوە نادیار و شارەوەکان تاریک و چۆڵ بوون. دواتر بوونەوەرێکی هەتاهەتایی و نەمر بەناوی ئێکەم بەدەستی تین و گەرما دروست بوو. لەو کاتەدا هیوا و ئارەزوو بووە یەکەم خواستی ناو مێشک.

ئەفسانەی یەمە (جەمشید لە ئێران) و مەنوو، کە هەردووکیان منداڵی ویوەسەوت بوون، بیرۆکەی ڤیداییەکانی ئینسانیان دەگەیاندە ئیلاهی و ویوەسەوت بۆخۆی نەتەنیا خواوەندی هەتاو بوو، بەڵکوو گەندەروە کە خواوەندێکی مەزن و ئاسمانییە و بەنزیکترین خزمی وەیوەسەوت ئەژمار دەکرا. هەندێک جار کە باس لە پەیوەندی نێوان ئینسان و خواوەندەکان دێتە گۆڕێ، دەڵێی ئینسانیش منداڵی زەوی و ئاسمان بووە. تەنانەت ئەگنیش بەباوکی ئینسان لەقەڵەم دراوە. هەروەها باس لە کۆمەڵێک بنەماڵە و چینی تایبەت دەکرێت کە راستەوخۆ لەداوێنی خواوەندەکان کەوتونەتەوە.

سەرئەنجام هاتنەسەر ئەو باوەڕەی کە چینەکانی کۆمەڵ لە پارچە جیاجیاکانی جەستەی پوورووشە دروستبوون.

## خواوەندە ڤیداییەکان

ناڕوونیی گەلاڵەی گشتی و تایبەتمەندیی خواوەندەکان، لەسەرجەم ڤیداییەکاندا بەرچاو دەکەوێت. خواوەندە ڤیداییەکان لەچەمکە مادییەکان نزیکترن هەتا خواوەندی هۆزە هیند و ئەورووپاییەکان. خواوەندەکانی وەکو بەرەبەیان، ئاگر و هەتاو چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەشیان هەیە. لەراستیدا، تایبەتمەندیی تۆخمەکانی سروشت زۆر کەمن و لەچەند دانەیەک تێناپەڕن. بۆ نمونە ئەو خواوەندانەی کە باسیان کرا، هەموویان نورانی، دژی تاریکین و لە بەرەبەیانیشدا خۆیان دەنوێنن، بەتایبەت ئەگەر خواوەندەکان نوێنگەی

یـەک شـت بـن. بـەم پێیـە خواوەنـدەکان هەنـدێک جـار یـەک یـان دوو تایبەتمەندیی تاکە کەس و هەندیک جاریش تایبەتمەندیی هاوبەشیان لەگەڵ ئەوانیدیکـەدا هەیـە. درەوشـانەوە، جـوامێری و زانـایی بەتایبەتمەندییـە گشـتییەکان ئـەژمار دەکـرێن. ئـەرکی دیـاریکراوی جیهـانی بـۆ هـەموو خواوەندەکان پێشبینی کراوە. پاراستن و پشتیوانی، یان پێکهێنـانی زەوی و ئاسمان بۆ هـەموویان دەستنیشـانکراوە. زۆرێـک لـە خواوەنـدەکان هـەتاویان دروسـتکردووە، یـان لەئاسـماندا جێگـەیان بـۆ کردۆتـەوە، یـان لـە ئاسـماندا رێگـەیان بـۆ دیـاریکردوون. زۆرێـک لـەوان بەپاشـای هـەموو زینـدەوەرەکان لەقەڵەم ئەدرێن.

بـەهۆی وێکچـووی تایبەتمەندییـەکان، تێکـڕای بنچینـە گرینگـەکان بـە ناڕوونی دەمێننەوە. بـۆ نمونـە ئـەگنی، کە بەخواوەنـدی ئـاگری سـەر زەوی لەقەڵەم ئەدرێت، بەهەورەتریشقەکەی خۆی دێوی تاریکی شکست پێدێنێت، تەنانـەت بـۆ خۆیشـی دەبێتـە هەورەتریشـقەو لەئاسـمان دەخولێتـەوە. ئـەو خواوەندانەی لایـەنی هاوبەشـیان هەیـە، ئاوێتـەی یـەکتر دەبـن، ئـاگریش بـۆ خۆی بەتەنیا ئاگری سەر زەوییە، بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمەن سۆومە نـووش و وێرەترە کۆش، " مانگاکان، ئاو، هەتاو و بەرەبـەیان" دەخەنـە ژێـر رکێفـی خۆیانەوە. ئەمانە هەموو تایبەتمەندییەکانی ئیدەرە، واتە خواوەنـدی فەزاییـە کە ئـەگنی بـەهۆی یارمەتیـدان و هاوکـاریکردنی ئینـدرە، تایبەتمەندییـەکانی ئیندرەشی بەدەستهێناوە.

ئەم یەکسانبوونەی خواوەندەکان بە ڕادەیەک بووە کـە شـاعیر دەڵێـت: " ئەی ئـەگنی، ئـەتۆ کـاتی لـەدایکبوونت وەرنـەی، کـاتیکیش کـە رادەوەسـتی ئینـدرە، ئـەی پیـاوی ئـازا، هـەموو لـەتۆدا خواوەنـدەکان کۆدەبنـەوە، ئـەتۆ ئیندرەی پیاو چاکانی (٢/٥)".

تێکـەڵبوونی ئـەم تایبەتمەندییانـە، خواوەنـدەکانی وەک یـەک لێکـردو تەنانەت بیروباوەڕێک هاتەئاراوە کە ئەوانە لایەنە جۆراوجۆرەکانی خواوەنـدی

تاقانـەن. ئـەم بۆچوونـە زیـاتر لەیـەک حاڵـەت لـەنێو ریـگ ڤیـدادا بـەرچاو دەکەوێت.

ئەو بەتاق و تەنیایـە کـە رۆحانییـەکان بەشـێوەی جۆراوجـۆر، بەئـەگنی، یەمە و ماتریشوون ناویدێنن. رۆحانی و شاعیرەکان بەچەندین ناوی جیـاوازی باڵندەوە ناویدێنن، بەڵام ئەو هەر تاقانەیە."

بەم شێوەیە، لەکۆتاییەکانی سەردەمی ریگ ڤیداییـدا جۆرێـک خواوەنـدی یەکتاپەرستی سەریهەڵدا، تەنانەت یەکەمین بیرۆکەی یەکتاپەرسـتی هـاتبووە گۆڕێ، کە تاقە خواوەنـدێک وەک هێمـای سـەرجەم خواوەنـدەکان و تێکـڕای سروشت ئـەژمار دەکـرا. ئیلاهـەی ئـەدیتی بەبارتـەقای هـەموو خواوەنـدەکان قورسـایی هـەبوو، جیـا لەمـەش هاوتـای هەسـت و نەسـت و تێکـرای ئـەو زیندەوەرانەی سەر زەوی دادەندرا. پەرجاپتی نەتەنیا لەهەموو خواوەندەکان باشتربوو، بەڵکو زاتی ئەو، هـەموو هەسـت و نەسـتی جیهـانی لـەخۆدەگرت. ئـەم تێروانینـی یەکتاپەرسـتانە لـەئاتروە ڤیـداو لـە ئـەدەبیاتی دواتـری ریـگ ڤیداییدا بەباشی جێگەی خۆیکردەوە.

لەهەندێک بەشی ریگ ڤیداییدا کۆمەڵێک لە خواوەندەکان، وەک باشـترین خواوەند باسیان لێکراوە، بـەڵام ئـەم باسـە هـیچ کـات بەئـەنجامێکی دڵخـواز ناگـات. مـاکس مـولێر بـە "henotheism" ناویـدەبات و بـەم شـێوەیە لێکینەداتـەوە، کـە هێنۆتئیسـم واتـای باوەڕمەنـدبوون بـەو خواوەندانـەی کـە هەریەکەیان خۆی بەمەزنترین خواوەند دادەنێت.

هەروەها پێچەوانەی ئەم بۆچوونەش لەگۆڕێدا بووە. لەنێو ڤیداکانـدا هـیچ کاتێـک خواوەنــدێکی تــەواو ســەربەخۆ بــەرچاو ناکــەوێت و بەشــێوەیەکی دوولایەنـە خواوەنـدەکان پەیوەنـدییان لەگـەڵ یـەکتردا هـەبووە و گرێـدراوی یەکتربوون.

بۆ نمونە وەروونەو سووریە گوێڕایەڵ و ملکەچی ئیندرە دەبن. وەروونـە و ئەشوینەکان ملکەچی وینشـوو دەبـن و هـەروەها ئینـدرە، میتـرە ـ وەروونـە، ئەریەمەن و روودرە خۆیان لەبەر بڕیارەکانی سویتریدا ناگرن.

کەوابوو، هینۆئیسم رواڵەتی ئەم بابەتە، بەڵام جۆرێک هۆگری بە یەکتاپەرستی بەدیدەکرێت. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی خواوەندە ڤیداییەکان، باسی خواوەندەکانی سەردەمی زۆر پێشتر بووە، کە تەنانەت مەرگیشیان هەبووە. لە سەرجەم براهمنەکاندا باسی مەرگی تێکڕای خواوەندەکان و هەروەها مردنی ئیندرە، ئەگنی و پەرەجاپتی کراوە. ئەوان لە سەرەتادا نەمربوون، چونکە ئەمەیان لەلایەن سوویترەوە پێبەخشرابوو. هەروەها خواردنەوەی سوومە بەسەرچاوەی نەمری دادەندرا. هەندێک جاریش دەگوترێ بە بەڕێوەبردنی رێوڕەسمێکی تایبەت نەمرییان مسۆگەر کردووە. دواتر لەسەردەمی براهمنەکاندا نەمری بووە شتێکی رێژەیی و تەنیا لە قۆناغێکی مێژوودا سنووردار مایەوە.

شکڵی رواڵەتیی خواوەندەکان هەمان شکڵی ئینسانەکان بوو، هەرچەند زۆر روون نەبووە، چونکە هەبوونی ئەو رواڵەتە تەنیا بەشێک لەپێگەی سروشتیی ئەوانی نواندووە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە دەست و دەم و چاو، زار، کوڵمە، چاو، موو، شان و مل، سنگ و سکیان هەبووە. درەوشانەوەی هەتاو بەمەچەک ئەگنی دادەندرا. زمان و دەست و لاقی ئەگنی گڕە مەشخەڵانی ئەو بووە. هەندێک لە خواوەندەکانی وەک: ویشوە و رووپە چەندین شکڵ و رواڵەتیان بەخۆیانەوە گرتووە. هەندێک لە خواوەندەکان جلوبەرگیان لەبەر کردووە و چەکیشیان پێبووە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لە شارستانییەتی ریگ ڤیداییدا باسی بتپەرستی و پەرستگە نەکراوە.

بەگشتی خواوەندەکان عەرابەی نەخشینیان هەبووەو بە ئەسپ کێشیان کردوون، بەڵام بزنێک عەرابەی خواوەندی پووشین رادەکێشێت و هەروەها هیندێکی دیکە لەعەرابەی خواوەندەکان بە ئاسک و گا راکێشراون.

خواوەندەکان بە عەرابەکانیان بەرەو رێوڕەسمی قوربانیکردن رۆیشتوون و رایەخیان گەڵای سەوز بووە. خواردنەوەیان سوومە بووە. خواردنەکەشیان شیر، رۆنەکەرە و جۆ، برنج، گۆشتی مەڕ، بزن و گا بووە.

ماڵی خواوەندەکان بەشێوەی گشتی لە ئاسمانەکان، بەتایبەت لەئاسمانی سێیەمدا بووەو لەگەڵ هەڵێنانەوەی هەنگاوی کۆتایی، واتە هەنگاوی سێیەم، دەست بەشادی و خواردنەوەی سوومە دەکەن. خواوەندەکان ژیانیان بە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی تێپەڕکردووە و تەنیا یەکجار نەبێ، کە ئیندرە دەیویست بەتەنیا لەگەڵ هەموو خواوەندەکان بەشەڕ بێت.

خواوەندەکان سەرچاوەی هێزە سەرەکییەکانی سروشت وەکو: هەتاو، ئاگر و هەورەتریشقەبوون، کە هەموویان بەسەرچاوەی خێر و بەرەکەت ئەژمار دەکران. تەنیا یەکێک لە خواوەندەکان بەناوی روودرە زیانبەخش بوو. زۆربەی نەخۆشییەکان لەداوێنی دێوەکانی وەک ورترەوە دەکەوتنەوە، بەڵام خواوەندەکان بەخشندە و دلۆڤان بوون و هاوکات قوربانیشیان بۆ کراوە. شیعرە ڤیداییەکان لەکاتێکدا لە مەتحی خواوەندەکاندا هۆنراوەتەوە، کە رۆحانییەکان سەرقاڵی خواردنەوەی سوومە بوون. بەم پێیە خواوەندەکان دۆستی بەرهەمهێنەرانی سوومە و دوژمنی فەرامۆشکاران بووە. خواوەندە ڤیداییەکان کەسایەتییەکی ئەخلاقییان هەبووەو دوژمنی خراپکاران بوون، وەروونە هەمیشە لە گوناح و خەتاباران تووڕە بووە. بەپاک زانینی بێ ئەملاولای خواوەندەکان لێکدانەوەیەکی ناتێکەیشتوانەی کۆمەڵگەی سەرەتاییە، خواوەندی کۆمەڵگەی پێشکەوتووتر فێڵباز و سەرکێش و ... بوون. بەگشتی ئەخلاق لەجیهانی ڤیداییەکاندا گرنگییەکی ئەوتۆی نەبووە. ئەوان بەدیهێنەری ئاوات و ئارەزووی خەڵک بوون و دیاریکەری تەمەنی فەرمانڕەواییەکان بوون.

ریگ ڤیدا و ئاتروە ڤیدا باوەڕیان بە ٣٣ خواوەند هەیە، کە یانزە دانەیان لە ئاسمان، یانزە دانە لەسەر زەوی و یانزەیتریش لەئاوە فەزاییەکاندان، بەڵام هەندێک جار ڕێژەی خواوەندەکان گەیشتۆتە ٣٣٣٩ کەس.

## چاخە جیاجیاکانی ئایین لە هیند

چاخەکانی ئایین لە هیند بەسەر چوار قۆناغدا دابەش دەکرێن:

١ .چاخی ڤیدایی (١٥٠٠ هەتا ٦٠٠ ساڵ پێش زایین).

٢ .چاخی حەماسی (٦٠٠ هەتا ٢٠٠ ساڵ پێش زایین).

٣ .چاخی سوێترەکان (Sutra) ، لەسەدەی دووەمی زاینییەوە.

٤ .چاخی فێربوون کە ئەویش لەسەدەی دووەمی پێش زایینەوە دەست پێدەکات.

چاخی ڤیدایی لەگەڵ هێرشی هیند و ئێرانییەکان (ئارياييەکان) و پەرش و بڵاو بوونەوەیان و هەروەها جێگیربوونی ئەوان لەوڵاتی هیند دەست پێدەکات. ئەم چاخە بەسەر سێ قۆناغی ئوپەنیشد، براهمنە و ڤیداییەکان، دابەش دەکرێت.

چاخی حەماسی (ئازایەتی)، چاخی یاخیگەری توێژە جیاجیاکانی هیند لەدژی زوڵم و زۆرداری دەسەڵاتی زاڵ بەسەر کۆمەڵگەی هینددابوو. ئەم یاخیبوونە لەدژی رۆحانییە براهمنییەکان بوو، کە پاشاکان، دەوڵەمەند و جەنگاوەرەکان (Kšatrya) تیایدا رۆڵی سەرەکییان دەگێڕا. ئەوان بە شێوەی سەربەخۆ، دوور لەبیروباوەڕی براهمنەکان، ئایینی خۆیان هەبوو، هەندێک کەسیشیان ئایینی ڤیداکانیان رەتدەکردەوە. ئایینی بوودایی، جێین و هەروەها پەرستنی کریشنە کە دواتر بۆ رێبازی وینشوو گۆڕدرا، یان واتای پەشتووپتی، کە دواتر بۆ ئایینی شیڤا گۆڕانی بەسەردا هات، لەرێزی ئەم جۆرە ئایینانەدا بوون. پێدەچێ ئایینی وینشوویی و ئایینی شیڤا لەنێو کۆمەڵی خۆجێی هیندییەکاندا سەری هەڵدابێت. زنجیرە بیروباوەڕی ئەم دوو ئایینە نوێیە لە بەرهەمە حەماسییەکەی مهابهارتە رەنگیداوەتەوەو بەم هۆیەوە ئەو چاخەیان بە چاخی حەماسی ناودێرکردووە. لەچاخی حەماسیدا گەڵاڵەی سەرجەم نووسراوە هزرییەکانی هیندی دادەڕێژرێت.

لە چاخی سوێترەدا بەرهەمی یەکجار تۆکمەی هزریی هیندی کە لەماوەی دەیان ساڵدا خوڵقابوون، بەشێوەیەک بڵاو ببووەوە کە لانیکەم دەبوا سەرچاوە سەرەکییەکەی کۆکرایەتەوەو پارێزگاری لێکرابا، هەروەها پێویست بوو ئەو بیروباوەڕە پرش و بڵاوە، رێکبخرایەتەوە. ئەم پلانە گرنگە لە سەردەمی سوێترەکاندا سەریگرت. سوێترە لەسەر بنەمای فەلسەفی و لە

قاڵبی دەقی یەکجار کورتدا نووسراوەو بابەتی زۆر بەپێزی کورت و پوختی تێدا گونجێندراوە. چاخی فێربوون کە لەسەدەی دووەمی زایینەوە هەتا سەدەی پانزەیەمی زایینی، درێژەیکێشا، لە سەردەمی دەسەڵاتدارانی هیندوودا بوو کە ئەدەبیاتی فەلسەفیی هیند هاتە ئاراوەو مشتومڕ و شەڕە دەندووک لە نێوانیاندا دروستبوو. بەهۆی ئەم مشتومڕەوە، شێوەی بیرکردنەوەو بەڵگەهێنانەوە بڵاوبووەوە. کۆمەڵێک چەمکی تایبەت بۆ هەر یەک لەنووسراوەکان هاتە ئاراوەو بەرهەمی یەکجار جوان خوڵقێندراو لەلایەن ئەو بیرمەندانەوە کۆمەڵێک لێکدانەوەو شیکاریی جوانیان بۆ کرا.

لەسەدەی حەڤدەیەمیشدا ئەم بیرکردنەوەیە لە هیند بەرەو لاوازی رۆیشت. لێرەدا هەوڵدراوە قۆناغەکانی ڤیدایی و حەماسی بخرێنەوە بەرباس.

پێش هاتنی ئارایییەکان بۆ دۆڵی سێند، لە رۆژئاوای وڵاتی هیند، شارستانییەتێکی مەزن کە لە ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا (٢٥٠٠ ساڵ) هاتبووە ئاراوەو پێکهاتەی شارنشینیش تیایدا شکڵی گرتبوو، بەتەواوی لەدۆڵی سێنددا زاڵ ببوو. دوو بەرهەمی مێژوویی یەکجار سەرنج راکێش لەم شارستانییەتە ماوەتەوە، کە یەکێکیان ناوی فەرهەنگی مۆهنجودرە لە خوارەوەی چۆمی سێند و ئەویدیکەشیان ناوی هێرەپایە لە دەوروبەری پەنجاب کە باس لەم شارستانییەتە دەکەن. ئەم شارستەنییەتە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هاوشێوەی شارستانییەتی میزۆپۆتامیاو سۆمەرییەکان بوو. ژیانی شارنشینی تیایدا پەرەیسەندووە، چەرخی سواڵەت سازی، خشت دروستکردن، قاپ و دەوری مسی، لەوێدا باوبووەو جیا لەمەش شێوە نووسینی وێنەیی بەکارهێنراوە کە دەرخەری هاوئاهەنگبوون لەگەڵ شارستانییەتی میزۆپۆتامیایە. لە عیلام (خووزستان) و میزۆپۆتامیا مۆرەکانی فەرهەنگی مۆهنجودر دۆزراونەتەوەو ئەمەش نیشانەیەکیدیکەی پەیوەندیی نێوان دوو شارستانییەتی میزۆپۆتامیا ـ "عیلامی و سێندی" یە. زۆر کەس شیمانەی ئەوە دەکەن کە خەڵکی دۆڵی سێند کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی شارستانییەتی میزۆپۆتامیایی و لەناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی

پێش زاییندا، ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر شکڵگرتنی شارستانییەتی دۆڵی سێند هەبووە.

پەیوەندیی شارستانییەتی کۆنی دۆڵی سێند بەشارستانییەتی ڤیداییەوە پرسێکی گرنگی دیکەیە کە لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا گەیشتە دۆڵی سێند. لە تێڕوانینی یەکەمدا، جیاوازیی ئەم دوو شارستانییەتە یەکجار زۆرە، چونکە شارستانییەتی ڤیدایی شارستانییەتێکی دەشتەکی بوو، لەحاڵێکدا کە شارستانییەتی مێژوویی دۆڵی سێند بەفەرهەنگێکی شارنشینی ئەژمار دەکرێت. هاوکات، شارستانییەتی ئاریایی، کاتێک گەیشتە دۆڵی سێند، ئاسنی ناسیبوو و چەک و قەڵغانیشیان لێدروستکردبوو، لەکاتێکدا شارستانییەتی دۆڵی سێند لەگەڵ ئاسن نامۆ بوو، ئەسپ لەشارستانییەتی ئاریاییدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، بەڵام پێناچێت شارستانییەتی دۆڵی سێند پێش هاتنی ئاریاییەکان کەڵکی لەئەسپ وەرگرتبێت. ئاریاییەکان باوەڕیان بەدوو گرووپی خواوەند هەبوو، لەحاڵێکدا خەڵکی خۆجێی دۆڵی سێند باوەڕیان بەدوو گرووپی خواوەندەکان و دژە خواوەندەکان، بیرۆکەیەکی باوی ئاسیای ڕۆژئاوا هەبوو. ئاریاییەکان ستایشی مانگایان دەکرد، لەحاڵێکدا خەڵکی خۆجێی دۆڵی سێند ستایشی گایان دەکرد. لە ئایینی ڤیداییدا خواوەندە مەزنەکان نێر (باوکسالاری) بوون. لەئایینی خۆجێییدا ستایشکردنی ئیلاهەی دایک و شیوا، وەک بناغەی ئایین دادەنرا. پەرستنی بت لەنێو خەڵکی خۆجێیدا باو بوو، لەحاڵێکدا کە ئاریاییەکان بت پەرستنەبوون و لەو باوەڕەدابوون کە خواوەندەکان جەستەیان نییە. هەروەها ئایین و ئەفسانەی خواوەندی میزۆپۆتامیا بەرواڵەتێکی خۆماڵییەوە لە دۆڵی سیندا برەوی باشی هەبوو، لەحاڵێکدا لەنێو ئاریاییەکاندا وەها ئایینێک رمێنێکی ئەوتۆی نەبوو.

بەم شێوەیە، دەبینـدرێت ئەم دوو فەرهەنگە بەگشتی لەرەهەندی چۆنییەتیی بیرکردنەوە و ژیانەوە لەگەڵ یەکتر جیاوازبوون.

هەر چەند شارستانییەتی ڤیدایی لەڕەهەندی سیاسی - نیزامییەوە بەسەر دۆڵـی سـێند و بەشـێکی بـەرفراوانی هیندوسـتاندا زاڵ بـوو. شارسـتانییەتی خۆجێی دۆڵی سێند و هەنـدێک لەناوچـەکانی دیکـەی هینـد، کاریگەرییـەکی قووڵیـان لەسـەر دوایـین پێکهاتـەی شارسـتانییەتی هینـد هـەبوو، تەنانـەت لـەدوایین بەرهەمـەکانی ڤیداییشـدا کاریگـەریی ئـەم شارسـتانییەتە بـەرروونی بەرچاو دەکەوێت.

خەڵکی خۆجێیەکانی دۆڵی سیند لە تۆرەمەی دراویدی بوون کە نەسـلی هۆزەکانی ئێستای باشووری هیندیش بۆسەر ئەو تۆرەمەیـە دەگەڕێنـەوە. لـە سەردەمانی زۆر دێریندا هۆزەکانی دراویدی لە بەلووچستانەوە هەتا باشووری ڕۆژهـەڵاتی ئێـران بـڵاو ببوونـەوەو تەنانـەت هەنـدێک کـەس پێیانوایـە هـۆزی عیلامـی لەگـەڵ دراویدییـەکان لـە ڕەچەڵـەکێک بـوون، هـەر چەنـد ئـەم پەیوەندییە نەژادییە هەتا ئێستا نەسەلمێنراوە.

ئارياييەكان كە لەنیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایینـدا گەیشتنە دۆڵی سێند بە ڕەچەڵەک هینـد و ئـەورووپایی بـوون، ئاریاییـەکان لەهـەزارەی چوارەمی پێش زایینـدا لە پێدەشتەکانی روسیای ناوەندیدا دەژیان. پاشان لە کۆتاییەکانی هـەزارەی چـوارەمی پـێش زاییـندا بـە شـێوەیەکی بـەرین بـەرەو ئەورووپای بـاکوور، ڕۆژئـاوا و باشـوور و هـەروەها بـەرەو سـیبریا و بـاکووری ئاسیای ناوەڕاست بڵاوببوونەوە. ئەو لقەی کە بەرەو ئاسـیا ڕۆیشـتن، هـەمان هیند و ئێرانییەکان (ئارياييەكان) بوون. کۆنترین بەرهەمێک کە لـە ئـاییـنی ڤیدایيـەكان بـەجێما، هۆنراوەکـانی ڤیـدایی بـوو، کـە هـەتا ڕادەیـەکی زۆر ناسێنەری فەرهەنگی هیند و ئێرانی بوون.

## ڤیداییەکان

ڤیداییەکان بریتن لە: ریگ ڤیدا (rg) ، یجورودا (yajur) ، سـامە ڤیـدا (sama)و ئـاتروە ڤیـدا .(atharua) هـەر گروپێکـی ڤیـدایی بـە دوو گروپـی سـمهتا (samhita) ، واتـە کۆمەڵـەی هۆنراوەکـان، و براهمنـە

(brahmana)دابـەش دەبـن. هـەر براهمنەیـەکیش بەسـەر دوو گرووپـی ئارنیکـە (aranyaka) ، کـە پەیوەنـدی بـە نزاکردنەوەیـە، ئوپەنیشـد (upanišad)، یان ئەوپانیشاد، کە باس لە فەلسەفەی ئیلاهـی و رێگـەی گەیشتن بەو دەکات، دابەش دەبن. ریگ ڤیـدا بـەگرنگترین و کۆنترین ڤیـدا دادەنـدرێت. ئـەم ڤیدایـە هـەزار و بیسـت و هەشـت هۆنراوەیـە. یجـووردا کاریگەری و رەنگدانەوەی شیعرەکانی ریگ ڤیـدای پێوە دیـارە. یجـووردا لـە دوو بـەش، واتـە یجـووردای سپی و یجـووردای رەش، پێکهـاتووە. یجـوردای رەش کۆمـەڵێک دوعـای تایبـەت لەگـەڵ شـرۆڤەکردنیانی تێدایـە کـە لـەکاتی قوربانیکردندا بـەکار هێنـراوە. یجـووردای سـپی تـەنیا دوعـای قوربـانیکردنی لەخۆگرتووە.

سـامە ڤیـدا بەتـەنیا بایـەخێکی ئـەوتۆی نییـەو زۆربـەی هۆنراوەکانیشـی لەریگ ڤیدا وەرگیراوە.

ئەتروە ڤیدا بە نـوێترین ڤیـدا ئـەژمار دەکرێـت، کـە یـەک لەسـەر پێنجـی نوسراوەکانی ریگ ڤیدایی تیایدا رەنگیداوەتەوە، بەڵام تایبەتمەندییەکەی لـەو کتێبـەدا، سـیحراویبوونەکەیەتی و لەروانگـەی هزرییـەوە لـە ریـگ ڤیـدا زۆر کۆنترو سـەرەتاییترەو بەشـێوەی تێـرو تەسـەلی پرژاوەتـە سـەر ئـەوەی، کـە لەرێگەی سیحرەوە، بەسەر هێزە شەرانگێزەکاندا زاڵ ببێت، هەروەها ئاوێنەی بیرۆکەی دەشتەکی و بەهێزبوونی لەنێو کۆمەڵی رۆحانییەکاندایە.

هەر چۆنێک بێت ریگ ڤیدا و ئاترەوە ڤیدا بە دوو ڤیدای سەرەکی ئەژمار دەکرێن. هەر چەند لەئەسڵدا تەنیا سێ ڤیدای یەکەم بوونیان هەبووەو دواتـر ئاتروە ڤیدا پێیان زیاد بووە .

ئەم هۆنراوانە زیاتر لە کاتی رێورەسمی قوربانیکردندا بەکارهێنراون. لـەم رێورەسمەدا، برهمەن بەخوێندنەوەی چەند پارچەیەک لە شـیعرەکانی ئـاتروە ڤیدا رێورەسمەکەی دەست پێدەکردو رۆحانییەکیدیکەش بەناوی هۆتری ریـگ ڤیدای دەخوێنـدەوەو رۆحـانیی سـێیەمیش بـەناوی ئوودگـاتری سـامە ڤیـدای

دەخوێندەوەو رۆحانیی چوارەمیش قوربانییەکانی دەهاویشتە نێو ئاگرەوەو دوعاکانی یجوور ڤیدای دەخوێندەوە.

براهمنەکان کۆکراوەی راڤەکردنی رۆحانییە شارەزاو پسپۆرەکان بوو. نووسراوەکانی بەسەر دوو بەشدا، دابەشدەبن: یەکەم ویدهی یان بڕیار و حوکمە ئایینییەکان و دووەمیش ئەرتە وادە، کە مانای ئەم یاسا و حوکمانەی لەخۆگرتووە. لەم بەشەدا، هەر ئایینێکی بەئەفسانەیەکی ئەمرییەوە گرێدراوە، لە راستیدا پێگەی مەعنەویی هەر ئایینێکیش دیاریدەکات.

ئەرەنیکە، کە بەکتێبی دارستان ناوبانگی دەرکردووە، تایبەت بۆ ئەو کەسانە نووسرابوو کە لە دارستانەکاندا تەنیاییان هەڵدەبژارد. ئەم کتێبە بەپردی پەیوەندیی نێوان براهمنەو ئووپەنیشد (ئووپانیشاد) دادەندرێت و رەنگی کردەیی بەبیروباوەڕ و مشتومڕە فەلسەفییەکان دەبەخشێت و رێگەی بۆ هاتنەئارای ئووپەنیشدەکان خۆشدەکرد.

شیعرەکانی ریگ ڤیدا لە ستایشی ئەفسانە و خواوەندەکانی ئارییاییدا هۆنراوەتەوە. لە رۆژئاوا زیاتر ئەم هزرە باوە کە ریگ ڤیدا ئاوێنەی باوەڕمەندبوون بەهێما سروشتییەکانە، بەڵام ئەم رەوتە بە تێپەڕبوونی زەمەن بەچەشنێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە، بەرەبەرە، بەشێوەیەکی پەتی، وەسفی خواوەندەکان تیایدا رەنگیداوەتەوە. بەگشتی تیایدا روانگەو بۆچوونێکی جیاوازتر بەدیدەکرێت و دەپرژێتە سەر لێکدانەوەی ریگ ڤیداو کۆمەڵێک چەمکی نوێی هزرە فەلسەفییەکان دەخاتەڕوو.

لەرۆژئاوا رێبازێکیدیکە بوونی هەبوو، کە لەسەر بنەمای پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان باس لە ئەفسانەکان دەکات. جۆرج دۆمزیل لە تیۆرییەکدا ئەفسانە هیند و ئەورووپاییەکان، لەسەر بنەمای نیزامێکی سێ رەهەندیی چینایەتیی باوی لەکۆمەڵگەدا لێکداوەتەوەو پێیوایە بەهەمان شێوە سێ چینی براهمنە، کشتریە و وەئیشیە لە هیندی ئارییایی بوونیان هەیە، لە

ئەفسانە ئارياييەكانيشدا دەتوانين سێ گروپی خواوەندی رۆحانييەكان، جەنگاوەران و بەرهەمهێنەران بەدیبكرێن.

يەكەم كەسی دەسەڵاتدار لەنێو ئەو سێ چينەدا، دوو رەهەندی جياوازی وەك سيستمی ياسايی و ئەخلاقی و هەروەها هێزی سيحر و جادوو لەخۆدەگرێت و پەيوەندیی بە دوو خواوەندی وەروونە و ميترەوە هەيە، هاوكات بە هاوشانی چينی رۆحانييەكان، كە هەمان براهمنەكان بن، ئەژمار دەكرێت. پلەی دووەم لەسيستمی ئيلاهيدا نوێنەرايەتيی هێزی خواوەند لەسەر زەوی دەكات، كە لە ئەستۆی ئيندرە (خواوەندی شەڕ) دايەو هاوتای چينی كێشەتريە، كە هەمان جەنگاوەران بن، دادەندرێت. پلەی سێيەم كە نوێنگەی فراوانی و بەرەكەتی سروشت و زەوييە، پەيوەندیی بە "دواشوين" ەوەيە و لەگەڵ چينی وەرزێرو ئاژەڵداردا بەراورد دەكرێت.

لەهيند كۆمەڵی خواوەندەكان بەسەر سێ چينی ئاسمانی، فەزايی و زەوينيدا، دابەشدەكەن:

١. خواوەندەكانی وەك ديئووس، وەروونە، ميترە و سووريە بەخواوەندەكانی ئاسمانی ئەژمار دەكرێن.

٢. خواوەندەكانی وەك ئيندرە و ئەپام نپات بەخواوەندە فەزاييەكانی نێوان ئاسمان و زەوی دادەندرێن.

٣. خواوەندەكانی وەك پێرێتووی، ئەگنی و سۆمە بەخواوەندە زەويينييەكان ئەژمار دەكرێن.

## خواوەندی مەزنی ڤيدايی

ديئووس بە =پێشينەترين خواوەندی ڤيدايی دادەندرێت، كە لە سەردەمی ڤيداييەكاندا جێگە بۆ خواوەندەكانی ديكە چۆڵ دەكات. ديئووس لەئەسڵدا خواوەندی ئاسمان بووەو بەرەچەڵەك هيند و ئەوروپاييە و لەگەڵ زيئووسی يۆنانی و رۆمی لە يەك تۆرەمەبوون. ديئووس لەگەڵ "پێرێتوو"ی هاوسەری، جووتەی لێكهەڵنەبڕاوی ئاسمان و زەويی پێكهێناوە. دواتر ديئيووس پێگەی

هەتا ئاستی خواوەندی ڕۆژ دادەبەزێت و ئەو بایەخەی پێشووی نامێنێت و وەروونە لە ئەدەبیاتی ئایینیدا جێگەی پێلێژکردووە.

ناوی وەروونە لەبەردەنووسراوە میتانییەکانیدا کە سەر هۆزە هیند و ئێرانییەکان بوون و لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایینیدا لە ڕۆژئاوای ئاسیا دەژیان، ماوەتەوەو ئەمەش دەریدەخات کە وەروونە پێش دابەشبوونی هۆزە هیند و ئێرانییەکان، بووە بە خواوەندی مەزنی ئەو هۆزانە. وەروونە خواوەندی مەزن لەهەموو شوێنێک بوونی هەیە، ئەو هەزاران هەزار چاوی هەیە، ئەو ئاگای لەهەموو شتێکەو هیچ کەس و هیچ شتێک لەو بەهێزتر نییەو فەرمانڕەوای هەموو جیهانە. نەزم و نیزامی مەخلووقات (rta)لەدەستی ئەو دایە. ڕتە وەکو ناموسی مەعنەوییەت و ئەخلاق ئەژمار دەکرێت. وەروونە بەرەکەتبەخش و بارێنەری بارانە.

مایا (maya) کە بەهێزێکی مەزنی جادوویی دادەندرێت لەژێر کۆنترۆڵی وەروونەدایەو بەیارمەتیی مایا جیهان کۆنترۆڵ دەکات.

لەدەقەکانی ریگ ڤیداییدا ناوی وەروونە لەگەڵ ناوی میترە دەهێنرێت. میترە بە خواوەندی بەڵێن و پەیمان، خواوەندی یاسا و دادوەری دەناسرێت، کە چاوهدێری و کۆنترۆلی پەیوەندیی نێوان خەڵک دەکات. بەم پێیە دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین کە وەروونە ئەرکی حاکمی لەئەستۆبووەو زامنی جێبەجێکردنی پەیمان و بەڵێنییەکانە، لەحاڵێکدا کە میترە پارێزەری داب و نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەو پتر لە پلەی "ڕۆحانی - مودیر"دا سەیر دەکرێت، بەهەر حاڵ میترە - وەروونە پەیوەندییەکی دوولایەنەو لێکهەڵکنەبڕاویان هەیەو بەیارمەتیی یەکتر چەرخی ڕۆژگار دەسووڕێنن و لەگەڵ یەکتر بەخاوەنی ڕەتە (مەخلووقات) ناویان دەبرێت.

پەیوەندییەکی قووڵ و پتەو لەنێوان وەروونە و ئەهوورامەزدای ئێرانییەکاندا بوونی هەیەو میترە هەمان میترەی ڤیداییەکانە، کە ئەرکێکی قورستری کەوتۆتەسەرشان.

هەر وەک باسکرا، ئیندرە خواوەندێکی فەزاییەو لەهۆنراوەکانی ریگ ڤیداییدا بەرێز و خۆشەویستییەکی یەکجار زۆرەوە ناوی هاتووەو سیما و کەسایەتیی ئینسانی بەخۆوە گرتووە. ئەو خواوەندی با و بۆران و هەورەتریشقەیە. چەکی دەستی ئیندرە وەجرە (گورز) بووە. ئیندرە خواردنەوەی نەمری، واتە سوومەی خۆاردۆتەوە. کاتێک کە ئیندرە هاتەسەر زەوی، ئاسمان و زەوی لەرینەوەو ترس و خۆفێک جیهانی داگرت، کە خواوەندەکان بە کۆمەڵ رایانکرد، ئەو بەهێز و باهۆدار بوو. بەئەندازەی هەموو جیهان گەورەبوو، هیچ خواوەندێک نەیدەوێرا شان لەشانی بدات.

شەڕکردنی ئیندرە لەگەڵ ئەژدیهایەکی زەبەلاح (ahi) بەناوی وەرترە بە بەناوبانگترین چیرۆکی ئەو دەناسرێت. وەرترە هەموو ئاوەکانی جیهانی هەڵقوراندبوو و لە خۆیدا رایگرتبوو، کە وشکەساڵی و قات و قڕیی لە جیهاندا پێکهێنابوو. ئەو دێوی وشکەساڵی بوو. ئیندرە لە چیاکاندا لەگەڵی بەشەڕهات و شکستی پێهێناو پاشان ئاوەکانی هێنایەوە سەر زەوی. بەم هۆیەوە، ئیندرە بە "ورترە هن"، یانی بکوژی ورترە ناودێرکراوە. لەراستیدا ئیندرە بەخواوەندێکی بەرەکەتبەخش و جەنگاوەر، ئەژمار دەکرێت.

لەئەدەبیاتی ڤیداییدا ئیندرە بەرەبەرە جێگە بە وەروونە لێژ دەکات و دەبێتە خواوەندی دۆڵی سێند. ئەگنی (ئاگر) خواوەندێکی مەزنیدیکەی ڤیداییەکانە، کە بە یەکێک لەخواوەندەکانی سەر زەوی ئەژمار دەکرێت. ئەگنی لەرێورەسمەکانی قوربانیکردندا، رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە. وەک میحرابی پیرۆزی ئاگر، کەڵک لەزاری وەرگیراوە. ئەو منداڵی زەوی و ئاسمان بووەو لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی داهێشتراوە. ( پێویستە لەبیرمان نەچێت یەکەمجار ئاگر لەهەورەتریشقەی ئاسمانەوە گەیشتە دەستی ئینسان و دواتر ئینسان خۆی توانیی بەرهەمی بێنێت). سەرچاوەی بەرهەمهێنانی ئاگر بەدەستی ئینسان، یەکەمجار جووتێک چێوی ئاگردەر بوو. ئەگنی لە ئاسمان هاوچەشنی هەتاوو لەفەزا هاوچەشنی هەورەوتریشقەبووە. ئەو پەیمان و پەیوەندیی نێوان خواوەند و ئینسانە.

## خواوەندی بەکۆمەڵی ڤیدایی

لەهۆنراوە ڤیدایییەکاندا، خواوەندەکان، بەکۆمەڵیش بوونیان هەیە، کە بەگشتی دابەشی سێ گروپ دەکرێن.

١. ئەدیتەکان کە خواوەندە فەرمانڕەواکان بوون.

٢. مەرووتەکان، کە خواوەندگەلێکی چارچەک بوون.

٣. وەسووەکان، کە بەخشندەی بەهرەو تەندروستیی ئینسان بوون.

ئەدیتەکان منداڵی ئەدیتەی مەزن بوون کە بەدایکی خواوەندەکان ناسراوە. ئەوان بریقەدار، زێڕین، پاک و هەڵسووڕێنەری رتە (rta) بوون. ئەدیتەکان لە: میترە، وەروونە، ئەریەمەن، بهگە، دکشە و ئەمشە پێکدێن.

مەرووتەکان کە بە "روودرە"ش ناوبانگیان دەرکردووە، لەشەڕە مەزنە ئەفسانەییەکاندا شانبەشانی ئیندرە شەڕیان کردووەو پشتیوانییان لێکردووە. سەرجەمی مەرووتەکان هاوتەمەن و برای یەکتربوون و هاوپەیمانی هەورەتریشقە بوون.

وەسووەکان خواوەندی ئاگر و خاک و با و هەوا و ئاسمان و مانگ و خۆر و ئەستێرەکان بوون. لە ئایینەکانی ئەم دواییانەی هیندیدا، وەسووەکان، بۆ ئاسمانی هەشت قات، گۆڕانیان بەسەردا دێت.

## وەرچەرخانی ڤیدایییەکان

لەدوایین ڤیداکاندا وەرچەرخانێکی مەزن لە سیستمی هزریی هیندیدا بەرچاو دەکەوێت، کە دەکرێ وەک گرنگترینیان ئاماژە بەخواوەندێکی یەکتا بکرێت، کە بە تێپەڕبوونی زەمەن، سەرجەم خواوەندەکانیدیکەی خستەژێر کاریگەریی خۆیەوە. ئەم خواوەندەی هەموو جیهان، بەناوەکانی ویشوە کرمە، پورووشە و پەرجاپتی ناویدەبرێت. ئەو ئافرێنەری جیهانە. ئایینی ویشوە کرمە لەکۆتایی هۆنراوەکانی ریگ ڤیداییدا دێتە گۆڕێ و بەئافرێنەری هەموو جیهان ناوبراوە. ویشوە کرمە بەواتای "ئافرێنەری هەموو جیهان"ـە، ئەو چاودێریی هەموو شتێک دەکات، هەموو شتێک دەناسێت، دەست و لاقی

بەرەو هەموو شوێنێک راکێشاوە. ئەو رۆحانیی شکۆمەند (hotr) ، خواناس (rsi)ـە، ئەو زەوی و ئاسمان رێکدەخات.

ویشوە کرمە لەریگ ڤیدای دەیەمدا بە پەرجاپتی ناویدەبرێت، کە بەفەرمانڕەوای هەموو بوونەوەرەکانی جیهان دەناسرێت و جیا لەویش هیچ خواوەندێک بوونی نییە.

## ئافراندن

لە سەرەتادا هیچ شتێک لەگۆڕێدا نەبوو، ئاوێکی رەش هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو. ئاوەکان کەوتنە خرۆش و لەئەنجامدا بەهۆی تین و گەرماوە، خۆری ئاڵتونی بەرەو ئاسمان هەڵزنی، کە پاشا (pati)ی هەموو مەخلووقات و جیهان بوو. ئەو سکی بەویشوە کرمە پڕ بوو. پاشان ژنێک، دواتر مانگایەک و دواجاریش ویشوە کرمە، یان پەرجاپتی، زەوی و ئاسمانی خوڵقاند.

بەم شێوەیە، لە سەرەتادا بەرەوڕووی پاڵنەری یەکەم دەبینەوە، کە مادەی خاوی جیهان ناچار بەجووڵە و دروستبوونی تین و گەرما دەکات، پاشان یەکەم خواوەندی لێدروست دەبێت.

لە هۆنراوە ریگ ڤیداییەکاندا ئافراندنی جیهان بەهۆی قوربانیکردنێک دێتە ئاراوە. هەموو ئازای ئەندامی ئەم بوونەوەرە لەبەر یەک هەڵدەوەشێت و لەهەر یەکەیان بەشێک لەجیهان دروست دەبێت. ئەم ئەفسانەیە زیاتر بەپورووشە ناوبانگی دەرکردووە. ئەم دوو روانگەیە لەکۆتایی هۆنراوەکانی ریگ ڤیداییدا دێنەئاراوەو پاشان لەڤیداکانیدیکەو بەرهەمەکانی دوای ڤیداکانیشدا رەنگدەداتەوە، کە پێدەچێ بۆ سەر بناغەی کۆنی بیروباوەڕی خەڵکی خۆجێی دۆڵی سێندی پێش هاتنی ئاریاییەکان بگەڕێتەوەو هەروەها لەگەڵ بیروباوەڕی میزۆپۆتامیایی و زەروانیی ئێرانییەکانیش وێکچوویەکی زۆری هەیە.

## ئایینەکان

ڕێوڕەسمەکانی قوربانیکردن بە سەرەکیترین باسی نێو ڤیداکان ئەژمار دەکرێن، بەهەمان شێوە کە لە ئایینەکانی ئاسیای ڕۆژئاواو ئایینەکانی هیندو ئەورووپاییدا باوبووە. لەدوایین ئەفسانەکانی ڕیگ ڤیداییدا، پوروشە وەک هێمای یەکەم قوربانی سەیر کراوەو لە هۆنراوەیەکدا بەناوی پورروشەو سوکتە ناوی هاتووە. پورروشە هەزار سەر، هەزار چاو و هەزار لاقی هەبووە، بە ئەندازەیەک گەورەبووە، کە کاتێک بە دەوری زەویدا هاڵاوە، دیسان لە زەوی درێژتر بووە. دواتر خواوەندەکان پورروشەیان کردۆتە قوربانی. لەنێو زاری پورروشەوە براهمنەکان (ڕۆحانییەکان)، لە مەچەکییەوە جەنگاوەران، لە ڕانەکانیشی وئیشیەکان (چینی سێیەم)و لە هەر دوو لاقیشی شوودرە دروستبوو، کە بەخراپترین و پیسترین کۆمەڵ دەناسرێن. لە چاوەکانییەوە هەتاوو لە زارییشییەوە ئیندرە و ئەگنی سەریان هێنایەدەر، لە قۆناغەکانی دواتریشدا پورروشە، یان یەکەمین قوربانی، لەهەمبەر پەرجاپتیدا رادەوەستن .

ئەم قوربانیکردنە پیرۆزە، بەمانای ئەوەیە کە هەست و نەست تەنیا بە خۆبەخشی و لەخۆبوردوویی بەدیدێت و ئەگەر ئینسانیش ڕێزی ئەم لە خۆبوردووییە بگرێ، ئەشێ لەبەر ڕاگرتنی یادی ئەم قوربانییەدا هەوڵی بێوچان بدات و دانە بەدانە ئەندامانی لەشی کۆبکاتەوەو بیانخاتەوەسەریەک.

ئینسان هەموو ساڵێک لەهەمبەر میحرابی ئاگرو لەڕێوڕەسمێکی پیرۆزدا، نەریتی یەکەم قوربانیکردنی دووپاتدەکردەوە، بەمەش نە تەنیا دەبووە شەریکی ئاکاری خواوەندەکان، بەڵکو بەشێوەیەکی ئایدیالی هەوڵی هەڵوەشاندنەوەو سەرلەنوێ ئافراندنەوەی جیهان و مەخلووقاتی ئەدا. ئەم کارەی ئەو لەجیهانی بچووکدا هاوتای کاری ئەو خواوەندانەبوون، کە لە جیهانی گەورەدا خەڵکیان دەکردە قوربانی. بەهەر حاڵ قوربانیکردنی ئینسان بەپێی تێپەڕبوونی زەمەن لەمەڕ ڕزگاربوون لەدەست ناپاکی و خراپەکاری گۆڕانی بەسەردا دەهات.

نەریتی قوربانیکردن لەوڵاتی هیند بەچەشنێک بڵاوبووەوە کە بەرەو زێدەڕۆیی پەلیهاویشت و لە ئەنجامدا کاروباری ئایینی و مەعنەوی سنووردارکرا .

قوربانیکردنی ئەسپ و چوارپێ، ئەوەندە بەرین بوو کە گسکی لە خەزێنەی پاشای هیندووەکاندا. تەنانەت بیروباوەڕی ئایینی لە هەمبەر نەریتی قوربانیکردندا کەمڕەنگ ببووەوەو گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆی نەمابوو .

بەم هۆیەوە لە کۆتایی ڤیداییەکاندا شۆڕشێک لەدژی نەریتی قوربانیکردن سەریهەڵداو ئووپەنیشد (ئووپانیشاد) رێکخراو قوربانیکردنی جەستەیی بۆ چلەکێشی و داوێن پاکی گۆڕدرا.

## خواوەندەکانی شەڕ و ئاژاوە

لەهۆنراوەکانی ریگ ڤیدا ـ جگە لە دەیەمین بەشی ئەو کتێبە ـ باس لەگروپێکی دیاریکراوی هێزی خواوەندی شەڕ بوونی نییە، بەڵکو باس لە دوژمنایەتیی نێوان دێو و خواوەندێکی تایبەت دەکرێت و بەگشتی باس لە شەڕی ئیندەر لەگەڵ ئەژدیهایەک بەناوی وەترە لەگۆڕێدایە. وردە وردە هەتا بەشی دەیەمی ریگ ڤیدا، کە بەنوێترین و دوایین بەشی ریگ ڤیدا دادەنرێت، گروپی خواوەندەکانی خێر لەهەمبەر گروپی خواوەندەکانی شەڕدا شکڵ دەگرن. لە کتێبی دەیەمی ریگ ڤیدا، بەجێگەی دوو گروپی خواوەندەکانی خێر کە لەدەسپێکی ریگ یدادا بەئەسوورەو دێو دەناسران، دوو گروپی خواوەندەکانی خێر و شەڕ دێنەگۆڕێ. لە راستیدا ئەسوورەکان، کە خواوەندەکانی خێر و چاکە بوون، لەو قۆناغە بە دواوە بۆ خواوەندەکانی شەڕو ئاژاوە گۆڕانیان بەسەردا هات. هەروەها وەروونە خواوەندی مەزنی سەرەتای ریگ ڤیدا، لەمەودوا بەیەکێک لە هێزەکانی شەڕ و ئاژاوە لەقەڵەم ئەدرێت.

ئەم وەرچەرخانە، هەروەک لە دەسپێکیشدا ئامـاژەی پێکـرا، ئاکـامی کاریگەرییـەکانی سیستمی فیکری و فەرهەنگیی ئاسـیای رۆژئـاوا بـوو، کـە باوەڕیان بە دوو گرووپی خواوەندەکانی خێرو شەڕ هەبوو. لەئێرانیش ئـەم وەرچەرخانـە روویـدا، بـەڵام بەپێچەوانـەی هینـد، خواوەنـدەکانی خێـر بـە ئەهوورە (هاوتای ئەسوورە)و خواوەندەکانی شەڕ بەدێو ناسران .

لەریگ ڤیداییدا باس لە گرووپێکی خواوەندەکان دەکرێت کە بەپـەنی ناودێرکراون. پەنییەکان کۆمەڵێک بوونەوەری خەیاڵی بوون، کە هەنگوین و مانگاکانیان لە خەڵک شاردبووەوەو خەزێنە ئاسمانییەکانیشیان لەدەستی خواوەندەکان دوورخستبووەوە .

داسـە (dasa) یـان دسـیوو (dasyu) بـەرەورووی هێـزە شەڕانگێزەکانی فەزایی دەبنەوە. لەئەسڵدا، داسە ناوی خەڵکی خۆجێی هیند بوو، بەڵام لە ریگ ڤیدادا سیما و هەیمەنـەی ئەفسانەییان پێ بەخشرابوو. داسە زۆرتر بەو کەسانە دەگوترا کە ئیندرە لەناوی بردبوون.

ورترە (ئەژدیها) دوژمنـی سـەرەکی و ناسـراوی خواوەنـدەکان، بەتایبـەت ئیندرە بوو، کـە بەدەسـتی ئینـدرە کـوژرا. شـەڕی وەرتـرەو ئینـدرە، هـەموو ساڵێک لەئارادابووە.

### لێکدانەوەی ئەنجامەکان

لە هۆنراوە ڤیداییەکاندا ئامارەیەکی کـورت بەمـەرگ کـراوەو ئەگـەر تـەنیا باسیشـی کرابێـت، ئـەوا ئامـاژە بـەمردنی دوژمنـان کـراوە. پێـدەچێ هـەم سووتاندن و هەم بەخاک سپاردنی مردووەکـان هـەبووبێت، بـەڵام سـووتاندن باوترین شێوە بووە کە لەئارادا بووە. ئـەوان پێیـان وابـوو کـە رۆحـی پیـاوە مردووەکـان لەگـەڵ ئـەو دووکەڵـە بـەرەو ئاسـمان هەڵـدەزنی. لەتەنیشـت مردووەکانـدا جلوبـەرگ و زێڕەکانیشـیان دادەنـا بـۆ ئـەوەی لـەو جیهانـەیتر بـەکاریان بێنێـت. هـەروەها ژن و چەکەکانیشـیان لـەئاگردا دەسـتووتاند بـۆ ئـەوەی لـەو جیهانـەیترش لەگەڵیـدابن. رۆح هـەتا هـەتایی دەبـووەوەو تـەنیا

تەرمەکان لەناو دەچوون. ڕۆحەکان لەپاش مەرگ لەگەڵ ڕۆحی ئەژدادی خۆیان بەرەو جیهانی ڕووناکی دەڕۆن، لەوێش باوانی خۆیان دەبینن کە لەگەڵ یەمە لەباشترین ئاسماندا ژیان بەسەر دەبەن. بەم پرۆسەیە دەگوترێ "گەڕانەوە بۆ ماڵەوە". یەمە لەوێ شوێنێکی حەسانەوەی پێدەبەخشێت.

هەندێک جار بەهەشت لەئاسمان و هەندێک جاریش لەباشترین ئاسمان و جار جارەیش لەئاسمانی سێیەمدایە. نورێکی هەتا هەتایی ئەوێی ڕووناککردۆتەوەو ئەدرەوشێتەوە. بەهەشت شوێنی باوکانەو هەندێک جاریش بەهەشت بە هەتاو دەگوترێت کە پەیوەندی بە شۆقەکانییەوە هەیە. وینشور بە سێ شەقاو دەگاتە بەهەشت.

ئەستێرە درەوشاوەکان هەمان ئەو خەڵکە داوێن پاکانەن کە بەرەو جیهانی ئاسمانی ڕۆیشتوون. یەمە لەبەهەشت هاوڕێ لەگەڵ خواوەندەکانیدیکە لەژێر دارێکدا دانیشتوون و سەرقاڵی خواردنەوەن. ئەم دارە هیندێک جار بە دار هەنجیر ناویدەبرێت. ئەوانەی کە بەرێژەیەکی زۆر قوربانییان کردووە، ئەوانەی کە لەنێو شەڕەکاندا کوژراون و ئەوانەی داوێن پاک بوون، هەموویان بەهەشتین. لەبەهەشت هەموو ئاوات و خۆزیاکان دێنەدی. پیری و بەساڵاچوویی لەگۆڕێدا نامێنێ و هەموو کەس بەرەو تەمەنی گەنجی و جوانی دەگەڕێتەوە. باوک، دایک و منداڵ چاویان بەیەکتر دەکەوێتەوەو بەیەکەوە هەتاهەتایە ژیان بەسەر دەبەن. نەخۆشی قەرەی کەس ناکەوێت و ئەوانەش کە بە کەمئەندامی دەمرن، لەو جیهان لەشساغ و تەندروست دەبنەوە.

لەریگ ڤیداییدا هیچ باسێک لە ژیانەوەو مردنی سەرلەنوێ لەئارادا نییەو ئینسان تەنیا یەکجار لەدایک دەبێ و یەکجاریش دەمرێ.

لەدەقە کۆنەکانی ریگ ڤیداییدا باسی جەهەنەم نەکراوە، بەڵام لەکۆتاییەکانی چاخی ریگ ڤیداییداو لەو سەردەمە بەم لاوە چەشنێک بیروباوەڕی تایبەت بە جەهەنەم دێتەئاراوە. هەروەها باس لەماڵی ژێر زەوی

دەکرێت کە بۆ شوێنی سیحرباز و ژنە خراپکارەکان تەرخانکراوە کە بە naraka _loka ناودێر کراوەو بە "گەورەترین تاریکی" ناوبانگی دەرکردووە.

لەنووسراوە ڤیداییەکاندا هیچ باسێک لە لێپرسینەوەی پاش مەرگ و پاداشتکردن و سزادان ناکرێت.

## ئووپەنیشدەکان (ئەوپانیشاد)

ئوپەنیشدەکان بەدوایین بەشی ڤیداییەکان ئەژمار دەکرێن و بەم هۆیەوە بەVedantaدوا ڤیدا ناسراوە. لەو چاخەدا سێ بەرهەمی وەک: براهمنەکان، ئەرنیکە و ئوپەنیشد بوونیان هەیە، کە سەرجەمیان باسی ڤیداکان دەکەن. گومان دەکرێ کە براهمنەکان لەڕێوڕەسمی ئاینیی بنەماڵەییداو ئەرنیکەکان بۆ خەڵوەتکردن و تەنیایی، لەنێو دڵی دارستانەکاندا بەکار هێندرابن، یان بۆ ژیان و گەشەکردن لەنێو دارستانەکاندا کەڵکیان لێ وەرگیرابێتarabyaka . دارستان نشین، نووسراوەکانی دارستان، ئەوپەنیشدەکان بۆ ئەوانە نووسراوە کە لە شەڕەشەقی زەمانەو گێژاوی ژیان و جیهان رایانکردووەو روویان لە پاقژکردنەوەی دەروونی خۆیان کردووە بۆ ئەوەی دەستیان بەئازادی و رزگاریی یەکجاری رابگات.

ئوپەنیشدەکان کۆمەڵە نووسراوەیەکی شاراوەن، کە بەڕێگەی ماریفەت و رزگاری ناسراونMarga ; jan. na) jnana. Marga رێگە یان کۆمەڵە رێگەی روونبوونەوە، لە بەرانبەریشدا رێگەی کردەوە (karma, marga)و چۆنییەتیی بەڕێوەبردنی رێوڕەسمە ئاینییەکان، کە پەیوەندیی بەبراهمنەکانەوە هەیە.

لەئاینی ڤیدایی هیندیدا، براهمنە رێگەی دینداری و ئوپەنیشد رێگەی خواپەرستی بوو. رێگەی دینداری رێگەیەکی دنیایی و رێگەی هاندان و رێنوێنیکردن بەرەو چاکە و رێگەی مەعنەوی بوو، کە لەئەنجامدا تەنیایی لێدەکەوێتەوە. ئوپەنیشد دەڵێ تەنیا لەرێگەی ماریفەتەوە جیهانی

خواوەندەکان بەرووتاندا دەکرێتەوە، لەحاڵێکدا کە پەیڕەوانی ڕێگەی دینداری نــاتوانن دەســتیان بــەجیهانی خواوەنــدەکان رابگــات. ئــەم وەرچەرخانــە لەبراهمنەوە بۆ ئوپەنیشد بە شێوەیەک وەرچەرخانی بەسەردا هات کە تیایدا پرسە مادییەکان بـۆ مەسـەلە مەعنەوییـەکان گـۆڕدران. لـە ئەوپەنیشـدەکاندا باسی مەسەلە و نهێنییە دەروونییەکانی ئینسان دەکرێت و ئینسـان دەسـتی بە چەمکە شاراوەکان رادەگات و نهێنییە شـاراوەکان بـە کـەیفی دڵـی خـۆی ئاشکرا دەکات.

ناسین و بەکردەییکردنی راستییەکان ئامـانجی سـەرەکیی ئوپەنیشـدەکان بوو، کە بە (ئاتمەن) ناودێرکراوە. ئەو ئینسـانانەی خوازیـاری روونبوونـەوەو تێگەیشتنن، تەنیا لە ڕێگەی بیرکردنەوەو پەنابردن بۆ جیهـانی هـزر و ئـاوەز دەتوانن بناغەی هەستیی جیهان بدۆزنەوەو لەدەروونی خۆیاندا بەدوای کلیلی نهێنییەکانی جیهاندا بگەڕێن، نەوەک لەرێگەی مادیات و قوربانیکردنەوە.

لەسەردەمی براهمنەکاندا قوربانیکردن لەنێو ئاوو ئاگردا ڕێگـەی رزگـاری بـوو، بـەڵام لـە سـەردەمی ئوپەنیشـدەکاندا قوربـانیکردن تـەنیا لـەدەروونی تاکەکاندا ئەنجام ئەدرا، کـە ئـەو قوربانیکردنـە هـەمان چلەکێشـی بـوو. ئـەو چلەکێشییە بـەقوربانیکردنی دەروونـی بـۆ ئـاگر نـاودێرکرابوو antaram (agnihotran، قوربــانیکردنی دەروون). پــەیڕەوانی ئەوپەنیشــدەکان، خۆیان لەبەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ئایینی قوربانیکردنی دەروون، دەبوارد.

بـەدەروونی بوونـەوەی ڕێوڕەسـمی ئـایینی و قوربـانیکردن، واتـاو مانـای ستایشـکردنیش گـۆڕانی بەسـەردا هـات. ئینســان بـوو بەپەرسـتگەیەک و خولْقێنـەرو مـەخلوقاتیش بوونـە جەسـتەو روحـی تاکـەکان. ئینسـانێک ئـەم قۆناغانــە تێپــەڕ بکــات، بــەرەو ئاســمان و خواوەنــد هەڵــدەزنێت و پــاش تێپەڕاندنی چەند ئاسمانێک، چاوی بە برەهمەن ـ خواوەندی یەکتا ـ دەکەوێ و لێیدەپرسێ "ئەتۆ کێی"، و لە وەڵامدا دەڵێ "ئەتۆ هەر شتێک بیت، منیش هەر هەمان شتم". ئەمە تەنیا رۆحی ئینسانە کە بەنەمری دەمێنێتەوە، دەنـا جەسـتەی ئینسـان لـەناو دەچێـت. ئـەویش جەوهـەرەو وجـوودێکی ئیـزەدی

هەیەو سەربە جیهانی توخمەکانە. بەم پێیە، وجود لە ئەنجامی پەیوەندیی نێوان جیهانی مادی و جیهانی زەینیدا دروستبووە. بەکەڵکوەرگرتن لەهەستەکانی خۆمان، دەتوانین جیهانی مادی هەست پێبکەین و وێناکردنی زەینیی خۆیشمان لەرێگەی هەستەکانمانەوە لەجیهانی مادیدا دەرببڕین. بەم شێوەیە جیهانی مادی و وێناکردنی زەینی و دەروونی لەرێگەی هەستەکانی ئینسانەوە لە یەکتردا رەنگئەدەنەوە و لە ئەنجامدا، دژایەتی و دوفاقەیی ئەو دوو جۆرە جیهانبینییە نامێنێ و یەکگرتنێک رووئەدات.

ئوپەنیشدەکان بەپێی نەریتی خۆیان، تەنیا کەسانێکیان رادەهێنا کە بۆخۆی بەهرەیەکی زانایی تێدابوایەو شیاوی فێربوون بونایە.

تەنیا کۆنترین ئوپەنیشد بەشێوەی پەخشان نووسراوە، بەڵام ئەوانیدیکە سەرجەمیان لەقاڵبی هەڵبەستدا هۆنراونەتەوە، کە بەشرووتی (شیعر نووسراوەی پیرۆز) ناویاندەبرێت. کۆنترین ئوپەنیشد پێش بوودابیەکان و لە ساڵەکانی ۸۰۰ هەتا ۵۰۰ ساڵ پێش زایین نووسراوە. هەنووکە نزیک بە ۲۰۰ ئوپەنیشد لەبەردەستدایە.

مەسەلەی بنەڕەتیی ئوپەنیشدەکان لەپلەی یەکەمدا وێکچووی دوو ئەسڵی ئاتمەن (رۆحی کەسیەتی و کۆتایی خۆمان) و برەهمەن (خواوەندی یەکتا) بوونیان هەیەو پاشان باسی باوەڕمەند بوون بە پانتەئیزم (pantheism)دێتەئاراوە، کە بەو پێیە یەکگرتن لە زۆراییدا بڵاودەبێتەوە و زۆرایی لەیەکگرتندا رۆدەچێت و سێیەمیش هەبوونی خواوەندێکی یەکتایە، کە فەرمانڕەوایی بەسەر هەموو جیهاندا دەکات.

ئاتمەن لەنێو ریگ ڤیدادا، هەم بە زاتی هەموو جیهان و هەم بەنەفسی ئینسانەکان دەگوترێت. لەنێو ئوپەنیشددا ئاتمەن ناوێتەی زات و راستیی نێو دەروونی ئینسان بووەو هاوتای برەهمنە ئەژمار دەکرێت. ئینسان بە جیهانی بچووک و پاشان (برەهمەن) جیهانی گەورە لە قەڵەم ئەدرێت.

ئاتمەن بێسنوورەو لە توانای تێگەتشتنی و بیرکردنەوەی ئینسانەکان بەدەربووە. ئەو بەزەمان و زەمینەوە نەبستراوەتەوە. لەهەموو شتێکی گەورە گەورەترو لە هەموو شتێکی بچووکیش بچووکتر بووە .

برەهمەن بەنموونەترین بنەمای جیهانی مادی ئەژمار دەکرێت، بەهەمان شێوە کە ئاتمەن بەنمونەترین بنەمای جیهانی دەروونی و زەینی دادەندرێت. برەهمەن هەم گەڕۆکە، هەم سەقامگیر، هەم نزیکەو هەم دوور. ئەو لە هەموو شوێنێک بوونی هەیە. هەموو شتێک لەژێر دەستەڵاتی برەهمەندایەو هەموو شتێکیش پەیوەندیی بەبرەهمنەوە هەیە. پانتەئیزم رەگاژۆی نێو ڤیداکان بووە، بەڵام لەڕێبازی ئوپەنیشددا گەشەی کردووە.

ئوپەنیشد باسی لەرزگایی ئینسانەکان کردووە. دوو دانە رێگە لە بەردەم رۆحی پاش مەرگدایە. یەکەم رێگەی خواوەندەکان و دووەمیش دەتوانێ رێگەی بابوباپیران بگرێتەبەر. لە ڤیداکاندا باسی رێگەکانی بەردەم رۆحی پاش مەرگ نەکراوەو ئەم باسە تەنیا لە ئوپەنیشدەکاندا بوونی هەیە. ئەو رۆحانەی کە تێکەڵی جیهانی بابوباپیران دەبن، لەوێوە بەرەو ئاسمان و لەوێشەوە بەرەو مانگ دەڕۆن و لەوێش هەتا ئەو کاتەی توێشووی کردەوە چاکەکانی خۆیان لەسەر زەوی پێبێت، دەمێننەوەو بەئاسوودەیی ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئەو توێشووە تەواوبوون، لەو رێگەیەوە کە پێیدا رۆیشتبوون، دەگەڕێنەوەو سەرلەنوێ لە جەستەیەکی دیکەدا خۆدەنوێننەوەو ژیان دەست پێدەکەنەوەو لەم جیهانە کاکیبەکاییەدا سەرلێشواو دەمێننەوە.

تەنیا زانایان دەتوانن رێگەی خواوەندەکان بدۆزنەوە. ئەمانەش لە پاش مەرگ بەتەدارەکێکی تایبەتییەوە بۆ لای برەهمنە دەگەڕێنەوە، کە ئەمەش هەمان رێگەیە، کە ئەگنی خواوەندی ئاگر پیایدا تێپەڕیوە.

هەرکەس باوەڕی بەخواوەندەکان هەبێت، لەجیهانی لەدایکبوون و مردن رزگاری دەبێ و تێکەڵی سمسارە دەبێت، کەهەمان رێگەی گەڕانەوەیە.

کەوابوو، رزگاربوونی رۆح پەیوەندیی بە ئاکارو کردەوەی ئینسانەکانەوە هەیە. خواستی رۆح بە هەر چەشنێک بێت، ئیرادەکەیشی بەهەمان شێوە دەبێت، ئیرادەکەی بەهەر شیوەیەک بێت، ئاکار و کردەوەیشی بەهەمان شێوە دەبێت، هەر کارێکیش رۆح ئەنجامی بدات، بە هەمان ئەندازە بەرهەمی دەبێت. بەم یاسایە، یاسای کردەوەو رێزلێنان (کەرەمە) دەگوترێت، (هەر شتێک بچێنی هەمان شتی لێئەڕنیتەوە). ئەم یاسایە لەئوپەنیشدەکاندا خواست و مەیلی تاک، ئاکار و کردەوە دیاری دەکات. ئەم یاسایە پێش ئوپەنیشدەکانیش لەگۆڕیدابووەو تەنیا لەماوەیەکی زەمنیی دیاریکراودا قەتیس نەماوەتەوە. لە راستیدا، لە ئوپەنیشدەکاندا ئەوە مەیل و خواستی ئێمەیە کە ئاکار و کردەوەی ئێمە دیاریدەکەن و ئیختیاری تەواوی هەیە، لەحالێکدا لەنووسراوەکانیدیکەدا، ئەو یاسایە بەپێی ئەو کار و کردەوانەبوون کە ئینسانەکان رۆژانە ئەنجامیانداوەو لەم حاڵەتدا بۆ دەسەڵاتییەک بەسەر چارەنووسی تاکدا زاڵ دەبێت، هەرچەند تاک دەتوانێ لەئەنجامدا بەسەریاندا زاڵ ببێتەوە.

بەم پێیە، یاسای کەرەمە لەئوپەنیشدەکاندا شکڵ دەگرێ و لەئایینەکانیدیکەدا گۆڕانی بەسەردا دێت.

## مەسەلەی رزگاری

هەموو ئایینە هیندییەکانیش وێکچووی ئایینەکانی ئاسیای رۆژئاوا، باسی مەسەلەی رزگاری و ئازادی دەکەن و بەئامانجی ژیان و رزگاربوون لە شەهوەتی لەقەڵەم ئەدەن. لەم جیهانەدا، کە ئینسان دەبێ لەدایک ببێت و بشمرێت، رێگەی رزگاری بەتاقە رێگەی حەسانەوەو بەختەوەریی هەتاهەتایی ئەژمار دەکرێت.

بۆ رزگاربوون دەبێ ئاتمەن (رۆحی کەسیەتی و کۆتایی خۆمان) بناسین، لەرێگەی خۆپارێزییەوە لە نهێنییەکانی دەروونی خۆمان ئاگادار بین. خۆمان لە خەم و شادی رزگارکردووە. ئاتمەن راستییەکە هەرگیز نەدەمرێ و

نەدروستیش دەبێت. نە لەهیچ شتێک دروست بووەو نە هیچیش دروستیکردووە. ئەو نەمرەو ئەگەر بشمرێت، جەستەی لەناو ناچێت. ئازادی و رزگاری تەنیا لەرێگەی ناسینی ئاتمەن (رۆحی کەسیەتی و کۆتایی خۆمان)ـەوە دەستەبەر دەبێت.

## ئەفسانە برەهمەنییەکان

بەپێی ئەفسانە برەهمەنییەکان، جیهان، کۆمەڵێک قۆناغی بێ کۆتایی وەکو "ئافراندن و لەناوچوونی" تێدایە. ئەم دوو قۆناغە ماوەی سەد ساڵ لەتەمەنی خواوەندی مەزن برەهمەن (برەهما) لەخۆدەگرن. لەکۆتایی هەر قۆناغێکدا هەموو شتێک لەناو دەچێت، تەنانەت برەهمەن، خواوەندەکان، پیرۆزییەکان، بوونەوەرە ئەهریمەنییەکان، ئینسان، ئاژەڵ و مادە، بەشێوەیەکی گشتگیر لەناو دەچن. ئەم لەناوچوونە سەد ساڵ دەخایەنێت. دواتر برەهمنەێکیدیکە (برەهما) سەرهەڵئەدات و قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات. لەم سیستەمەدا کۆمەڵێک دابەشکاریی لاوەکی بوونی هەیە. کلپە لە هەموویان گرینگترە، کە ماوەی یەک رۆژ لە تەمەنی "برەهمەن"ـەیە کە لەگەڵ ٤/٣٢٠ ملیۆن ساڵ لەسەر زەوی بەراورد دەکرێت. کاتێک برەهمەن لەخەو هەڵدەستێت، سێ جیهانی (ئاسمانەکان، ناوەڕاست و ژێرەوە) دروستدەبن و کاتێکیش خەوێ لێدەکەوێت، جیهان تووشی ئاژاوەو هارووژان دەبێت. لە هەر بەیانییەکی برەهمەییدا ئەو بوونەوەرانەی رزگارییان بووە، دەبردرێنە دیوانی خواوەند و دادگایی دەکرێن و دەبێ چاوەڕوانی سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی خۆیان بن. هەر کلپەیەک بەسەر یەک هەزار زەمانەی دوور و درێژ، دابەش دەکرێت و هەر مهایووگە بەسەر چوار یووگەدا دابەشدەکرێت، کە بریتین لە: "کریتە، تریتا، دواپرە و کەلی.

کریتەیووگە سەردەمێکی زێڕینە کە بە ماوەی ١/٧٢٨/٠٠٠ ساڵ بەردەوام دەبێت کە تیایدا درمە، خواوەندی یەکسانی و ئەرک، چوارپێیەک دەئاژوێ و

خەڵکیش بەختەوەر و تەندروست ژیان بەسەر دەبەن و تەنیا یەک خواوەند بەناوی بەرەبەیان دەپەرستن.

تریتە یووگە ماوەی ...١/٢٩٦/ ساڵ دەخایەنێت، ئەم سەردەمە بەختەوەرییەکی کەمتری تێدا بەدیدەکرێت و خۆپارێزی و داوێن پاکی یەک لەسەر چوار کەم دەبێتەوەو درمە لەسەر سێ لاق بەرێگەدا دەڕوات. خەڵک بەگشتی سەرقاڵی تێپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆیانن، هەرچەند ڕۆژانە بەکاری تایبەتی و دابینکردنی بژێویی ژیانی خۆیانەوە سەرقاڵ دەبن و جارجارەش شەڕانگێزیان لێ دەردێت. بابووباپیرانیان زیاتر لە خەڵکانی خراپکار پێکهاتوون و خواوەندەکانیش ڕەنگی سووریان هەیە. لە سەردەمی دواپرەیووگەدا، داوێن پاکی هەتا نیوە کەم دەبێتەوەو دەرمە تەنیا لەسەر دوو لاق ڕاوەستاوە. ئەم سەردەمە کە ٨٦٤/٠٠٠ ساڵ دەخایەنێت، خواوەند ڕەنگی زەردەی هەیە، ناڕەزایەتی، درۆ و ئاژاوە گەیشتووەتە ئەوپەڕی خۆی و لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی خەڵک بە چاکەیی ماونەتەوە. بەگشتی یووگە، یان سەردەمی ئاژاوە، ئەو سەردەمەیە کە ئێمە تیایدا دەژین. درمە لەسەر لاقێک ڕاوەستاوەو هیچ کارێکی لەدەست نایەو تەنیا یەک لەسەر چواری داوێن پاکی ماوەتەوە. ئەم سەردەمە ...٤٣٢/ ساڵ دەخایەنێت. خواوەند ڕەنگی ڕەشی هەیە، زۆربەی خەڵک بوونەتە کۆیلەو سەرقاڵی شەڕ و ئاژاوە نانەوەن.

## ئایینی بوودا

دوابەدوای سەرهەڵدانی ئایینی بوودا، دوو ڕەوتی فیکریی کەرەمە و ئوپەنیشد (کارما و ئوپانیشد) هاتنە ئاراوە، کە پێشتر پرژاینە سەریان و باسمانکردن. هاوکات ڕێبازێکی فیکرییدیکەش لەگۆڕێدا هەبوو کە بە ڕێبازی چارڤاکە ناودێرکرابوو. ئەم ڕێبازە فکرییە نکۆڵی لە هەبوونی دروستبوون و گەڕانەوەی ڕۆح دەکات و باوەڕی بەژیانی پاش مەرگ نەبوو و پێی وابوو: جیهانێکیدیکە بوونی نییە" و "مردنیش بۆ خۆی ڕێگەی ئاسایی ڕزگاربوون و ئازادییە". کات و سات لەوێدا یەکجار گرینگ بووە و دەبوا کات بەفیڕۆ

ئەدەن و بەرژەوەندیی مادی و "بەختەوەری دوو ئامانجی سەرەکیی ژیانن."
بناغەی چەمکی چارڤاکە بۆ وشەی "çarva" دەگەڕێتەوە، کە بە واتای "خواردن" دێت، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە پەیڕەوانی ئەو ڕێبازە فیکرییە ئەوپەڕی چێژیان لەژیان وەرگرتووەو هیچ بایەخێکیان بەمەسەلەی ئەخلاقی و مەعنەوی نەداوە.

ئایینی بوودا لەنێو ئەم ڕێبازە فیکرییەدا سەریهەڵداو لاپەڕەیەکی نوێی لەمەڕ ناسین و چۆنییەتیی ڕەنج و مەینەتی و هەروەها ڕێگەی ڕزگاری هەڵدایەوەو بۆ ماوەیەکی زۆر ئایین و ڕێبازە فیکرییەکانی هیندی خستەژێر ڕکێفی خۆیەوە. تەنانەت زۆر کەس لەو باوەڕەدان فەلسەفە بەهۆی ململانێی نێوان ئایینی بوودا و ڕێبازە فیکرییەکانی پێش خۆی لە هیند پەرەیسەندووە. بووداگەرایی لەئەنجامی ئەم مشتومڕ و ململانێیەدا شکستی هێنا، هەرچەند ئایینی بوودایی لەزۆربەی وڵاتانیدیکەدا بڵاوببووەوە.

ئایینی بوودایی، کە لەلایەن گێنۆتمە بوودا، لەسەدەی شەشەمی پێش زایین بناغەی بۆ داندرا، لەئایینە مەزنەکانی ئەمڕۆی جیهان ئەژمار دەکرێت و زیاتر لە پێنجسەد ملیۆن کەس لەجیهان پەیڕەوی لەم ئایینە دەکەن. پێشتریش لەوڵاتی هیند چەندین دەسەڵاتدارێتیی وەک "موورسا"و پاشای وەک ئەشکوە پەیڕەوییان لەم ئایینە کردووە. دەقەکانی بوودایی بەزمانی پالی و سانسکرێت (زمانی زانستی و پیرۆزی هیندییەکان، کە سەر بە زمانەکانی هیند و ئەورووپاییە) نووسراون.

بوودا شازادەیەکی هیندی بوو، کە ٥٦٠ ساڵ پێش زایین لەباشووری نیپاڵ چاوی بە جیهان هەڵێنا. باوکی بوودا بەرەچەڵەک بۆ سەر هۆزی شکیە دەگەڕایەوەو پێش ئەوەی بوودا دەستی بە هەقیقەتی گێنۆتمە شکیە موونی رابگات، بەگێنۆتمە مۆرتازی شکیە دەناسرا و تەنیا ئەو کاتەی دەستی بە هەقیقەتی بوودا راگەیشت، بەبوودا (Buddha) ناوبانگی دەرکرد، یانی ئەوەی کە ئەو بەڕاستی بەو پەڕی ئاگایی گەیشتووە. هەروەها بە سیدارتە (یانی ئەوەی کە ئەو دەستی بەدوایین ئامانج راگەیشتووە)و

تتهاگتـه (یـانی ئـەوەی کـه لـەناو پەڕێوەتـەوەو گەیشـتۆته وشـکایی) نـاوی هیندراوه.

نامیلکەی جاتکه باسی ژیاننامەی بوودا‌و هـەروەها کۆمـەڵێک ئەفسـانەی وێکچووی پەرجوو دەکات. بەم پێیه ئەفسانەکان ئەوه بوون که: بوودا پـێش ئەوەی له دایک ببێت، "بوودی سەتوه" ، یانی بوودایەکی بەهێز بووه، که له بەهەشتی تووشیته ژیاوەو دواتر خواوەندەکان فەرمانیان پێکردووه، که خۆی دەربخات. ئەویش ئەو بنەماڵەیەی که دەبوا تیایدا لەدایک ببێت، هـەڵیبژارد. دایکی ناوی مهایا بوو، که خـەوی بـەم منداڵـەوه بینیبـوو. لـه پـێ و مـانگی خۆیدا لەلا کەلەکەیەوه لەدایک بوو. لەراستیدا دایکی هێشتا هەر کچ بوو کـه ئەم منداڵه ئاسمانییەی بوو. خواوەندەکان لەکاتی لەدایکبوونیـدا ئامـادەبوون و چوار فریشـته ئـەو کۆرپەیـەیان بـەدەستەوه گرتبـوو. هاوکـات لـەژێر ئـەو دارەدا، که منداڵەکەی چاوی به جیهان هەڵێنا، هاوسەریشی بـۆ پەیـدا بـوو. هاوکات لەگەڵ له دایکبوونی بوودا، کۆمەڵێک وەرچەرخان و رووداو لەجیهاندا هاتنه ئاراوه. برەهمنەکان بەباوکی ئەم منداڵه تازه لەدایکبووەیـان راگەیانـد، که ئەو لەتەمـەنی ٣٥ سـاڵیدا، یـان دەبێتـه بـوودا، یـان فـەرمانڕەوایی وڵات بەدەستەوه دەگرێت. بەباوکیان گوت گێتۆتمه بەدیتنی چوار نیشـانەی وەکـو پیره پیاوێک، نەخۆشێک، تەرمی مردوویەک و کەسێکی تەرکه دنیـا، دەسـت لەژیانی ئەم جیهانه ئەشوات، پارچه پەڕۆیـەک لـەخۆی دەئاڵێنێـت و رێگـەی تەرکه دنیایی دەگرێتەبەر. باوکی که ئەمانەی گوێ لێبوو، هەوڵیـدا گێتۆتمـه ئەم کەسانه نەبینێت. گێتۆتمـه ورده ورده گەشـەیکرد و هەڵیـدا، بـەره بـەره ببووه جوامێر و پاڵەوانێکی بوێر، که بەهۆی ئەم بوێری و جوامێرییەوه کچـه مامی خۆی بەناوی یشوودە، یان وەک هاوسـەر بۆ دیاریکردو له بەرهەمی ئەم هاوسەرگیرییەدا کوڕێکیان بوو.

رۆژێک لەنێو شاردا دەگەڕا، که چاوی بەم چوار نیشانەیه کەوت، بینینـی ئەمانەش کاریگەرییـەکی قـووڵی لەسـەر دانـاو وەرچـەرخانێکی مـەزنی لـەودا پێکهێناو رێگەی تەرکه دنیایی گرتەبەر، باوکی نەیتوانی پـێش بـەم بڕیـارەی

گێئۆتمه بگرێت، باوکی بڕیاریدا هەموو دەروازەکانی شاری لێدابخەن، بەڵام گێئۆتمه بەیارمەتیی خواوەندەکان له دەروازەکان تێپەڕیبوو، پەنای بردەبەر تاریکیی شەو. لەو کاتەدا تەمەنی ٢٩ساڵ بوو. گێئۆتمه چووه قووڵایی دارستان و شکڵی تەرکە دنیایی بەخۆوە گرت و دەورانی چلەکێشی و گۆشەنشینیی ئەو دەستی پێکرد، چووه لای دوو مامۆستا، بەڵام راهێنانەکانیانی بەدڵ نەبوو، ئیدی بۆ خۆی هاوڕێ لەگەڵ پێنج کەسیدیکە دەستی بەچلە کێشانی یەکجار دژوار کرد، هەتا ئەو جێگایەی کە بەهۆی لاوازیی جەستەییەوە بڕستی لێبڕاو کەوتە سەر زەوی، بەڵام هیچ رۆشناییەک له دڵیدا دروستنەببوو و دەستیشی بەئامانجەکەی نەگەیشتبوو، ئەم چلە کێشی و گۆشە نشینییە ماوەی شەش ساڵی خایاندو پاش ئەوەی زانیی لەم چلەکێشی و تەرکە دنیاییە دەستی بەهەقیقەت و راستی راناگات، ژیانی ئاسایی گرتەوەبەر و وزەو توانای لەکیسچووی خۆی بەدەستهێنایەوە. هاورێکانی لێی نائومێدبوون و بەجێیان هێشت.

پاشان پەنای بردە ژێر دارێک و دەستیکرد بەبیرکردنەوەو چڕکردنەوەی هێزی مەعنەوی و پاراستنی باری دەروونیی خۆی و سەرئەنجام لەکاتی نیوەشەودا هەقیقەت خۆینواندو رووی خۆی پێنیشانداو گێئۆتمە پلەیەکیدیکەی ئاگایی بەدەستهێناو بەسەر هەموو زانستی جیهاندا زاڵ بوو و هەروەها توانیی بەسەر رەنج و یەخسیریی جیهانی، سەرلێشێواویی رۆح، چەرخی مردن و ژیانی بەردەوام و رێگەی رزگاریدا زاڵ ببێت. له زاری گێئۆتمەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی : " لەم کاتەدا زانیم، کە رۆحی من، لەناپاکیی هەواو هەوەس و ناپاکییەکانی جیهان و ناپاکییەکانی نەزانی، رزگاری بووە ... و بەڕاستی زانیم کە هەموو سنوورەکان لەبەر دەمم هەڵگیراون ... و هیچ کاتێک بۆ ئەم جیهانە ناگەڕێمەوە".

بوودا بۆ ماوەی حەوت حەفتە لەژێر ئەو دارەیدا مایەوە. لەمێشکیدا ئەم دوو بیرۆکەیە هاتنەئاراوە، کە ئایا ئەم زانیارییانەی خۆی بۆ خەڵکیدیکە بگوازێتەوە، یان ئەوی کە بۆ خۆی رێگەی رزگاری دۆزیوەتەوەو بەخۆی

رابگات و خۆی رزگار بکات، کە سەرئەنجام بڕیاریدا کە دەست بداتە بانگەشەو خەڵک رزگار بکات.

یەکەمین پەیڕەوانی ئەو، هەر ئەو پێنج مۆرتازەی پێشووبوون. بەپێی هەندێک گێڕانەوەی بوودایییەکان، بوودا بۆ ماوەی چل ساڵ بەوڵاتی هینددا گەڕاوەو بانگەشەی بۆ ئایینەکەی کردووە. لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کاتی ئەوە هاتبوو کە ئاوێتەی "نیروانە" ببێت. ڕۆح لەجەستەی هاتەدەرو ئاوێتەی زانستی بێکۆتایی بوو، بەرەو بۆشایی رۆیشت و لەوێشەوە هەستا و گەیشتە پلەیەک، کە لەوێدا نەتێگەیشتن هەبوو، نە تێنەگەیشتن لەئارادا بوو، لەوێشوە هەستاو بەرەو خامۆشی رۆیشت و خۆی لەفام و تێگەیشتن دوور خستەوە.

## گریمانەی ئەرکی جیهانی

**بوودا دەستی بەم چوار ئەسڵە راگەیشتبوو:**

- ئەو کەسەی رووی لە جیهانی مادی بکات، ئەشێ ئەرک و مەینەتییەکی هەتاهەتایی بەئەستۆ بگرێت،
- سەرچاوەی ئەم رەنج و مەینەتییە، لەدایکبوونە،
- راوەستانی چەرخەی مردن و ژیان دەبێتە هۆی رزگاربوون لە رەنج و مەینەتی،
- ئەو رێگەیەی کە بەرەو ئازادیی بێ ئەملاولا دەچێت، هەشت فاقەیە.

ئاییني بوودایی گرینگی بەباسی تیۆری و فەلسەفی نەداوەو تەنیا ئاوڕی لەلایەنی زانستی داوەتەوەو لەو باوەڕەدا بووە ژیان واتای مەینەتی و رەنجی هەیە.

هۆکاری ئەم مەینەتییەش، بازنەی ژیان، مردن، سەرلەنوێ ژیانەوە (لەدایکبوون و مردن) بووەو ڕۆح بۆ هەتاهەتایە لەم بازنەیەی مردن، ژیانەوە، مردن و ژیانەوە رزگاری نابێت، هەتا ئینسانیش ئازاد نەبێت و

ڕێگەی ڕزگاری نەدۆزێتەوە، ڕزگاری نابێت و ڕەنج و مەینەتیش دوایی نایەت.
بۆ ڕزگاربوون دەبێ بەم ڕێگە هەشت ڕەهەندییەدا بڕۆن، کە بریتین لە:
ئیمانی دروست، مەبەستی دروست، ئاخاوتنی دروست، هەڵسوکەوتی دروست، شێوەی ژیانی دروست، هەوڵدانی دروست، بیرکردنەوەی دروست و سەرنج و خۆپارێزیی دروست. ئەگەر هەر کەس ئەم ڕێگەیە بپێوێت، ئەم مەینەتییە دەبێتە هۆی بزاوتنی هەستی ڕەحم و بەزەیی و چیدیکە ئینسان تووشی ڕەنج و مەینەتی نابێت و شادی و خۆشی دروست دەبێت و زوڵم لەخەڵکیدیکە ناکات.

## سێ ئەسڵی ئایینی بوودا

سێ ئەسڵی ئایینی بوودا، بریتین لە مەینەتی جیهان، ناسەقامگیریی سەرجەم مەخلوقات و گۆڕانی جەوهەری ئینسانییەت.
ئەگەر سەرچاوەی هەموو شتێک دەرد و مەینەتی بێت، بەم پێیە سەقامگیری و ئاسایش لەپاش مردنەوە بوونی نییەو هەموو شتێک بەردەوام گۆڕانی بەسەردا دێت و بەرەوڕووی مەرگ دەبێتەوە، هەرشتێک دروست دەبێت، ئەشێ لەناو بچێت و هەموو ساتەکان جیاوازییان لەگەڵ ساتەکانیدیکەدا هەیە. هەموو شتێک نرخێکی تایبەت بەخۆی هەیەو هیچ کامیشیان وێکچووی یەکتر نین. لەجیهاندا هیچ شتێکی هەتاهەتایی بوونی نییە، کە بەبنەما و بنەڕەتی جیهان دابندرێت. هەبوون یانی وەرچەرخان و گۆڕانکاری، بە بەردەوامی سەرلەنوێ، ژیانەوە و لەناوچوون. شتەکان دروست دەبن و گەشە دەکەن و پاشان لەناو دەچن و هەموو ئەمانەش مەودای زەمەنییەکی یەکجار کورت ئەخایەنێت.
بوودا لەو باوەڕەدا بوو کە وجوودی مادی، "ڕۆحی کەسیەتی و کۆتایی (ئاتمەن)" نییە. هەستەکانیش ئاتمەن (ڕۆحی کەسیەتی و کۆتایی) نەبوون. هەر کەسێکیش پشت لەسیمای مادی و هەستەکانی خۆی، کە هیچیان ئاتمەن (ڕۆحی کەسیەتی و کۆتایی) نین، هەڵبکات، لەخواست و

ویستەکانیشی دەربازدەبێت و ئەو کەسە رزگاری دەبێت و سەرلەنوێ ژیانەوە (لەدایکبوون و مردن و سەرلەنوێ ژیانەوە) کۆتایی پێدێت و پیرۆزییەکان دەستەبەر دەبن و ئەرکەکانی ئینسانیش کۆتاییان پێدێت.

کەوابوو، بەپێچەوانەی ئوپەنیشد (ئوپانیشاد)ـەکان، کە کەسی ئیماندار بۆ خۆی (رۆحی کەسیەتی و کۆتایی)ـە و بەو راستییە بێکۆتاییەی برەهمەن ئەژمار دەکرێت و لە دوو جیهانی گەورە و بچووکدا رەنگدانەوەی هەیە و هەموو جیهان پێکەوە گرێ ئەدات، بەڵام لە ئایینی بوودابیدا هەموو شتێک و سیمای هەموو مەخلووقات، لەیەک شوێنەوە سەرچاوە دەگرن و دێن و بەرەو ئاقارێکی نارِوون دەڕۆن. ئایینی بوودا گرنگیی بەم سەرچاوەو مەنزڵگەیە نەداوەو ئەوەی بە لایەوە گرنگ بووە مەسەلەی ژیان و مردن و مەودای نێوان لەدایک بوون و مردن بووە، کە تەژی لە دەرد و مەینەتی بووە، گرینگ نییە کە وجوود لە کوێوە هاتووەو بەرەو چ ئاقارێک دەڕۆین، گرینگ ئەوە بووە کە چۆن لەو دەرد و مەینەتییە رزگاریمان ببێت. بۆ ئەوەی چارەسەری دەرد و مەینەتی بکەین، ئەشێ سەرچاوەکەی بدۆزینەوە، کە سەرچاوەکەی هەمان لەدایکبوونە، چونکە لەم جیهانەدا سەقامگیرییەک لەگۆڕێدا نییە هەتا ئەوەی ئاساییش و بەختەوەری بوونی هەبێت، کەوابوو دەبێ خۆمان لەم ژیانە بێ نیاز بکەین و لە پەیوەندیگرتن لەگەڵ کاروباری ژیان خۆببوێرین.

دەگێڕنەوە کە بوودا گوتوویەتی : لە دایکبوون و هاتنە دنیا هۆکاری سەرەکیی پیری و مردنە. گەڕانەوەو ژیانەوە هۆکاری دروستبوون و سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەیە. دڵبەستەیی و هۆگریی بەژیان، هۆکاری سەرلەنوێ ژیانەوەیە. خواست و ئارەزوو هۆکاری دڵبەستەییە. هەستی ئینسان هۆکاری سەرەکیی هاتنەئارای خواست و ئارەزووە. پەیوەندی ئینسان لەگەڵ ئینسان هۆکاری دروستبوونی هەستە. هۆکاری دروستبوونی پەیوەندی، سیما و دەم و چاو بووە. هۆکاری دروستبوونی سیما و دەم و چاو ئاگایی بووە. هۆکاری زانیاری و ئاگایی، کاریگەرییە زەینییەکانی رابردوو بووەو هۆکاری کاریگەرییە زەینییەکانی رابردووش نەزانی و

ناتێگەیشتوویی بووە، کەوابوو ئەگەر نەزانی و ناتێگەیشتوویی لەناو ببرێت، سەرجەم هۆکارەکانیدیکە لەناو دەچن و چیدیکە رەنج و مەینەتی لەگۆڕێدا نامێنێت. ئەم زنجیرە هۆکارانە بەچەرخەی ژیان ناسراوە. نەزانی و ناتێگەیشتوویی لەئایینی بوودادا بە واتای ئاشنا نەبوون بەهەقیقەتەکانی بوودایە : یانی تێنەگەیشتن و نەناسینی هەقیقەتی دەرد و مەینەتی و رزگاریدەری ئەم دەرد و مەینەتییانە. نەزانی و ناتێگەیشتوویی راستییەکە، کە لەم جیهانەی ئێمەی تیادا ئەژین و هۆکاری سەرەکیی لەدایکبوون و مردنە، دەبێ ئەزموون بکرێت. بوودا پێیوایە ئاگایی لەدوازدە فاکتەر، لەنێو مێشکدا دروستدەبێت و کاتێکیش جەستە لەناو دەچێت، هەست و تێگەیشتن هەر دەمێنێتەوە، کە بەپردی پەیوەندیی نێوان ژیانی رابردوو و ئێستا دادەندرێت. لەکاتێکدا ئاگایی کۆتایی پێدێت، کە ئەم هۆکارانە لەگۆڕێدا نەمێنن و رۆح بگاتە نیروانە (نیروانە یان نیروانا = بەپێی ئایینی بوودا هەموو تاکێک ئەشێ چەند قۆناغێکی ئەخلاقی تێپەڕ بکات بۆ ئەوەی بە قۆناغی کامڵبوون بگات). ئاگایی و زانایی، پاش مردن، خۆی لە جەستەو رۆحێکی نوێدا دەبینێتەوە.

ناو و سیمای ئینسان لە ئایینی بوودابیدا بەتێگەیشتن و بەکاریگەرییە زەینییەکان دادەندرێت و بەسیمای هەمان چوار توخم دەگوترێت، بەڵام ناو، سیما لەئوپەنیشدەکاندا هەڵدەبژێردرێت و رووپۆشێکە لەنێوان خوڵقێنەر و مەخلوقدا.

## نیروانە

گەیشتن بە نیروانە بە ئاواتی سەرەکیی هەموو بوودابیەک دادەندرێت. نیروانە یانی ئازاد بوون لە زنجیرە هۆکاری دروستبوونی ئینسان و مەینەتیی جیهانی و زانایەکی دڵخواز، کە بەپێی رێچکەی هەشت فاقەی بوودایی دەستەبەر دەبێت. نیروانە پلەیەکی مەزن و نەگۆڕی هەیە، بەڵام بوودابیەکان خۆیان لە قەرەی باسکردن و شیکردنەوەی نیروانە نادەن.

دوابەدوای مردنی بوودا لەساڵی ٤٨٠ی پێش زایینـدا، شـورایەک لـە گەورەکان و هەڵبژێردراوانی ئایینی بوودایی پێکهات و پەروەردەی بوودایی و بناغەی ئایین و داب و نەریتی بوودایان کۆکردەوە .

دووەمین شورای بوودابیەکان سەد ساڵ پاش پەیوەستبوونی بوودا بەنیروانە، پێکهات. شورای سێیەمیش لە سەردەمی دەسەڵاتداریتیی ئەشووکە ئیمپراتۆری مەزنی بوودابیەکان پێکهات و ئایینی بوودایی بەشێکی بەرفراوانی وڵاتی هیندی گرتەوەو بڵاوبووەوەو قاڵبی ئایینی بەخۆوە گرت .

لە شورایی دووەمدا، دوو گروپ دروستبوون، کە لەسەر بنەمای دەستووری مەعنەویی ئایینی بوودایی ناکۆکییان هەبوو. گرووپی بنـاژۆخواز لەو باوەڕەدا بوو کە دەبێ لەسەر بنەمای پەروەردەی رەسەنی بوودایی خەڵک پەروەردە بکرێن. لە ئەنجامدا ئەم گروپە کە کەمینەبوون، بارگە و بنەیان خڕ کردەوەو زۆرینە درێژەی بەکارەکانی خۆیدا .

لە نێوان ئەم گروپانەدا، گرووپی زۆرینە لە قۆناغەکانی دواتردا، کە مەزهەبی مەهایانە یا چەرخی مەزن دروست بوو، پاشان لەبیروباوەڕی بناژۆخوازانی باوەڕمەند بەبوودا، مەزهەبی هینە یانە شکڵی گرت، کە بەچەرخی بچووک ناوبانگی دەرکردووە. لەچەرخی مەزندا، کۆمەڵێک گۆڕانی بچووک لەئایینی بوودابیدا پێکهات.

لەسەردەمی ئەشووکەدا دەیان پەرستگەی مەزنی بوودایی دروستکران. دواتر ئایینی بوودا هەتا ئاسیای ناوەڕاست و ئێرانی رۆژهەڵات و پاشان هەتا وڵاتی چین رەگاژۆی کرد، بەڵام ئایینی بوودایی لەنێو خۆی وڵاتی هیند بەهۆی کێشەو شەڕی ناوخۆییەوە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەرەی نەگرت و بەرەو لاوازی رۆیشت. لەکۆتاییەکانی ئەم قۆناغەدا، هەژدە تاقمی بوودایی لەگەڵ یەکتردا تووشی کێشەو شەڕی ناوخۆیی بوون.

دواتر یەکێک لە پاشای کووشانییەکان، بەناوی کنیشکە، ئیمپراتۆرییەتێکی مەزنی دامەزراند و بەسەر "دۆڵی سێند، کابول، گندارە و کشمیر"دا زاڵ بوو و لەساڵی ١٠٠ی زایینیدا، شورایەکی تایبەتیی لە

پەیڕەوانی بوودایی پێکهێنا، کە تیایدا ئەو هەژدە گروپە بوودابیە کۆبوونەوەو هەروەها پەیڕەوانی دوو ڕێبازی تەروادە (هینە یانە) و مەهایانە بەشدار بوون. لەم شورایەدا زۆربەی کێشەکان چارەسەرکران و ڕێبازی مەهایانەش لەجێگەی خۆیدا مایەوە. ئەم ڕێبازە، کە وەرچەرخانی لەئاییینی بوودابیدا پێکهێنابوو، بەرەبەرە لەپاش ئەم شورایە پەرەیسەندو ئاییینی بوودای بەشێوەیەکی گشتگیر دەرهێناو ئاییینی ڕەسەنی بوودایی لەچوارچێوەی سیلان، تایلەند، سنووردار مایەوەو لە وڵاتی هیند بەگشتی لەناوچوو.

ئاییینی بوودایی لەسەدەی هەشتەمی زایینییەوە هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی ئاییینی ئیسلام لەوڵاتی هیند (٧١٢ی زایینی) بەرەو نەمان ڕۆیشت.

### تەروادەو مەهایانە

مێژووی سەرهەڵدانی ڕێبازی مەهایانە بەڕوونی دیار نییە، بەڵام مێژووی لێکترازانی دوو هێڵی فیکری لەم ئاییینە بۆ ٤٠٠ ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، کە ڕێبازی ماهایانە پاشهاتی یەکێک لەم دوو هێڵە فیکرییە بوودابیە بوو، کە بە mahasanghika دەناسرێت و گروپی دژبەری بە Thravadin ناودێر کراوە. دوو چەمکی مەهایانە (چەرخی مەزن) و هینە یانە (چەرخی بچووک) چەمکەکانی دواتربوون، بەڵام چەمکی هینە یانە شێوە ئاخاوتنێکی بێڕێزیکردن بەکەمینەی ترەوادین بووە، کە ئەم گروپە بە Theravada دەناسران. ئەم دوو تیرەیە بە "باکووری و باشووری"ش ناویاندەبرێت. گروپی مەهایانە لە باکووری هیند و ئاسیای ناوەڕاست پەرەیسەند و هەروەها ترەوادە لە باشوور و سیلان ڕەگاژۆی کرد و پەرەیسەند.

ڕێبازی ترەوادە پێیوایە ڕەسەنایەتیی پەروەردەکردن لەسەر هێڵی فیکریی بوودای پاراستووەو ئەو ڕێکخستن و هێڵە فیکرییەی بەدەست لێنەدراوی هێشتووەتەوە، ئەوەش لە حاڵێکدایە کە ڕێبازی مەهایانە پرژاوەتە سەر

ئایینی بوودایی و بە ووردی شرۆڤەی کردووەو قاڵبێکی خواناسانەی بە بەردا کردووە.

بەپێی بیروباوەڕی پەیڕەوانی ترەوادە، هیچ راستییەک لە جیهاندا پایەدار نامێنێتەوە، بنچینەیەکی پایەدارو هەقیقەتێکی هەتاهەتایی بوونی نییە. هەموو شتێک لەچەندین توخمی ناپایەدار دروستبووە. ئامانجی سەرەکی ئەشێ گەیشتن بەنیروانە بێت و باسکردن لەسەرەتاو گەڕانەوەو بنەماکانی جیهانناسی هیچ بایەخێکی نییە. ترەوادە پێیوایە لەماوەی ئەم ژیانەشدا دەکرێ رێگەی رزگاری بدۆزرێتەوە. ئینسان ئەشێ ببێتە بوونەوەری ئازادو بەسەر ئەو زنجیرە هۆکارەی مایەی دروستبوونی رەنج و مەینەتین، تێپەڕێت. رێگەی رزگاری و گەیشتن بە قۆناغی شهوود و بیرکردنەوە و پارێزگاریکردن لەچوار هەقیقەتی بوودابیدایە. ئەو کەسانەی دەستیان بەو هەقیقەتە رابگات، لەشاری نیروانەدا جێگیرو نیشتەجێدەبن.

ئەوان لەو باوەڕەدان بوودا کەسایەتییەکی ئیلاهی و ئەفسانەیی نییە و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئینسانێکی ئاسایی نییە و تەنیا لە رەهەندی کەسایەتییەوە خۆشەویست و شیاوی رێز بووە، کە رێگەی هەقیقەت و رزگاریی پیشان خەڵک داوە.

سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ رووی خۆیان لەم دوگم و نەگۆڕبوونەی ترەوادە وەرگێڕاو روویان لە رێبازی مەهایانە کرد. لەراستیدا رێبازی ترەوادە، کە رێگەی ئازادی و گەیشتن بەنیروانەبوو، تەنیا بەڕووی هیندێک کەسی تایبەتیدا کراوەبوو، هاوکات لەگەڵ ئەوەی زیندووبوون دەیانتوانی بەرەو شاری نیروانەبڕۆن و ببنە بوونەوەرێکی ئازاد. لەرێبازی مەهایانەدا بۆ دامرکاندنی حەز و هەستە تایبەتییەکان دەبوا لەسەرەتای رێگەدا هیندێک توێشوو لەزانایی بوودی ستووە وەربگرێت. ئەم رێگەیە بەڕووی هەمواندا کراوەیەو هەموان دەتوانن بارنەی داگەڕانی بوودی ستووە بپێون و بەرەو نیروانە بڕۆن.

هەروەها لەسەر ناسینی بوودا کێشەیەکیدیکەی قوڵ لەگۆڕێدایە. لە مەزهەبی ترەوادەدا، بوودا لەگەڵ ئینسانەکانیدیکە هیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام لەروانگەی پەیڕەوانی مەهایانەوە، بوودا هەزاران ساڵ پێش سەردەمی خۆی دەستی بەئاگایی و رووناکی راگەیشتبوو.

ناکۆکییەکیدیکە لەوەدایە کە لەرێبازی ترەوادەدا، ئینسان لەکۆمەڵێک توخمی ناپایەدار دروستبووەو بەم پێیە هەقیقەتەکانی جیهانیان وەردەگرت، بەڵام لەرێبازی مەهایانەدا نە تەنیا ئاتمەن، راستییەکی پایەدار بوونی نییە، بەڵکو هیچ راستییەکی مادی و بەرچاویش بوونی نییە. لەراستیدا، anatta غەیری ئاتمەن لەرێبازی ماهایانەدا دەبێتە بۆشاییەکی گشتگیرو ئەم بیرۆکەیە جێگەی بیرۆکەی "پایەداریی ئەسڵ و بنەما"ی بوودایی دەگرێتەوە.

بەم پێیە، رێبازی مهایانە فەلسەفەو روانگەیەکی نوێ دێنێتە ئاراوە، کە تیایدا نەتەنیا هیچ بنەمایەکی پایەدارو سەقامگیر (atman) بوونی نییە، بەڵکو جیهانیش بەرهەمی بیرکردنەوەی زەینیی ئینسانەکانەو بەدەر لە بیر کردنەوەو مێشکی ئێمە هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی راستی لەگۆڕێدا نییە.

١. هەبوونی ئەفسانەگەلێکی زۆرو بەهێز لەرێبازی مەهایانەدا، بەکێشەی نێوان رێبازی مەهایانە و ترەوادە ئەژمار دەکرێت، چونکە لەرێبازی ترەوادەدا هیچ ئەفسانەیەک لە گۆڕێدا نییە، هەروەها ئەشێ ئامـاژە بـە سێ روانگەی (تریکایە) بکرێت، کە یەکەم دانە جەستەی راستی و یاسایی لەخۆدەگرێت، ئەمەش بەهەقیقەتی زاتیی بووداو سەرجەم بوونەوەرەکان دادەندرێت کە، " ئەو شتەی حاڵەتی مادیی هەیە" لێکیان داوەتەوەو ئەمەیش لەرێبازی مەهایانەدا ئەم جەستە راستی و یاسایە"، بە زاتی رەهاو بێکۆتایی بوودا لە قەڵەم ئەدرێت و بەهەقیقەتێکی هەتاهەتایی و نەمر دادەندرێت، ئەمەش لە حاڵێکدا کە لە رێبازە جۆراوجۆرەکاندا ئەم جەستەی راستی و یاسایە بەهەمان بۆشایی دەگوترێت، کە تەنیا لەشاری نیروانەدا بوونی هەیە .

٢. جەستەیەکیدیکەی بوودا بە "جەستەی خۆشی و شادی" و روناکی ناودێرکراوە. ئەمەش بەجەستەی ئاسمان و ناسروشتیی بوودا لەقەڵەم دراوە،

کە تەنیا لەلایەن داوێن پاکان و خواناسانی مەزنەوە دەبینـدرێت، کـە هـەمان سیمای هاوچەشنی فریشتەیی بوودا و بوودی ستووەی هەیە.

جەسـتەی روالـەتی و خـەیالّیی بـوودا، کـە بـە normanakaya ناسـراوە، هـەمان جەسـتەیە کـە بـوودا لـەکاتی هاتنەسـەر زەوی بەخۆیـەوە گرتبوو، کە تەنیا جەستەیەکی خەیاڵییـەو بـەس. سـەرجەمی بووداکـان ئـەم شێوە جەستەیەیان هەیە.

هـەبوونی بـوودی سـتووە، یـان بووداکـانی داهـاتوو بەیەکێکیدیکـە لـە تایبەتمەندییەکانی رێبازی مەهایا دادەندرێت. بوودی واتای شعوور و ستووە، واتای "بنەمای عەقلی و فەلسەفی"ی هەیە. بوودی ستووە، یان (بووداسف) بوونەوەرانی ئەفسانەیی بوون کە لەجەستەی نـوورانیی بووداکـان بەهرەمەنـد بوون و لەبەهەشـتی "تووشیتە" لەسـەر تـەختێکی رازاوە پـاڵی لێئەدەنـەوەو دەسـتەی داوێـن پاکـان و گـەورەکان لـەدەوریان کـۆ دەبنـەوە. ئـەوان بـۆ رزگـاركردنی ئینسـانەکان، کۆمـەڵێک پێغەمبـەر دەنێرنـە سـەر زەوی و چارەنووسـی ئینسـانەکان دیـاری دەکـەن، پێویسـتە ئینسـانەکان ستایشـیان بکەن. ئەگەر ئینسانەکان خوازیاری ئازادین و دەیانەوێ بەرەو نیروانە بـڕۆن، دەبـێ بـە شـوێن رێبـازی ئەوانـدا بـڕۆن. بـوودی رۆڵـی نێوبژیـوانیی هەیـە، لەحاڵێکدا کە لەئاییني ترەوادەدا، ئینسانەکان لەرێگەیەکی هەشت فاقەییەوە رزگاریان دەبێت.

لەرێبازی مەهایانەدا، جۆرێک واتای یەکتاپەرستی لەگۆرێدا بـووەو لەسـەر ئەو باوەڕە بـوون کـە هـەموو بووداکـان خویـابوونی یەکـەمین بـوودا بـوون و بوودای یەکەم هیچ وێکچوویەکی لەگـەڵ برەهمـەن لـەئاییني هینـدوودا نییـە. ئەو متمانـەی بەخۆیـە و بـەردەوام لەشـاری نیروانەدایـە و لـەهێزی خـەیاڵیی خۆی شایەتی خۆی واتە پێنج بوودا دروست دەکـات و ئـەوانیش هـەرکام بـۆ خۆیان چـوار بـوودی سـتووە دروسـت دەکـەن. ئـەم چـوار بـوودی سـتووەیە بەئافرێنەرانی جیهان دادەنـدرێن و ئـەوەی دروسـتی بکـەن ناپایـەدارەو لـەناو دەچێـت و هەنووکـە بـە سـەردەمی ئافرانـدنی بـوودی سـتووەی چـوارەم دادەندرێت.

## ئایینی جێین

ئایینی "جێین"یش لەسەرەتادا هاوشێوەی ئایینی بوودایی، پەیڕەوانی ئەم ڕێبازەی بەرەو ئەخلاق و ڕەوشتی پاک هاننەدا و لەهەوڵی ئەوەدابوو ڕێگەی داوێن پاکی و پاراستنی مافی ژیانی بوونەوەران فێری پەیڕەوانی خۆی بکات و لەرەنجی خۆڕایی و بێهۆ دووریان بخاتەوەو بەرەو ئاسایش و حەسانەوەی هەتاهەتایی ڕێنوێنییان بکات. بەم هۆیەوە، پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە بەتیرە تەکەرە ناوبانگیان دەرکردووە.

هەروەها وێکچوویەکیدیکەی ئایینی جێین و ئایینی بوودایی لەوەدایە کە هیچکامیان باوەڕیان بەهەبوون و پیرۆزیی ئیلاهیی ڤیداکان نییەو بەدڵنیاییشەوە پەیڕەوانی جێین بە بەشێک لەنیزامی چینایەتیی هیندووەکان ئەژمار نەدەکران.

ئایینی جێین هاوشێوەی ئایینە هیندییەکانیدیکە گرینگیی بەژیانی دنیایی نەداوەو ڕزگاربوونی لەداوی ئەم جیهانەو ئەم ڕێبازە فیکرییە دۆنادۆنە، بە تاکە ڕێگەی ئازادی لەقەڵەم داوەو ئەو ڕزگارییەش لەڕێگەی ماریفەتەوە دەستەبەر دەبێت.

ڕێبازی "جێین"یش بڕوای بەیاسای کەرەمەو سەرلێشێوایی ڕۆح لەقۆناغە جیاجیاکانی جیهان هەیە.

لەڕێبازی جێیندا زنجیرە بیروباوەڕی ئەنیمیستی (گیانگەرایی) بەرچاو دەکەوێت، کە ئاماژە بەدێرینبوونی ئەم ئایینە دەکات.

ئایینی جێین، لەروانگەی جیهانبینییەوە، ناکۆکییەکی قووڵی لەگەڵ ئایینی بووداو ئووپەنیشدەکان هەیە. ئووپەنیشدەکان باوەڕیان بەسەقامگیری هەبوو، بەڵام بوودا بەپێچەوانەوە باوەڕی بەسەقامگیری، گۆڕانکاری و گەڕانەوە نەبوو، بوودابیەکانیش پێیان وابوو هەموو شتێک لەناو دەچێت. بیروباوەڕی پەیڕەوانی جێین، لەنێوان ئاتمەنی ئووپەنیشدی و بۆچوونی ناساقامگیری بوودابیەکان دایە و هەتا رادەیەک نزیکایەتیی لەگەڵ ئەم دوو ئایینە هەیە.

ئەگەر لەبیرمان نەچێت، ڕێبازی ئوپەنیشد پێیوایە تەنیا سیماو دەم و چاوەکان دەگۆڕدرێن، بەڵام مادە، یان جەستە وەکو خۆی دەمێنێتەوە. سیماکان ڕواڵەتین و ڕاستیی مەسەلەکەش کاکڵی ئەو شتەیە کە دەمێنێتەوە. سیماکان تەنیا خەون و خەیاڵن و هیچ بنەمایەکی ڕاستییان نییە. بوودابیەکان دەیانگوت ئێمە تەنیا سیماکان دەبینین کە گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووەو ماوەیەک دەمێننەوەو پاشان لەناو دەچن و کاکڵێکی سەقامگیر لەپاش نەمانی ڕواڵەت و سیماکان نامێنێتەوە. ئەوەی هەیە و دەبیندرێ تەنیا سیمایەکە، تەنانەت ئەوەی لەڕوانگەی پەیڕەوانی ئوپەنیشدەکانەوە بەکاکڵ و ناوەڕۆکی سەرەکی ئەژمار دەکرێت و (بنەمای سەقامگیر) ئوپەنیشدی لەخەون و خەیاڵ زیاتر هیچی دیکەی تێدا بەسەر نییە و کاکڵ و بنەمایەکی قایم کە شیاوی لێفێربوون بێت، تیایدا بەدی ناکرێت.

"جێین"ەکان ڕوانگە و جیهانبینییەکیان هەبوو کە لەم دوو ڕێبازە زۆر نزیک بوو و پێیانوابوو لەهەر گۆڕانکارییەکدا سێ تایبەتمەندی بوونی هەیە:

١. بەشێک لەچۆنایەتی گۆڕانی بەسەردانایە.

٢. بەشێک لەچۆنایەتیی هەنووکە سەرهەڵدەدەن و خویا دەبن.

٣. بەشێک لە چۆنایەتی لەگۆڕێدا نامێنن و لەناو دەچن.

کەوابوو لەهەر گۆڕانکارییەکدا، سیما و ڕواڵەتی پێشوو لەناو دەچێت و سیمایەکی نوێ جێگەی دەگرێتەوە، بەڵام مادە وەک خۆی دەمێنێتەوە، بەم شێوەیە، پەیڕەوانی جێین لەو باوەڕەدابوون کە سروشت و سیمای ڕاستەقینەی مەخلوقاتی جیهان نە بە تیۆری (anatha)ی بوودایی و نە بە ئاتمەن ئوپەنیشدی پاساو نادرێتەوە، بەڵکو ڕاستییەکەی لەمپەرێکە لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەدا بوونی هەیە، کە بە بەردەوامی چۆنایەتییەکەی دەگۆردرێت و چۆنایەتیی نوێ جێگەی دەگرێتەوە.

"جێین" هەموو شتێکیان بەشیاوی وەرچەرخان لەقەڵەم ئەداو لایەنگرییان لەبۆچوونی چەند فاقەیی دەکرد، واتە پاساکان تەنیا لەهەلومەرجێکی

تایبەتیلەئارادابوون و بە سەرنجدان لەوەی مەخلوقات کۆمەڵێک تایبەتمەندیی جۆراوجۆریان لەخۆگرتووەو بە بەردەوامی گۆڕانیان بەسەردا دێت و هەر کامەشیان لەهەلومەرجێکی زەمانی و زەمینیی تایبەتیدا بوونیان هەیە، بەم پێیە هیچ کام لە یاساکانی ئێمە بێکەموکوڕی و نەگۆڕ نین. نییە، بە ڕێگە جیاوازەکانی ناسینی مەخلوقات دەگوترێت. کەوابوو لەهەر داوەری و لێکدانەوەیەکدا سەبارەت بە مەخلوقات دوو ڕێگە بوونی هەیە: یەکەم ئەو شتەی لە بوونی هەیە، لەبەر چاوی بگرین و تایبەمەندییەکانی بە جیا لێک نەدەینەوە، ڕێگەی دووەمیش ئەوەیە تایبەتمەندیی شتێک لە شتێکیدیکە جیا بکەینەوەو بۆخۆیشمان هەر شتێک و بوونەوەرێک بە دوور لەچلۆنایەتییەکانی کە ئاماژەیان پێکرا، ببینین. بەم دوو ڕێگەیە دەگوترێت "ڕوانگەی ڕواڵەتی" و " ڕوانگەی کاکڵەیی" .

بەسەرنجدان لەوەی کە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ئێمە سەبارەت بەهیچ شتێک نەگۆڕ نییە، پێویستە بەردەوام لەچەمک و دەوستەواژەی وەکو "پێدەچێ" و "ڕەنگبێ" کەڵکوەربگرین. بۆ نمونە کاتێک کەباس لەهەبوونی شتێک دێتەگۆڕێ، باشتر وایە بڵێین " ئەو شتە ڕەنگە لەڕەهەندێکەوە بوونی هەبێت و لەڕەهەندێکیدیکەشەوە پێدەچێ بوونی نەبێت."

زۆر کەس ڕەخنەیان لەم شێوە بۆچوون و ڕوانگەیە گرتووەو گوتوویانە چۆن شتێک دەتوانێ هەبێت و هەم دەکرێ بوونیشی نەبێت و پێیان وایە ئەم دوو چەمکە لەگەڵ یەکتر دژایەتییان هەیە، بەڵام لە وەڵامدا گوتراوە کە "جێین"ـەکان گوتوویانە هەموو شتێک هەم سەقامگیرە و هەم بە بەردەوامی ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و ئەمەش بێ ئەملاولا لە هەموو شتێکدا ئەم یاسایە بوونی هەیە. لەڕاستیدا پەیڕەوانی جێینی بۆچوونی چەند فاقەییان سەبارەت بە هەموو شتێک کە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی لەڕادەبەدەریان لەخۆ گرتبێت، قەبووڵ کردووە.

پەیڕەوانی جێین لەو باوەڕەدا بوون کە ناسین و لێدانەوەی دروست ئەوەیە کە سەرنج و گرنگی بە کاری چاکە بدات و خۆی لە خراپەکاری

بپارێزێت و لەم بۆچوونەدا لەگەڵ بوودابییەکان کۆک بوون کە ناسینی دروست ئەشێ بەمەبەستی گەیشتن بە چاکە بێت. جێین پێی وایە کە زانست بۆ خۆی بایەخ و گرنگییەکی ئەوتۆی نییە و زانست لە رووی ئەنجامی دڵخوازی سوود و زیانەوە دیاری دەکرێت. پەیڕەوانی ئایینی جێین رەخنە لە ئایینی مەهایانە دەگرن کە باوەڕی بەبنەمای خەیاڵە زەینییەکان هەبووە و نکۆڵی لە راستییەکان کردووە.

بە باوەڕی ئایینی جێین هەموو شتەکان لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا لێهاتوویی خۆیان بۆ ناسین و تاوتوێکردن دەخەنەڕوو و ئێمەش لەژێر کاریگەریی ئەو دۆخەدا ناسیاوییان لێ بەدەست دێنین.

"جێین"ـەکان لەو باوەڕەدا بوون کە هەموو شتێکی مادی راستەقینەیە، نەوەک شتە خەیاڵاوییەکانی نێو زەینی ئێمە : بەم پێیە مادە راستەقینەیە و هەتاهەتاییە و لە ملیۆنان توخم دروستبووەو لە دوو بەشیش پێکهاتووە:

١. مادە توخمێکە و ئەمەش مادەیەکە کە ئێمە دەتوانین هەستی پێ بکەین،

٢. مادەیەکی جوان و نەرمە کە لە مادەی کەرەمە پێک دێت و وەکو رووپۆشێک رۆح دادەپۆشێت.

بچووکترین بەشی هەر مادەیەک لە گەردیلە دروست بووە. جەوهەری هەر شتێک لە پێکاهتەی جیاوازی هەندەسە و ئەندازیاری دروست بووە. پەیڕەوانی ئایینی جێین باوەڕیان بە چوار تۆخمی خاک، ئاو، هەوا و ئاگر هەیە و پێیان وایە کە ئەمانەش گیانیان هەیە و هەناسە دەکێشن. کە ئەمەش نیشانەی باوەڕمەند بوون بە گیان گەرایی ئەوان بووە، کە بە نەفسی توخمەکان ناودێر کراوە.

رۆح بەشێک بووە لە مادە و جیهان پڕاوپڕی رۆحە. جەوهەرە و کاکڵی رۆحی مەعنەوییە و مەسەلەی رۆح پەیوەندی بەو جەستەیەوە هەیە کە تیایدا جێگەی بووەتەوە. جیوە یان رۆح، لە ناخەوە پاک و خاوێنە و لەوپەڕی شادی، زانست و خۆشی و شادی بەهرەمەند بووە. لە کردەوەدا، رۆح

ئالوودەی مادەی کەرەمە بووە، ئەم مادەیە بەرەبەرە بە تێپەڕبوونی زەمەن کۆمەڵێک گۆڕانکاری بەخۆیەوە دەبینێت و لە خاوێنی، تێگەیشتن، زانست و شادی بێبەری بووە. لەهەمان کاتدا ڕۆح هەیە کە خۆی لە ئالوودە بوون بە کەرەمە ڕزگار دەکات و دەستی بە پاکی ئازادی ڕادەگات کە بە موکتە یانی "ئازاد" ناودێر کراوە. ئەو ڕۆحانەی کە تووشی گۆڕانکاری بوون بە سمسارین دەناسرێن، واتە ڕۆحی سەرلێشێواو لەم جیهانە ڕزگاری نەبووە.

ڕۆح وەکوو چرایەک جەستە و ژیان ڕووناک دەکاتەوە. جۆرەکانی جیوە یان ڕۆح لە بژاردن نایەن، هەموویان بەم خەسڵەتەوە ناسراون کە خاوەن هزر و تێگەیشتنن. لەمەکتەبی جێیندا، ڕۆح بەپێی ئەو چەند هەستەی کە تیایدا هەیە، ڕیزبەندی دەکرێن. خوارترین چینەکانی ڕۆح، گژوگیا بوون کە بڕوای پەیڕەوانی جێین، تەنیا هەستی ساوایی (لامسە) بووە. پلەیەک دواتر جرووجانەوەری ئاسایی وەکوو کرم جێگەیان دەبێتەوە کە هەستەکانی ساوایی و بۆنکردنیان هەیە. ئینسان و خواوەندەکانیش جگە لە پێنج هەستی وەکو، بۆنکردن، تامکردن، ساوایی، بیستن و دیتن، هەستێکیدیکەی دەروونیشان هەبووە کە بەمەنەس ناودێر کراوە.

لەتیۆریی کەرەمەدا، پەیڕەوانی جێین لەو باوەڕەدان کە نوێبوونەوەی ڕۆح لە جەستەیەکیدیکەدا ئەوەیە کە ئاوێتەی مادەی کەرەمە بوون. کەرەمە دەتوانێ لەسەر تێگەیشتن، زانست و شادیی ڕۆح بپۆشێت و هەقیقەت لە ئینسان بشارێتەوە و لەئەنجامدا ڕەوۆح پەرچەکردارێکی هاوچەشنی مادەی دەبێت.

لەئێستادا کەرەمە بەم پێیە بەهۆی کردەوەی خراپ وچاکەوە کۆمەڵێک ڕەنگی جۆراوجۆر بەخۆیەوە دەگرێت و شوێندانەریی ئەمانەش لەسەر ڕۆح دیار و بەرچاوە و ئەم ڕەنگانەش لەنێو ڕەنگەکانی ڕەش و سپیدا خۆیان دەبیننەوە. ڕەنگەکانی ڕەش و ئاوی و شینکی پەیوەندی بە ڕەنگە شەیتانی و نگریسەکانەوە هەیە و ڕەنگەکانی سوور، زەرد و سپی پەیوەندی بە خەسڵەتە باش و خاوێنەکانەوە هەیە. پەیڕەوانی ئایینی جێین ئامانجیان

نەهێشتن و سڕینەوەی سەرجەم ڕەنگەکان بووە. پێوستە ڕۆح بە شێوەیەک لە یاسا و مادەی کەرەمە بەتاڵ بکرێت و ڕێگری لە هاتنی یاسا و مادەی کەرەمەی نوێ بکرێت کە ڕۆحێکی ئازاد و سەربەخۆی لێ دەربچێت و هیچ گرێدراوییەکی بە کەرەمەوە نەمێنێت. ئەگەر تاک بەپێی بنەمای ئەخلاقیی جێین هەڵسوکەوت بکات و ڕێگەیەکی دروست بگرێتەبەر، سەرئەنجام لەبیروباوەڕی کۆنی کەرەمە ڕزگاری دەبێت و کەرەمەیەک کە لە ئاکار و کردەوەکانی خویا دەبێت، ناتوانێ خۆی بگرێت و نامێنێتەوە و لەناو دەچێت و ڕۆح لە بەندیخانەی جەستە ڕزگاری دەبێت و بەرەو جیهانی نیروانە بەڕێدەکەوێت.

ئامانجی سەرەکیی جێین ئەوەیە کە ڕۆح ڕزگاری بێ و لەجیهانی نیروانەدا جێگیر بێت. ڕێگەیەکی گەیشتن بەم جیهانە جۆرێک یۆگە (یوگا)یە، کە بریتییە لە :

١. ماریفەتی دروست ،

٢. باوەڕمەندبوون بە کتێبە پیرۆزەکانی جێین،

٣. هەڵسوکەوتی دروست خۆ پارستن لە کردەوەی بێ ئەخلاقی.

ئەمانە بەسێ گەوهەری بەنرخ ئەژمار دەکرێن. هەڵسوکەوتی شیاو بریتییە لە :

١. نواندنی چاکە،

٢. ڕاستبێژی و خۆ بواردن لە درۆ کردن،

٣. خۆ بواردن لە دەست پیسی،

٤. خۆ بواردن لە هەوا و هەوەس،

٥. بێبەری بوون لەماڵی دنیا.

هەر تاکێک توانی بگاتە ئەم پلەیە، ئاستەنگەکان وەلا دەچن و ماریفەت خۆی دەنوێنێ و پلەیەکی ئازاد و سەربەخۆی پێ دەبخشرێت و لە وەها حاڵەتێکدا ئەو کەسە بە بوودا، تێگەیشتوو و جینە (کەسێک کە بتوانێ

کەسێک یان شوێنێک رزگار بکات) دەناسرێت. پاشان رۆح بەرەو جیهانی نیروانە هەڵدەزنێت.

ئایینی جێین یەکجار دێرینە و مێژووەکەی بۆ سەردەمی سەرهەڵدانی ئایینی بوودا دەگەڕێتەوە. بۆ ماوەیەکی زۆر گومان دەکرا کە ئایینی جێین و بوودا هێچ جیاوازییەکیان نەبووە، بەڵام هەنووکە روون بووەتەوە کە ئەمانە دوو ئایینی جیاواز لە یەکترن.

ناوی پێشەوای ئەم ئایینە وردمانە مهاویرە بوو، بەڵام ئەو دامەزرینەری ئایینی پارشوە بوو کە لە سەدەی هەشتەمی پێش زاییندا ژیاوە. تەنانەت جێین لەو باوەڕە دایە کە ئەو پێشتریش پێغەمبەر بووە کە ٨٤/.... ساڵ پێشتر گەیشتبووە نیروانە. بەپێی ئەم بیرکردنەوەیەی جێینەکان، ئایینی جێین هەتاهەتاییە و لە سەردەمە جیاجیاکاندا سەرلەنوێ لەلایەن کەسێکەوە خویا بووەتەوە کە دواجار مهاویرە بوو.

مهاویرە کەسایەتییەکی مێژوویی و شازادەیەکی ناسراو و پایەبەرز بووە کە بە جینە (کەسێک کە بتوانێ کەسێک یان شوێنێک رزگار بکات)، لەسەدەی شەشەمی پێش زاییندا لە بیهاری باکوور (بیهار یان بەهار بە یەکێک لە ویلایەتەکانی وڵاتی هیند دەگوترێت)، لە تەمەنی سی ساڵیدا تەرکە دنیا بوو، و رووی لە چلە کێشی، پارانەوە و ستایش کردن، کرد و رێگەی هەقیقەتی دۆزییەوە و لە سووچ و گوناح شۆرایەوە. دواتر بانگەشەی بۆ ئایینەکەی خۆی کرد و سەرئەنجام لە ساڵی ٥٢٦ی پێش زاییندا پەیوەستی نیروانە بوو. پاش نەمانی مهاویرە، لایەنگرانی ئایینەکەی لەسەرتاسەری هیند دەستیان بە بانگەشەی ئایینەکەی کرد. ژیانی لە زۆر رەهەندەوە وێکچووی ژیانی بوودا بووە .

پەیڕەوانی ئایینی جێین بەسەر دوو گرووپی سپی پۆش و ئاوی پۆش، دابەش دەبن. یەکەم ناکۆکی لەسەدەی چوارەمی پێش زاییندا هاتە ئاراوە و لە ئەنجامدا ساڵی ٧٩ی پێش زایین جیابوونەوەی ئەم دوو گرووپەی لێکەوتەوە. ناوی پۆشەکان پشتیان لە نەریتی کۆنی جێینی، واتە هەژاری و

گۆشەنشینی، نەکرد و پێی وەفادار مانەوە و رووت و قووت بە رێگەدا دەرۆیشتن. پیاوە ئایینییەکانی ئەم دوو گروپە لەوپەڕی هەژاری و بێ دەرەتانیدا ئەژیان و لەرێگەی سوالکەرییەوە بژیویی ژیانی خۆیان دابین دەکرد. سپی پۆشەکان پەڕۆکەی سپییان لە خۆیان دەئالاند و گسکێکیان بەدەستەوە دەگرت و زاری خۆیشیان بە پەنچکێک پەڕۆ گرێ ئەدا لەبەر ئەوەی لەکاتی خاوێن کردنەوەی رێگە و کۆلانەکاندا زاری خۆیشیان لە تۆز و خۆڵ پاراستبێت، کە نەوەک بوونەرێک بچێتە نێو زاریانەوە.

لە بەرهەمە گرینگ و پیرۆزەکان دەکرێ ئاماژە بە یانزەanga ، دوازدەupanga ، دە prakivna و شەش chedasutra بکرێت، کە یانزە agna بە پیرۆزترین و گرینگترینی ئەو بەرهەمانە ئەژمار دەکرێت. زمانە نڤیسکارییەکانی ئەم بەرهەمانە زمانی سانسکرێتی هیندییە کە ئێستا بە پراکریت ناودێر کراوە.

دەیان پەیام لە پەڕانپەڕی ئەو بەرهەمە پیرۆزانەی ئایینی جێیندا ماونەتەوە. کۆمەڵێک هۆنراوە بە شێوازی مهابهارتە و پوورانەکان و چەندین شانۆنامە لەپەیڕەوانی ئایینی جێین بەجێماون.

### سەردەمی حەماسەت

دوابەدوای چاخی ڤیدایی، لە سەدەی شەشەمی پێش زایین هەتا سەدەی دووەمی زایینی، دەیان مەکتەبی هزریی بەهێز لە ولاتی هیند سەریان هەڵدا. کە دەکرێ ئاماژە بە شۆڕشی هزری پەیڕەوانی ئایینی برەهمەن بکرێت کە لە ئەنجامدا مەکتەبەکانی بوودایی و جێینی بەدوای خۆیدا هێنا. ئەم دوو رەوتە هزرییە لەنێو چینەکانی کێشەتریە، دەوڵەمەند و دەسەلاتدارەکاندا سەریان هەڵدا. هەر لەو سەردەمەدا و دوابەدوای ویداکان، برەهمنەکان و ئوپەنیشدەکان لەنێو برەهمنەکان سەریان هەڵدا. هەروەها لە سەدەی شەشەمی زایینی بەم لاوە، لەنێو خەڵکی دەشتەکیی هیند، ئەدەبیاتێکی دیکە هاتە ئاراوە کە هەموو چین و توێژەکان دەیانتوانی بە کاری بێنن، یان لە کۆکردنەوەیدا بەشدار بوون. ئەم ئەدەبیاتە کە لە

تەنیشت سیستەم و ئەدەبیاتی برەهمەنیدا رووی لە گەشە کردبوو، بە ئەدەبیاتی حیماسیی هیند دادەندرێت کە بە گشتی حیماسەتی مەزنی مهابارتە تیایدا رەنگی داوەتەوە. دەکرێ ئەم بەرهەمە بە ئەنسکلۆپیدیای بیروباوەڕی ئەو سەردەمەی هیندییەکان ئەژمار بکرێت. هاوکات لەگەڵ ئەم بەرهەمە کۆمەڵێک بەرهەمی ئوستوورەیی هاتنە گۆڕێ کە بە پوورانەکان ناودێر کراون کە تیایاندا چیرۆکە کەوناراکان و بیروباوەڕ و روانگەی فەلسەفی و جیهانبینیی هیندییەکان، رەنگیان داوەتەوە.

بەم پێیە، رەوتە بەهێزەکانی ئەو سەردەمە، جیا لە ئووپەنیشدەکان، ئایینی سەربەخۆی وەکوو بوودا و جێین بوون کە باس لەرێگەی رزگاری دەکەن، ئایینی چارڤاکە یەکێکی دیکە لەو ئایینانە بوو کە هیچ گرینگییەک بە ئیلاهیات نادا و باوەڕی بە رەسەنایەتیی مادە بووە و نکۆڵی لە سەرەتا و کۆتایی یان گەڕانەوە دەکرد، پاشان ئایینەکانی سودیوە کریشنە و ئایینی بەهاگووەتە کە رێگەی یەکتاپەرستی و خۆشەویستی بوون، سەریان هەڵدا، سەرئەنجام تاقمی پەشووپتە سەری هەڵدا کە باوەڕی بە ستایش کردن و پەرستنی شیوا هەبوو.

لەم چاخە سەرسووڕهێنەرەدا، سەرجەم بیرەوباوەڕی فەلسەفی، جیهانناسی و بەڵگە هێنانەوە و مشتومڕ کردن، چلەکێشی و ئاوەزمەندی لە تەنیشت یەکدا بوونیان هەبوو، کە بناغەی سەرجەمی ئەم جۆرە بیر کردنەوانە لە حیماسەی مەزن و بەشێک لە پوورانەکاندا بەرچاو دەکەوێت. بەم هۆیەوە ئەو سەردەمە بە سەردەمی حیماسی ناودێر کراوە. سەرهەڵدانەوەی شارستانییەتی مەزن و کەونارای هیندی بەر لە زاڵ بوونی ئارياييەکان بە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو سەردمە دێتە ئاژمار کە بە تێپەڕبوونی زەمەن لە ئایینی برەهمەنی نزیک دەبێتەوە و لە قاڵبی ئایینی شیوادا خوی دەنوێنێت. هەروەها کەمڕەنگ بوونەوەی ئایین و مەکتەبی بوودایی لە سەدەی چوارەمدا و سەرهەڵدانەوەی ئایینی برەهمەنەی بە یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو سەردەمە دادەندرێت. وەرچەرخانی ئایینی برەهمەنی بۆ ئایینی هیندوو لەو سەردەمدا، بە سەردەمی "نوێ برەهمەنی" یان دەسپێکی "دەورەی هیندوو" دەناسرێت.

پێشتر سەبارەت بە نووسراوە ئوپەنیشدەکان، بوودایی و جێین بە تێر و تەسەلی باسیان لەسەر کرا. هەنووکەش تایبەتمەندییە گشتییەکانی بیروباوەڕی مەکتەبی چارڤاکە دێنینە بەرباس :

١. سەرچاوەی ناسینی ئێمە تێگەیشتنە و بە یارمەتیی هەستەکانمان لە جیهانی دەوروبەری خۆمان تێدەگەین، بەم پێیە ئێمە تەنیا دەتوانین لە جیهانی ماددیی تێ بگەین، ئەمەش بە تاقە ڕاستییەک دادەندرێت کە ئێمە دەتوانین لێی تێبگەین، ئینسان لەڕێگەی داڕنینەوە تایبەتمەندیی مادە ئەناسێت،

٢. جیهان لە چوار تۆخمی ئاو، خاک، هەوا و ئاگر دروست بووە،

٣. هەروەها ڕۆح ئەشێ دەروونێکی مادی هەبێت و تێگەیشتن و ئاوز لە بەرهەمەکانی ئەو چوار تۆخمە دادەندرێت،

٤. سەرچاوەی ژیان مادەییە، سەرەتا و کۆتایی بوونی نییە،

٥. نیروانە پڕوپووچە و هیچ بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی لە ئارادا نییە،

٦. ئەگەر ژیان ئاوێتەی ڕەنج ومەینەتی یان خۆشی و بەختەوەری بێت، بەهەر شێوەیەک بێت مردن روو ئەدات و بە خاڵی کۆتایی دادەندرێت،

٧. هەر دوو پەیڕەوانی ڕێگەی ماریفەت و پەیڕەوانی ڕێگەی کردەوە، بە هەڵەدا دەچن و شوێن کەوتنی ئامانجی بێ ئاکام هیچ سوودێکی نییە،

٨. کات بە دەسکەوت و هەڵ بزانن و بنچینەی ژیان چێژ وەرگرتنە،

٩. هەڵبەستڤانانی ویداکان درۆزنن. لەو کاتەدا تێگەیشتن لەم مەکتەبە کارێکی یەکجار ئەستەم بوو، بۆیە بەو شیوەیە پەرەی نەگرت و تەنیا چەند کەسێکی لەدەوری خۆی کۆکردەوە.

## ئایینی بەهاگوەتە

چەمکەکان:

Bhaga – uta: خاوەن بەخت باش، بەختەوەر (کریشنە) واتاکانی دیکە: پیرۆز، ئیلاهی و شیاوی پەرستن.

Bhaga – uta : ناوی ئایین، شوێن کەوتوانی ئەم ئایینە، ئەوەی لەلایەن دۆستی (کریشنە)وە بێتە ئاراوە.

Bhaga – utad. Gita: سروودێک کە کریشنە بۆ خۆی وتوویەتییەوە (کریشنە.(

Bhaga: بەش، میرات، رێگەی ئەڤین و خەشەویستی.

سەرچاوەکانی ئەم ئایینە لە نەریتەکانی ئایینی وسوودیوە کریشنەدا بەرچاو دەکەوێت و دەقەکانی پەیوەندیدار بەو ئایینە لە بەهاگوەتە گیتا_ دا بوونی هەیە. دواتر ئایینی وینشوویی لەئەنجامی تێکەڵبوونی ئایینی کریشنە و ئاینەکانی دیکەی ویدایی، سەر هەڵ ئەدات. ئەم ئایینە لە باکووری رۆژئاوای هیند، لە دۆڵی سێند، سەریهەڵدا.

## چوار قۆناغی بەهاگوەتە

لەقۆناغی یەکەمدا، ئەم بیرۆکە و ئایینە لە پەراوێزی ئایینی برەهمەنیدا سەری هەڵدا. پێدەچێ ئەم ئایینەش وێکچووی ئایینەکانی بوودایی و جێین لەنێو توێژی کشتریەدا خویا بووبێت کە باس لە ستایش کردنی کریشنە، شازادەی قەبیلەی یادەوە دەکات. ئەگەری زۆرە ئەم قۆناغە لە سەدەی سێیەمی پێش زاییندا خویا بووبێت.

قۆناغی دووەم، قۆناغی تێکەڵبوونی ئایینی بەهاگوەتە لەگەڵ ئایینی برەهمەنی بووە، لەم تێکەڵبوونەدا کریشنە و وینشوو کە یەکێک لە خواوەندەکانی ویداییە، ئاوێتەی یەکتر بوون و کەسایەتییەکی یەکانگیریان پێکهێنا و کریشنە بۆ سەمبولی ئینسانی وینشوو دەگۆڕدرا کە حیماسەت و قارەمانییەتیی سەرسوورهێنەری دەخولْقاند.

قۆناغی سێیەم، قۆناغی گۆڕدرانی ئایینی بەهاگوەتە بۆ ئایینی وینشووییە کە هەتا ئێستاش وەک خۆی ماوەتەوە. لەم قۆناغەدا بنەماکانی مەکتەبی ویدانتە، سانکهیە و یووگە لەگەڵ ئایینی وینشوویی تێکەڵ بەیەکتر دەبن و بە شێوەی ئایینێکی فەلسەفی و بێ وێنە خۆی دەر ئەخات.

پێدەچێ ئەم گۆڕانکارییە لە کۆتاییەکانی سەدەی دوازدەیەم و سەرەتای سەدەی سێزدەیەمی زایینیدا ئەنجام درابێت.

قۆناغی چوارەم، وەرچەرخانی ئایینی بەهاگوەتە لەمەکتەبی راڤەکاری مەزن ودانتە واتە رامە نوجە دروست ئەبێت. کریشنە کوڕی وسوودیوە یەکێک لە خانەدانەکانی کێشتریە بوو، کە بە بەهاگوەت واتە شیاوی ستایش کردن، ناودێر کرابوو.

ئایینی بەهاگوەتە ئایینی یەکتاپەرستی بووە و بەرەبەرە بە تێپەڕبوونی کات مەکتەبەکانی سانکهیە و یووگە دژەیان کردووەتە ناوی. هەروەها ئەم دوو مەکتەبە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئایینی ویدایییەوە نەبووە. ئایینی بەهاگوەتە بە (pancaratra) پنچە راترە ـش ناسراوە. پنچە راترە دووسەد نامەی لەخۆ گرتووە کە سەرجەمیان باس لە یەکتاپەرستی دەکەن. وشەی پنچە راترە بە مانای "پێنج شەو" دێت کە هۆکاری ئەم ناو لەسەر دانانە روون نییە. بە کۆی ئەو دووسەد نامەیە samhita دەگوترێت.

## بیروباوەڕی ئایینی بەهاگوەتە

١ . لەبەشێکی ریگ ڤیداییدا ئاماژە بە هاتنەخوارەوەی هەق بۆ جیهانی مادە کراوە و لە بەهاگوەتەدا پەرەی گرتووە، کە ئەمەش بە یەکێک لە گرینگترین بەشەکانی ئەم مەکتەبە هزرییە ئەژمار دەکرێت. هاتنەخوارەوەی هەق بۆ سەر زەوی، زیاتر بەرەورووی وینشوو بۆەتەوە کە پاش تێکەڵبوونی لەگەڵ ئایینی کریشنە، کریشنە سیمای راستەقینەی هەق لەسەر زەوی، واتە رەنگی وینشووی بەخۆیەوە گرتووە. وینشوو لەچەندین سیمای جیاوازی وەکوو سیمای "کیسەڵ، ماسی و ورچ"دا هاتووەتە سەر زەوی و خویا بووە و رێگری لە فەوتانی زەوی کردووە و لە مەترسیی نەمان رزگاری کردووە. دواتر کە ئایینی بەهاگوەتە لەگەڵ ئایینی برەهمەنی تێکەڵ بوو، "رامە" و "کریشنە"ش سیمای هەقیان بەخۆوە گرت.

٢. وەرگرتن و پێ بەخشرانی بەهرەی ئیلاهی خواوەند هیچ جیاوازییەکیان نییە، ئەو لەوپەڕی جیهانەکان دایە. ئەو لە ناو ناچێت و بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، ئەو برەهما و شیوا و سەرجەم خواوەندەکانی دیکە دروست

دەکات، بۆ ئەوەی برەهما و شیوا و سەرجەم خواوەندەکان بتوانن یاساکان بەرەو لای ئینسانەکان ببەن و ئایینەکەی ئەو پەرە پێ بدەن و زامن فەرانڕەوایی هەتاهەتایی ئەو لەسەر زەوی بن. خواوەندی مەزن هیندێک جار لەبەر ئەوەی سووچ و تاوانی ئینسانەکان پاک بکاتەوە، بەهرەی بێ کۆتایی خۆی بەسەر هەموو مەخلووقاتدا دەڕژێنێت، و بۆخۆی دەست دەکا بە ڕێنوێنی کردنی ئینسانەکان کە دەقی ئەم شتە لە خواوەند کریشەندا بەرچاو دەکەوێت .

٣. تیۆریی سەمبوولە چوار فاقەییەکە: یەکەم جار ئەوە کریشنەیە کە بۆخۆی وێکچووی وینشوو و سەرچاوەی خویا بوونی ئیلاهییە و دووەمیش لەلایەن وینشوو سمکارشنە و برای کریشنەوە سەرهەڵئەدات کە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەسپێک و دێوزمەی یەکەم لە فەلسەفەی سانکهیەدا، بوون. پاشان کریشنە و سمکاریشنە، پردیومنە، کوڕی کریشنە دروست دەکات. ئەو بە بیر و زەینی جیهان دادەندرێت. دواتر سێ بنچینە یا سێ پیشەی جیاواز هاتنە گۆڕێ، و دوایین جار (جاری پێنجەم) برەهما خواوەندی جیهان هاتە سەر زەوی.

لە بەهاگوەتەدا ڕۆح بەشێک بووە لە خواوەند، بەڵام کتومت وەک ئەو نەبووە. جیهانی مادی لە ڕەهەندی چۆنایەتییەوە لە خواوەند جیاواز بوو.

٤. شێوەی خوشەویستی : ئەمە باسێکی نوێیە کە لە ئەدەبیاتی ئایینی هیندیدا هەتا ئەو کات پێشینەی نەبوو. ڕێگەی نوێی ڕزگار بوون سۆز و خۆشەویستییە. پێشتر ماریفەت و کردەوە لە ئارادا بوو، و چلەکێشی و تەرکە دنیا بوونیان بە ڕێگەی هەق دادەنا، بەڵام بەها گوەتە ڕێگەی ئێڤین و خۆشەویستی هەڵبژارد و سەرنجی خۆی لەسەر خواوەند کریشنە قەتیس کردەوە و ئەمەی بە شیاوترین ڕێگە لەقەڵەم دا. پشت بەستن بە کریشنە ڕۆحی ئینسان ڕووناک دەکاتەوە. ئەو کەسانەی کە خواوەندیان ئەپەرست، دەبوا یەکتاپەرست ئۆگری قیامەت و گەیشتن بە خواوەندی بێ هاوتا بن و داوایەکی ڕەوای لە خواوەندەکان هەبوایە، هەتا خواوەندیش خێر و بەرەکەتی خۆی بەسەردا بڕژێنێت.

٥. هەروەها چۆنییەتیی ئاکار و کردەوە لەبیر ناکرێت و تەئسیری خۆی هەیە، بەڵام شادی و بەختەوەری کە لە کاری چاکەوە سەرچاوە دەگرێت، ناسەقامگیرە و بەرەو نەمان دەچێت و لەگەڵ ئەوەی کە رۆح لەنێو بەهەشتدا هەتا دوایین توێشوو کەڵکی لە کارە باشەکانی خۆی وەرگرت، بۆ جارێکی دیکە ئاوقای جیهانی مادی دەکەنەوە و سەرلەنوێ لە جەستەیەکی دیکەدا خۆی دەبینێتەوە. رێگەی گەیشتن بە ئازادی و دەربازبوون زیاتر پەیوەندی خواستی ئینسانەکانەوە هەیە هەتا ئەوەی کە بە پێویستییەک دابندرێت. هەر کارێک کە دەکرێ نابێ هیچ بەرژەوەندییەک لەبەر چاو بگیردرێت و بۆ ئەوەی چرای زانست لە ناخی تاکدا دابگیرسێت، دەبێ خۆیان لەپێناو هەقدا بکەنە قوربانی.

٦. قیامەت و گەڕانەوەی رۆح. گەیشتن بە هەق گرێدراوی خواوەندێکی بێ هاوتایە. ئەو کەسانەی کە ئازد دەبن دەتوانن چاویان بە برەهمەن بکەوێت، ئەم بەهرەمەند بوونەش لە هەق، زامنی مانەوەی هەتاهەتایی رۆحە و هەروەها لە دەست گێرە و کێشەی سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ سەر زەوی رزگاری دەبێت.

ئەم قۆناغەی گەشە کردنی بەهاگوەتە لە باشووری هیند بڵاو بوویەوە و کە لایەنگرەکانی بە مەجزووبین دەناسران. لەم قۆناغەدا بوو، کە ئەدەبیاتی بەهاگوەتە لەگەڵ ئەدەبیاتی برەهمەنی ئاوێتەی یەکتر دەبن و سەرئەنجام رامە نووجە لە سەدەی دەوانزەی زایینی، لە قاڵبی مەکتەبێکدا کۆیان دەکاتەوە.

## ئایینی شیوایی

پێدەچێ ئایینی شیوایی پێشینەیەکی لەمێژینەی هەبێت، چونکە بە سەرنجدان بەو ئاسەوارە کەوناراییانەی کە لە سەدەی هاوچەرخدا دۆزراونەتەوە، بنەڕەتی ئەم ئایینە بۆ پێش لە ویداکان دەگەڕێتەوە، واتە دەچێتەوە سەر فەرهەنگی خۆجێیی و کۆنی دۆڵی سێند کە فەرهەنگەکانی موهنجودروو و هەرەپا بوون. یەکێک لەو پەیکەرانەی کە لە ئەنجامی

هەڵدانەوەکاندا دۆزراونەتەوە، خواوەندێک نیشان ئەدات  کە لە سەر پشتی گایەک راوەستاوە و هەموو ئاژەڵەکانی دیکەش لە دەور و تەنیشتی کۆبوونەتەوە، بەڵام ئەوەش بەو مانایە نییە کە ئایینی شیوایی بەر لە سەردەمی ویداکان لەگەڵ ئایینی شیوایی چاخی دوای برەهمەنییەکان هاوشێوەی یەکتر بوون. بە دڵنیاییەوە بە تێپەڕبوونی زەمەن، وەرچەرخانی مەزن لە دۆڵی سێند و سەرجەم وڵاتی هیند رووی داوە و هزری فەلسەفیی نوێ، یەکتاپرستی و دەیان رێگەی جۆراوجۆری گەیشتن بە نیروانە و هەق هاتبووە ئاراوە کە هەموویان کاریگەریی قووڵیان لەسەر ئایینی خۆجێیی و کۆن دانابوو. کۆنترین پەیڕەوانی ئەم ئایینە کە شیوایان وەک فەرمانڕەوای ئاژەڵەکان ستایش دەکرد، دابەشی دوو دەستە دەبوون کە هەردووکیان نارەوا و دژبە بنەماکانی ویدایی بوون. وەک ئەوەی دەرکەوتووە ئەم ئایینە کۆمەڵێک رێوڕەسمی تایبەتیی هەبووە : قوربانی کردنی ئینسان و پێشکەش کردنی شەراب بە شیوا، بەشێک لەو رێوڕەسمانە بوون. دواتر شەرابەکەیان لە کاسەی سەری پیاوی (قوربانیکراو؟)دا هەڵدەقوڕاند. نیزام و سیستەمی چینایەتی لەوێدا بوونی نەبوو و پەیڕەوییان لە یاسای کەرەمە نەکردووە. جەستەی خۆیان بە خۆڵەمێش دادەپۆشی و شەرابیان دەخواردەوە و بەکۆمەڵ خەریکی رابواردن بوون و هێندێک جاریش لە گۆڕستانەکاندا دەمانەوە؟؟؟!!!.



پەیەکەرەی موهنجودرو

ئەم ئایینە پاش ئەوەی لە سەدەی هەشتەمی زایینیدا تێکەڵبوون بە بیروباوەڕی نوێتر بوو، لە قاڵبێکی نوێدا لە سەرتاسەری هیند بڵاو بوویەوە و پەیڕەوانی ئەم ئایینە بە پەیرەوانی گەورەی ئاژەڵان ناوبانگیان دەرکرد. پەیڕەوانی ئەم ئایینە لەڕێگەی گەیشتن بە هەقیقەتی زاتیی شیوا ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان ئەدەن. ئەوان خواوەند شیوایان بە یەکەمین هۆکاری دروستبوونی جیهان لەقەڵەم ئەدا. ئەو لەگەڵ ئەوەی کە جەستە و سیمایەکی جوانی هەبوو، لەکاتی زۆر پێویستدا، خۆی دەنواند و سیمای خۆی نیشان ئەدا. ئازادی و رزگاری لە ڕێگەی نزا و ستایش کردنەوە، داماڵینی نەفس لە سووچ و گوناح و داب و دەستووری یووگە (یووگا) و چەند ڕێوڕەسمێکی دیکەی وەکوو پاڕانەوە و قوڕاوی کردنی لەشەوە دەستەبەر دەبێت. رابواردن، گۆرانی گوتن و پێکەنین و هەڵپەڕین و بەکارهێنانی وشەی بێسەر و بن بە ئامرازی دەربازبوون و رزگاری ئەژمار دەکران، چونکە ئەم یاسایە ڕۆحی لە بەندی بیرەوەرییەکان رزگار دەکرد. ستایش کردنی کۆ ئەندامی زاوزێ (linga) بوو کە بە هێزی ئافرێنەری شیوا ئەژمار دەکرا. داب و دەستووری چلەکێشییەکەیان زیاتر وێکچووی یووگا بوو، بەڵام خۆ شێت کردن و خۆ لە کەریەتی دان بە تایبەتمەندییەکانی هەڵسووکەت کردنیان دادەندرا و لەو باوەڕەدا بوونە کە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە لووت بەرزی و خۆ بە زڵ زانینین لەناو دەبات. بەگشتی داب و دەستووری ئایینی ئەوان لەگەڵ برەهمەنییەکان عەرز هەتا ئاسمان جیاوازی هەبوو، بەڵام چەندین تاقمی شیوایی جۆراوجۆر بوونیان هەبووەو ئێستاش هەر هەن. جیا لەم تاقمانەی کە ئاماژەمان پێکرد، لە تێڕوانینی فەلسەفییەوە بە نیوەچڵی دەکەونە بەرچاو، بەڵام چەند تاقمێکی دیکە هەن کە لە ڕەهەند و ڕوانگەی فەلسەفییەوە بەرەو پێشڤەچوونێکی مەزنیان بەخۆیانەوە بینیوە. بیروباوەڕی ئەم تاقمانە لە بواری جیهانناسی و هەروەها ڕێگەی دەربازبوون لەسمسارە، تێکەڵ بە کەیتربوون و ڕواڵەت و سیمایەکی نوێی گرتە خۆی. لەم نێوانەدا سێ مەکەتب لە هەموویان گرنگتر

بوون. یەكێكیان لە كشمیر، یەكێكیدیكەشیان لە باشووری هیندو هەروەها مەكتەبی "ویرە شیوە". ئەدەبیاتی كۆنی شیوایی بە شێوەی سانسكریت نووسراوە كە بە ئاگەمە ناوبانگی دەركردووە. هەروەها دوو گرووپی دیكەش بەناوەكانی تنترە و سمهیتە بوونیان هەیە. ئاگەمە پەیوەندی بە پەرستنی شیوا، تنترە پەیوەندی بە پەرستنی هێزی ئافرێنەری شیوا واتە شكتی، گرووپی سێیەمیش یان سمهیتەكان پەیوەندییان بە پەرستنی وینشووەوە هەبوو. ئەم سێ گرووپە خۆیان لە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمەكانی تایبەت بە ستایش كردنی ویدایی، بواردووە.

بنەمای نامەكانی ئاگەمە لە مەكتەبی كشمیریدا سیمایەكی فەلسەفی بەخۆیەوە گرتووە و تێكەڵی باس و خواسی یەكتاپەرستیی ویدانەتەیان كردووە. پەیڕەوانی ئەم مەكتەبە لەو باوەڕە دان كە ئەگەر ئینسانەكان دەروونی خۆیان هاوشێوەی شیوا لێبكەن و لە ناخی خۆیاندا شیوایەك دروست بكەن، ڕێگەی ڕزگاری ئەدۆزنەوە.

شیوا لە ڕوانگەی پەیڕەوانی ئەم تاقمەوە هەم بە هۆكاری جیهان و هەم بە هۆكاری مادی دەزانن. شیوا یان هەمان شكتی بە كەڵك وەرگرتن لە هێزە سیحراوییەكانی خۆی، جیهانی خوڵقاند.

ئەم هێزانە ئاگایی، شادی و خۆشیی بێسنوور، ئیرادە و ماریفەت و چالاكی بوون كە شیوا بە یارمەتیی ئەمانە هەموو شتێك دروست دەكات و لەناوی دەبات و كە ئەمانەش بۆ بەشەندەیی بێ پایانی خۆی دەگەڕێتەوە. جیهان بە بەردەوامی لە حاڵی گۆڕان دایە كە ئامازەیە بۆ ئافراندن و لەناو چوون.

بوونەوەرەكان لە جیهانی سمسارەدا سەرلێشێواون و هۆكارەكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە خۆیان ئاوێنەی خواوەندەكانن و لە گەورەیی ڕۆحی خۆیان بێ ئاگان. ئەمە نەزانیی تاكەكەسە و بۆ دەرباز بوون لەم گێژاوە ئەشێ بەشوێن ڕاستیدا بگرێت و كاتێكیش كە ڕۆح سەرچاوەی ڕاستییەكان بدۆزێتەوە، پەیوەستی زاتی هەق دەبێت. شوێنكەوتوانی ئایینەكە بەم

شـێوەیە دەرکـەی کـۆڕی موریـدان بەڕوویانـدا دەکرێتـەوە و ئەشـێ فێـری ماریفەت بێن و چلەی مەعنەوی بکێشن و نزای بـەخێر بکـەن و بیـرو زەینـی خۆیـان کـۆ بکەنـەوە و پـاش ئـەوەی ئـەم ڕێگـەیان بـڕی، شـکتی ڕێگـەی خواوەندییان پیشان ئەدات و بەرەو لای هەق بەڕێ دەکەون.

لەمەکتەبی باشووریی هیند، بە پێچەوانەی مەکتـەبی کشـمیری، باوەڕیـان بە سێ بنەمای سەرەکی هەبوو کە بریتی بوون لە : خواوەنـد، ڕۆح و مـادە. شـیوا بـە بناغـەی دروسـتبوونی جیهـان و هـەموو بوونـەوەرەکانی جیهـان دادەندرێت و بە سەرتر لە دوو فاقـەیی ڕۆح و مـادە ئـەژمار دەکرێـت. ئـەوان خواوەندیان بە پتی واتە (سەروەر و شالیار) ناودێر کـردووە و هـەروەها ڕۆح ناوی "پشوو = بەند و زنجیر" یان "ئەچیـد = مـادە"ی لەسـەر نـراوە. مـادە پەیوەندی بە پێغەمبەرەکانەوە هەیە و کە خواوەندی ڕۆح بە جیهانـەوە گـرێ ئەدات. لەم مەکتەبەدا، کاتێک کە ڕۆح گەیشتە خزمەتی هـەق، کەسـایەتی و خەسڵەتە پاک و خاوێنەکانی خـۆی دەپارێزێـت و خۆشـی و شـادیی شـیوای بەسەردا دەبارێت.

تـاقمی سـێیەم بـە ویـرە شیوە واتـە "شـیوای پاڵـەوان" نـاودێر کرابـوو. هەروەها لینگەیەت یان "کەسانی خـاوەن کۆئەنـدامی زاوزێ" نـاوێکی دیکـەی ئـەم تاقمـە بـووە کـە بـە سـەمبولی هێـزی خوڵقانـدنی شـیوا دێتـە ئـەژمار. پەیڕەوانی ئەم تاقمە، شیوا بە خواوەندی مەزن و بێ هاوتا لەقەلەم ئەدەن و هاوشێوەی لینگـە "کۆئەنـدامی زاوزێ" ستایشـی ئەکـەن. ئـەو بـێ هاوتایـە و جیهانی ڕۆحەکان و جیهانی مـادی ئـەو ڕاسـتییانەن کـە شـیوا بـە یارمـەتیی هێـزە ئافرێنــەرەکانی خــۆی خوڵقانــدوونی. ڕێگــەی ڕزگــاری ئێڤــین و خۆشەویسـتی بـۆ شـیوایە، شـیوا بـە دوو شـێوەی هەڵسـووڕێنەری جیهـان و ڕۆحەکان خـۆی ناسـاندووە و و ڕۆحـی بـەجێماوی شێوا ئـۆگری گەڕانەوەیـە بەرەو لای ئـەو. شـکتی هێـزی خوڵقێنـەر و بهکتـی هێـزی خۆشەویسـتییە و ئاشـقی گەڕانـەوە و تێکـەڵبوون لەگـەڵ تۆرەمـەی خۆیـەتی. بـەم پێیـە، خوڵقێنەر و مەخلوق لەگەڵ یەکتر جیاوازن و جۆرێک ڕێکەوتنو یـەکگرتن لـە نێویاندا هەیە.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

1. Himauat
2. Bharata – Varsha
3. Purana
4. Jambbu

٥ .بڕوانە بلاڤۆکی، ج ١، چاپی ساڵی ١٣٤٧ی تاران، وتاری "جوگرافیای ئوستوورەکانی ئێران."

٦ .بڕوانە kent, R. G, Old Persian, New Haven

7. Sindhu
8. Prakrit

٩ : Ramayana .بڕوانە یادداشتەکانی بەشی یەکەم، ژمارەی ٢٠ بکەن.

10. Mahabharta
11. Taims
12. Taxila

١٣ : šiva .ئیزەدی مەرگ لە ئوستوورەکانی هیندیدا

١٤ : Vishnu .خواوەندی پاسەوان و پارێزەر لە ئوستوورە هیندییەکاندا

١٥ : Krishna .ناوی یەکێک لە ئایینەکانی هیند و هەروەها ناوی یەکێک لە خواوەندەکانیشە.

16. Kaveri
17. Dolmens
18. Mohenjodaro
19. Larkana
20. Harappa
21. Figurines

٢٢ : Sakti .هێزی چالاک یان وزەی مێینەی خواوەندێک، بەتایبەت شیوا.

23. Mahayogin
24. Pasupati
25. Trisula
26. Animism

٢٧ : Nagas .ناگە لە ئەفسانە هیندووەکاندا بە واتای مار هاتووە، بەتایبەت ناوی مار یان ئەژدیهای ئەفسانەیی بە سەر و سیمای ئینسانەوە کە لەشاری بووگاراتی (Bhogarati)لە ناخی زەویدا زاوزێ دەکەن.

٢٨ : Yaksas .بوونەوەری فەزایی، رۆح، سامۆتکە و ناوی بەشێک لە نیوەی خواوەندە هیندییەکان.

29. Sita

30. O. T. S. (Taittiriya Samhita), 3, 4, 5.

31. Brahmanas

32. Taittrya Aranyaka (T. A)

33. Asvins

34. Dnepr

35. Yenisei

36. Minusinsk

37. Afanasievo

38. Andronovo

39. Ob

40. Dumezil

41. Samaveda

42. Atharvaveda

43. Yajurveda

٤٤ : Usas .خاتوونی خواوەندی بەرەبەیانی.

٤٥ : Agni .خواوەندی ئاگر.

46. Anthropomorphism

47. Polytheism

48. Abstraction

49. Monotheism

50. Pantheism

51. Astaka

52. Adhyasa

53. Mandala

54. Sukta

٥٥ : Mac Donnel .رۆژهەلات ناسی بەناوبانگ و نووسەری کتێبی "ئەفسانە ڤیداییەکان."

56. Prajapati

57. Atharvan

58. Inanimate

59. Samudra

60. Adri

٦١ : Comogony .ئافراندنی جیهان.

62. TB (Taittirya Brahmana), 2, 8, 9

63. Tvasta
64. TB, 2, 2, 9, ff
٦٥ : Hiranyagarbha .مناڵدانی زێڕین.
66. Chandogya Brahmana
67. Avatar
68. Aditi
٦٩ : Usas .خواوەندی سپێدە و بەرەبەیانی.
70. Vivasvat
71. Manu
72. Yama
73. Yami
74. Dyaus
75. Prthvi
76. Vaya
77. Sarasvati
78. Vişva. Rupa
79. Trita
80. Puruşa. Suka
81. Rajanya
82. Vişya
83. Şudra
84. Ekam
85. Kama
86. Manas
87. Gandhava
88. Matarişvan
89. Puşan
٩٠ .ئەم بەشە، لێکدانەوەیەکی گشتی و کورتە لە ئایین و مەکتەبە فەلسەفییەکانی هیند، لە نووسینی "داریووش شایگان."
91. Pasupati
92. Mahabharata
93. Mohenjodaro
94. Harappa

٩٥. زانیاریی ئێمە سەبارەت بە ئەفسانەو ئایینەکانی دۆڵی سیند، زیاتر پەیوەندی بە کاریگەرییەکانی ئایینی خۆجێیی دۆڵی سێند لەسەر ئایینی ڤیداکانی هیندەوە هەیە، کە وەرچەرخان لە مەکتەبی فیکریی ڤیداییدا پێک دێنێت.
96. Viddhi
97. Arthavada
98. Vanthropomorphic
99. Vajra
100. Vitrahan
101. Aryaman
102. Bhaga
103. Dakşa
104. Amşa
105. Vişvakarma
106. Puruşa sukta
107. Microcosm
108. Microcosm
109. Pani
١١٠ : Eschalotogy .زانستێک کە پەیوەندی بە ڕۆژی حەشر، یان کۆتایی جیهان بێت.
١١١ : Vpanisad لە وشەدا بە مانای "هێور بوونەوە سووچێکدا" دێت.
112. Atman

١١٣ : antaran agnihotram .قوربانی کردنی ئاخ و دەروون لەپێناو ئەگنیدا.
114. şruti
115. Samsara
116. Mokşa
117. Mahapralaya
118. Kalpa
١١٩. هەر سەد ساڵ تەمەنی برەهمەن (برەهما) بەرانبەر بە ٦٨٠/١٥٧/ ٠٠٠/٠٠٠/٠٠٠ ساڵە.
120. mahayuga
121. Krita
122. Treat
123. Dwapara
124. Kali
125. Dhorma

126. Sakya

127. Tathagata

١٢٨ : Jataka واتە زاوزێ، کۆمەڵە چیرۆکێکە سەبارەت بە زاوزێی بوودا و وەرچەرخانەکانی ژیانی بوودا. لەم پەیوەندییەدا چاو لە "بدر الزمان قریب" و سانترە جاکتە : چیرکی لە دایک بوونی بوودا، چاپی ساڵی ١٣٧١ی هەتاویی تاران بکەن.

129. Bodhisatva

130. Tusita

131. Mahamaya

132. Yasodha

133. Anatta

134. Bhavacakra

135. Dharna

136. Mahana

137. Hinayana

138. Kanishka

139. Jivan nukti

140. Darsana

141. Bhavana

142. Bhakti

143. Trikaya

144. Dharmakaya

145. sambhogakaya

146. Jsinisn

١٤٧ : tirtha – kara .ڕێبوار، کەسێک کە دەروویەکی بۆ گەیشتن بە جیهانی نیروانە دۆزیوەتەوە.

١٤٨ : Animism .باوەڕمەندی بە هەبوونی نەفس، تەنانەت لە کەلوپەلێکیشدا کە گیاندار نەبێت.

149. na. ekanta

150. An. Ekanta. Vada

151. Naya

152. syat

153. Anu

154. Jiva

155. Muka

156. Samsarin

157. Manas

158. Janana
159. Trratana
160. Ahinsa
161. Sunrta
162. Jina
163. Vardhamana Mahavira
164. Parsva
165. Kşatrtrya
166. Vasudeva Krişna
167. Bhagvata
168. Bhakti
169. Paşupata
170. Veo – Brahmanism

١٧١ .سەبارەت بە وەرگێڕانی فارسیی ئەو بەرهەمە، بڕوانە گیتا (بهگود گیتا)، لە وەرگێڕانی محەممەد عەلی موەحید، چاپی ١٣٤٤ی هەتاویی تاران، بنکەی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب.

172. Yadava
173. Avatar

١٧٤ : Vedanta .بەو دەقە کۆنانە دەگوترێت کە جەوهەری ویداکانی تێدایە و بۆچوونێکی فەیلەسووفانەیە لەسەر بنەمای ئوپەنیشدەکان : samkhya سیستەمێکی فەلسەفییە کە بە کەسێک بەناوی Kaplia دەگوترێت و ٢٥ ئەسڵی سەرەکی لەخۆ گرتووە، : yogaبە نیزامێک دەگوترێت کە پەیوەندی بە ڕۆح سروشتەوە هەیە کە سەرجەمیان لە مەکتەبی samkhya بوونیان هەیە.

175. avatara
176. Prasada
177. Uyuha
178. Samkarsana
179. Pradyumna
180. Manas
181. Aniruddha
182. Alvar
183. Şivaism
184. Paşupati
185. Viraiva
186. Aganas
187. Tantras

188. Samhitas
189. Pati
190. Paşu
191. Paşa
192. Acid
193. Vira şiva
194. Lingayat

## سەرچاوەکان


میهرداد بەهار، ئەفسانە ئێرانییەکان، تاران ١٣٥٢، چاپی دووەم: توێژینەوەیەک لەسەر ئوستوورە ئێرانییەکان، چاپی ساڵی ١٣٦٢ی هەتاویی تاران.

داریووش شایگان، ئایین و مەکتەبە فەلسەفییەکانی هیند، چاپی ساڵی ١٣٥٦ی هەتاویی تاران.

ئوپانیشد. راپۆرتی دارا شکۆ، چاپی ساڵی ١٣٥٦ی هەتاویی تاران.

Leo Oppenhem, Ancient Mesopotamia, U. S. 1972

A. A. Macdonell, Vedio Mythology, India 1963

Arthur Berridale Keith, The Religion and Philosophy of the Veda and Upanishads, England 1925, 2 vols.

An Advanced History of india, by (R. C. Majumda, H. C. Raychau and kalikinkar Datta; New York 1967.

## بەشی سێیەم

### ئایینە ئاسیاییەکان لەرۆمی پێش زایینندا
### پشکی یۆنان لە بیروباوەڕی ئاسیای رۆژئاوادا

هاوکات لەگەڵ هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئاسیا رۆژئاوا و ناوەندی و هەتا سنووری نێوان تورکمەنستان و دۆڵی سێند و هاتنی هێزی سەربازیی ئەسکەندەر بۆ میسر، قۆناغێکی نوێی تێکەڵبوونی فەرهەنگی لە رۆژئاوای ئاسیا و میسر دەستی پێکرد کە بە تێپەڕبوونی زەمەن فەرهەنگەکانی ئاسیای رۆژئاوا، مێسر، یۆنان و رۆمی لە یەکتر نزیک کردەوە. ئەم وەرچەرخانە فەرهەنگییە کە لەسەر بنەمای ئابووری، کۆمەڵایەتی و مێژوویی بوو، کارێگەرییەکی قووڵی لەسەر ئەورووپا دانا کە دواتر شارستانییەتی مەسیحی ـ ئەورووپایی لێکەوتەوە. بۆ تاوتوێ کردنی ئەم قۆناغە نوێیە کۆمەڵایەتی ـ فەرهەنگییە لە رۆژئاوای ئاسیا، میسر، یۆنان و ئیمپراتۆرییەتی رۆم، دەبێ ئاوڕ لە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی رۆمی و هەروەها ئاسیای رۆژئاوا و میسر، لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین، بدەینەوە. لەم تاوتوێ کردنەدا، سەرەتا دەپرژێینە سەر ناسینی یۆنان و رۆم و پاشان ئاوڕێک لە ئاسیای رۆژئاوا و میسر ئەدەینەوە.

وڵاتی یۆنان لە سەردەمی هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئاسیا، قۆناغێکی نوێی شارستانییەتی تێدا هاتبوو گۆڕێ کە هزری عەشیرەیی بۆ هزری ئینسانی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، دەیتوانی لە ئاستی جیهاندا بڵاو ببێتەوە، پێویستە ئەوەمان لەبیر بێت، بۆ ئەوەی هزرێک بتوانێ لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاو ببێتەوە بکات و سیمایەکی جیهانی بەخۆیەوە بگرێت، پێویستە پشت لە چوارچێوەی هزریی ناوچەیی، چینایەتی و نەتەوەیی خۆی بکات و بەهایەکی گشتی و تۆکمە بۆ رەگاژۆ کردن بەخۆیەوە گرتبێت. رەنگبێ چەند فاکتەرێکی فەرهەنگیی بچووکی عەشیرەییش تیایدا بەدی بکرێت، بەڵام لە وەها حاڵەتێکدا کاریگەرییەکانیشی زۆر بچووک دەبن. ئەو بیر و هزرانە

دەتوانن بەشێوەیەکی بەرین لە جیهاندا رەگازۆ بکەن و لەسەر ئەو بنەمایە ئینسان پەروەردە بکرێت کە شێوەیەکی ئوسوولی، گشتی و تۆکمەی بەخۆیەوە گرتبێت و لەگەڵ بیرو هزری دیکەدا مشتومڕ بکات. بیر و هزری یۆنانی لەو قۆناغەدا گەیشتبووە ئەو ئاستە، ئەوەش لە کاتێک دابوو کە دوو سەدە پێشتر، بیر و هزری یۆنانی و شێوەی ژیان کردنی یۆنانی تەنیا لەنێو یۆناندا باو بوو، تەنانەت زۆربەی یۆنانییەکانیش بە هاووڵاتیی یۆنانی ئەژمار نەدەکران. لە راستیدا چەمکی یۆنانی چەمکێکی چینایەتی بوو کە کۆیەلەکان تیایدا جێگەیان نەدەبووەوە.

ئامانجی ئەخلاقی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت زانستییەکانیش کەوتبووە ژێر رکێفی چینایەتی چینایەتی و کۆمەڵایەتییەوە کە ئەمەش هەموو کۆمەڵگەی یۆنانی لەخۆ نەدەگرت. هەتا ئەو کاتیش چەمکی ئینسان بوون، هەموو تاکەکانی یۆنانی نەدەگرتەوە، بەڵام پەرەگرتنی شارنشینی و پەرەگرتنی فەلسەفە لە دوو سەد ساڵ پێش لە هاتنی ئەسکەندەر، وەرچەرخانی هزریی لە یۆنان بەدوای خۆیدا هێنا. روونکردنەوەی سۆفستاییان لەسەدەی پێنجەمی زاییندا، تاکەکانی بەرەوڕووی کۆمەڵگە و یاسا دەکردەوە و باسی کێشەی چینایەتی و یاسایان هێنایە گۆڕێ کە بە چ شێوەیەک کێشەی چینایەتی یاسای داڕێژراوی یۆنانییەکانی لە بیروباوەڕی کۆنی خۆیان دوور خستووەتەوە. سووفستاییان سەرەڕای ئەمەش، لەو باوەڕەدا بوون کە یاسا ئەخلاقی و سیاسییەکان رێژەیین و راستییەکی بەرهەست بوونی نییە. یاسا و بۆچوونەکانیان بەگشتی لە رووی پارێزەوە بوو. لەلایەکی دیکەوە بیروباوەڕی ئەفلاتوون و سوقراگ لەسەر بنەمای خۆویستی داڕێژرابوون، خۆویستی نەیدەتوانی لە چوارچێوەی چینایەتی و عەشیرەییدا سنووردار بمێنێتەوە و بە ناچاری دەبوا سەرجەم مرۆڤایەتی لەخۆ بگرێت. سوقرات پێی وابوو هیچ کەس بەئەنقەست و لەرووی تێگەیشتنەوە تووشی سووچ و تاوان نابێت، بۆیە تەنیا زانست دەتوانێ

ئینسان بگەیەنێتە پلەی مەزنایەتی. پەیوەندیی نزیکی مەزنایەتی و زانست بە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەفلاتوون و سۆقرات دادەندرێت.

کلبیان بڕوایان بە پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی یاسای زاڵ بە سەر هەڵسوکەوتی ئینسانەکاندا بوو و بانگەشەیان بۆ ڕێز لەخۆ گرتن، گوێ خەواندن لە نەریتی کۆنی کۆمەڵگە وکوو نیشتمانپەروەری و خۆ بواردن لە هەر جۆرە پێش داوەرییەک، دەکرد.

لەم نێوانەدا لێک هەڵوەشانەوەی شارە دێرینەکانی یۆنانی و لەدەست چوونی سەربەخۆیی دەرەکی، نەتەوەخوازییەکی بەرتەسکی دەوڵەت — دەوڵەتشارەکانی بەرەو لاوازی برد و چەمکێکی گشتگیرتری ئینسانی جێگیر کرد.

لە سەردەمی ئەسکەندەر، چەمکی فەرهەنگیی هێلێن بە مانای فەرهەنگی یۆنانی نەبوو، تەنانەت دەکرا بێگانەیەکیش بە هێلێنی ڕاستەقینە لەقەڵەم بدرێت. ڕێزگرتن لە ئاوز وەک باشترین هێزی ئینسان، بووە هۆی ئەوە کە فاکتەری ڕەگەزی و چینایەتی وەک پێوەری ئینسان بوون وەلا بندرێت و هەر کەس ئاوەزمەندانە و ئینسانی بیر بکاتەوە و تەنانەت ئەگەر یۆنانیش نەبێت، بە هێلێن ناودێر بکرێت. دوایین هەوڵێک کە لەو پێناوەدا، درا کاتێک بوو کە رواقییەکان، پاش ماوەیەک ڕایانگەیاند، ئازادی شتێکی دەروونییە کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێگەی ڕواڵەتیی ئینسانەکان لە کۆمەڵگەدا نییە. تەنانەت دەکرێ کۆیلەکانیش لە دەروونی خۆیاندا ئازادی بەدی بکەن، بە مەرجێک کە بۆ خۆی لە ئاوەز و تێگەیشتن بەهرەمەند بووبێت و هاوکات دەکرێ کۆیلەیی لە ناتێگەیشتوویشدا بەدی بکرێت کە هیچ بەهرەیەک لە ئاوەز و تێگەشتن بردبێت. بەم پێیە رواقییەکان بانگەشەیان بۆ ئایینێک دەکرد کە ئاوز و تێگەیشتنی ئینسان جێگەی مادیاتی دەگرتەوە، چونکە ئینسانی خۆویست و ئاوەزمەند، بەدەر لە هۆز و عەشیرە، بەدەر لە سیستەمی چینایەتی و پێگەی کۆمەڵایەتی، دەکرا بە بەشێک لەو کۆمەڵگەیە ئەژمار بکرێت. لەو کۆمەڵگەیەدا، ئینسان گرێدراوی شار و دەوڵەت نەبوو، و ئینسان واتایەکی

جیهانی هەبوو و ئەگەری ئەوە هەبوو کە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە هەموو جیهان بە شارێک وەسف بکات کە تیایدا جیاوازی نەبێت کە ئەم دەربازبوونە دەروونییە بەوپەڕی گەشە سەندنی هزریی تاکێک ئەژمار دەکرێت. رواقییان لەو باوەڕەدا بوون کە لۆگووس بەتەنیا ناتوانێ هاوئاهەنگی لە نێوان ئینسان و جیهاندا دروست بکات. لووتکەی ئەو جۆرە جیهانبینییە کە تیایدا هەموو جیهان بە شارێک دادەندرا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمدا بوو کە هەموو هۆزەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری، چ رۆمی، چ یۆنانی و چ ئاسیایی یان ئافرقایی، سەرجەمیان مافی بەرانبەریان هەبوو، بەهەر حاڵ لە سەردەمی ئەسکەندەریشدا فەرهەنگی یۆنانی لەم چەمکە تێگەییبوو و پەیڕەی لێ دەکرد، بەتایبەت، ئەو ئاشتی و یەکبوونەی کە ئەسکەندەر لە نێوان ئاسیا و ئەورووپادا خوازیاری بوو، بۆ هەمان ئەو جۆرە تێگەیشتن و تێڕوانین دەگەڕایەوە. دەکرێ ناوی هێلێنیسم بۆ ئەم چەمکە دیاری بکرێت. کاتێک زۆربەی وڵاتانی ئاسیایی و میسری کەوتنە ژێر دەستی ئەسکەندەر و دواتر جێنشینەکانی لە ئاسیا، سلووکییەکان لە ئەفریقا – بتلمیووسییەکان تیایدا دەسەڵەتدار بوون، پەیوەندییان لەگەڵ وڵاتی یۆنان پچڕا، بەڵام هێلێنیسم لە نێو بیروباوەڕی خەڵکی ئەو ناوچانەدا مایەوە. ئەو یۆنانییانەی کە روویان لە ئاسیا و ئەفریقا کردبوو، لەگەڵ خەڵکی خۆجێیی ئەو ناوچانە تێکەڵ بوون و هیچ زەختێک لەسەر خەڵکی خۆجێیی لە ئارادا نەبوو. بۆ نموونە هاوسەرگیریی ئەسکەندەور و دە هەزار کەس لە ئەندامانی سوپاکەی لەگەڵ کچانی ئێرانی. بەکار هێنانی زمانی یۆنانی وەک زمانی زانست، ئەدەب و سیاسەت بە یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییە گشتییەکانی مەکتەبی هێلێنیسم دادەندرا.

لەم سەردەمەدا ناوەندگەراییەک لەگۆڕێدا نەبوو. هەر ناوچەیەکی وەکوو سووریە، میسر و بەشی رۆژهەڵاتی پێدەشتەکانی ئێران (حکومەتی یۆنانیی بەڵخی) بۆ خۆی ببووە ناوەندێکی فەرهەنگی کە تیایدا فەرهەنگی کۆنی خۆجێیی لەگەڵ مەکتەبی هێلێنیسم کۆمەڵەیەکی فەرهەنگییان دروست

کردبوو. شارەکانی ئەسکەندەرییە لە نزیک چۆمی نیل و شاری ئەنتاکیەی سووریە بە دوو ناوەندی مەزنی هێلێنسم لە ئاسیا و باکووری ئەفریقا ئەژمار دەکران و بە تێپەڕبوونی زەمەن شارەکانی ئاسیای بچووک و سووریە بە کەوتنە ژێر کاریگەری و تایبەتمەندیی شارە یۆنانییەکان، رەنگی شاری یۆنانییەکانیان بە خۆیانەوە گرت. بە دڵنیاییەوە حکوومەتەکانی سلووکی و بتلمیووسی، کە مەکتەبی هێلێنیسم تیایاندا جێگیر ببوو، یارمەتییەکی یەکجار زۆریان بە وەرچەرخانی فەرهەنگی لە ئاسیا و میسر گەیاند. ئەم وەرچەرخانە هێلێنییە تەنانەت لەنێو خۆی یۆنانیشدا بەرچاو دەکەوێت. پاش سەردەمی ئەرەستوو، کەسێک بەناوی زنوون کە بۆ خۆی خەڵکی فینیقیەی دوورگەی قۆبرێسی تورکیا بوو، فێری زمانی یۆنانی ببوو و لە ئاتن وانەی دەوتەوە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی باشی بەدەست هێنابوو، ئەو ئاوێتە بوونی فەرهەنگییە هەتا رادەیەک قووڵ ببوویەوە کە لە وڵاتانی ئاسیای و میسردا کە دەیان بیرمەندی مەزن بە ناوگەلی یۆنانییەوە کە پێدەچێ خاوەن رچەڵەکی خۆجێیی بووبێتن، سەریان هەڵدا .

ورده ورده کۆمەڵێک فەرهەنگی نوێ بۆ نێو رێبازی هێلێنی و ئەدەبیاتێک کە لەزمانی یۆنانی پێکهاتبوو، رەگازۆی کرد و تیایاندا رەنگیدایەوە. ئەم وەرچەرخانە نوێیە کە هیندێکیان بۆ سەدەی دووەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، لە قۆناغی پاش لە دایکبوونی مەسیحدگەشەی کرد و بڵاو بووەوە، بەڵام هەتا سەدەی سێیەمیش بیروباوەڕی هێلێنی لەئاسیای رۆژئاوا بەرچاو دەکەوێت.

دواتر لەئاسیای رۆژئاوا و میسر، لە سەردەمی رێبازی هێلێنیدا، وەرچەرخانێک بەرەو ئایین دروست بوو کە لە پلەی یەکەمدا مەسەلەی رۆحیی ئینسان و لە پلەی دووەمیشدا پرسی نەتەوەیی، زمانی و ناوچەیی هاتە گۆڕێ. پەیڕەوانی ئەو رێبازە ئایینییە لەهەوڵی ئەوەدابوون لەسەر بنەمای هەمان فەرهەنگی هێلێنی بیروباوەڕەکەی خۆیان بچەسپێنن و لەم نێوانەدا هەم ئایینی گنووسی و هەمیش ئایینی مەسیحی کەڵکیان لە فەلسەفەی یۆنانی وەردەگرت، بەڵام خودی مەکتەبی هێلێنی لە قاڵبی

فەلسەفییەوە بەرەو لای مەسەلەی ئایینی وەرچەرخانی بەسەردا هات و لە بیروباوەڕی ئاسیای رۆژئاوا نزیک بوویەوە.

بۆچوونەکانی فلووتین یەکێک لەو مەکتەبە هزرییانە بوو کە مەکتەبی نوێی ئەفلاتونیی لێکەوتەوە و بووە خاوەن مەکتەب یان بنەمای بیروباوەڕی تایبەتیی خۆی. فەرهەنگی هێلێنیسم لەو سەردەمەدا بڵاو بوونەوە و سنووردار بوونەوەیەکی تایبەتی بەخۆیەوە بینی. تێکڕای ئەم ئایینانە و هەروەها بیروباوەڕی رۆژهەڵاتی کەڵکیان لە بیروباوەڕی هێلێنیسم وەرگرت و هاوکات هێلێنیسمیش لە قاڵبی کۆنی خۆیدا سنووردار مایەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە سەرجەم باسە ئایینەکان لە چوارچێوەی ئەدەبیات و زمانی یۆنانیدا دەهاتنە گۆڕێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە بە گشتی کەنیسەی مەسیحیی رۆژهەڵات لە قاڵبی یۆنانی خۆیدا بەدەست لێنەدراوی مایەوەو لەگەڵ ئەوەی کە بیروباوەڕی هێلێنی کەمرەنگبووەوە، دەوڵەتی بیزانس کە لە بنەڕەتەوە یۆنانی بوو، جێگەی دەوڵەتی هێلێنی گرتەوە.

تەنیا ئایینی ئیسلام بوو کە کاریگەرییەکانی فەرهەنگی هێلێنیی لە میسر، سووریە و فەلەستین لەناو ببات، و سەرئەنجام عوسمانییەکان بە کۆنترۆڵ کردن و زاڵبوون بەسەر قوستەنتینییە (ئەستەمبوڵی ئێستا) لە ساڵی ١٤٥٠ی زایینیدا کۆتایی بە رێبازی هێلێنیسم هێنا، بەڵام فەلسەفە و زانستی ئیسلامی بۆ خۆی لەژێر کاریگەریی قووڵی فەرهەنگی هێلێنیسمدا بوو.

### فەرهەنگی یۆنانی بەسەر چوار قۆناغدا تێدەپەڕێت:

١. قۆناغی بەرلە ئەسکەندەر کە قۆناغی فەرهەنگی نەتەوەیی بوو (هەتا ٣٠٠ ساڵ پێش زایین).

٢. پاش ئەسکەندەر، هێلینیسم وەک فەرهەنگێکی جیهانی غەیری ئایینی دادەندرا.

٣. دوایین هێلێنیسم، لە قاڵبی فەرهەنگێکی ئایینی و فرە خواوەندیدا.

٤. شارستانییەتی بیزانس، لە قاڵبی فەرهەنگی یۆنانی ـ مەسیحیدا.

قۆناغی یەکەم کە بێ ئەملاولا بە یۆنانی ئەژمار دەکرێت و پەیوەندی بە ئاڵووگۆڕە ماددی و فەرهەنگییەکانی وڵاتی یۆنانەوە هەیە.

قۆنـاغی دووەم بنیـاتی بیروبـاوەڕی یۆنـانیی رازێنـەرەوەی دەقـە فەلسەفییەکانی یۆنانی، بەتایبەت مەکتەبی رواقـی بـووە، بـەڵام تێکـەڵبوونی لەگەڵ بیروباوەڕی رۆژهەڵاتی بە روونی هەستی پێ دەکرێت. قۆناغی سێیەم وەرچەرخان بەرەو بیرۆکەی ئایینی شارستانییەتی کۆنی رۆژهەڵاتە کە لەگەڵ بنیاتی بیروباوەڕی یۆنانی ئاوێتەی یەکتر بوون.

ئەم وەرچەرخانە هزرییە کە بۆ ماوەی سێسەد سـاڵ لـە ئـارادا بـووە، لـە مێـژووی بیروبـاوەڕی ئایینیـدا گرینگـی و بایـەخێکی تایبـەتی هـەبووە کـە بەوهۆیەوە بزووتنەوەیەکی گرنگی وەک بزووتنەوەی گنووسـتیکی و مەکتـەبی نـوێی ئـەفلاتوونی سـەریان هەڵـداوە و هـەروەها ئیلاهیـاتی هێلێنیسـتی کاریگەرییەکی یەکجار قووڵی لەسەر بیروباوەڕ و شێوەی جیهـانبینیی ئـایینی مەسیحی و ئیسلامیدا هەبووە.

## پشکی ئاسیا لەوەرچەرخانی ئایینی

### لە ئاسیای رۆژئاوا

ئاسیای رۆژئاوا، لە دۆڵی سێندەوە هەتا دەریای رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا، گۆڕانکارییـەکی مـەزنی بەخۆیـەوە بینییـەوە. هەرچەند بناغەی ئەم گۆڕانکارییە لە هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە بەرچاو دەکەون، بەڵام لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا گشتگیر بوویەوە. لـەنیوەی یەکـەمی هـەزارەی یەکـەمی پـێش زاییـندا، ئایینـەکانی ئاسـیای رۆژئـاوا لـە چوارچێـوەی هۆزایـەتی و عەشـیرەتیدا مابوونـەوە. هەرچەنـد هینـدیک لـە ئایینـەکان بـەرەو یەکتاپەرسـتی هـەنگاویان نـابوو، بـەڵام ئـەم وەرچەرخانـە هێشـتا لـە چوارچێـوەی هۆزایەتیـدا قـەتیس ماوەتـەوە. داگیراکـاریی هـۆزە ئاشـووری و بابلییـەکان لـەنیوەی یەکـەمی ئـەو هەزارەیـەدا و لـەناو بردنـی

سەربەخۆیی و ئەو هۆزانەی کە بۆ سەربەخۆیی و بەختەوەریی خۆیان منەتباری خواوەندی هۆزەکانی خۆیان بوون و هۆزەکەی خۆیان بە هۆزێکی نموونە و بێ وێنە لە قەڵەم ئەدا، کە لاوازیی بنیاتی بیروباوەڕی هۆز و ئایینەکانی بەدواوە بوو. بۆ نموونە جوولەکەکان کە خۆیان بە هەڵبژاردەترین هۆزی دەستنیشانکراوی خواوەند لە قەڵەم ئەدا، بوونە کۆیلەی بابلییەکان و خواوەندیش بۆ ئەوەی رزگاریان بکات، کوروشی پارسیی کردە مەسیحی خۆی. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە عیسای مەسیح لەنێو هۆزی جوولەکەدا سەرهەڵئەدات و باس لە خواوەندێکی جیهانی دەکات. لە راستیدا کۆمەڵگەی مرۆیی دەتوانن تەنیا بەپێی تێگەیشتنی خۆیان هەست بە بوونی خواوەند بکەن و ئەو تێگەیشتنەش تەنیا بەهۆی کەڵەکەکردنی ئەزموونەکانی ژیان دەستەبەر دەبێت و ئەو کەسانەش جگە لەپێغەمبەرەکان کەسیدیکە نین کە ئەو وەرچەرخانە هزرییەیان تێدا بەدیهاتووە.

بە هەر حاڵ، لەنیوەی هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە، گۆڕانێکی قووڵ لەبارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئاسیای رۆژئاوادا پێکهات و لەدۆڵی سێندەوە هەتا دەریای رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و میسر لەژێر دەسەڵاتدارێتیی هەخامەنشییەکاندا دەوڵەتێکی یەکانگیر دامەزرا. ئەم یەکبوون و ئاوەدانکردنەوەیە کە پاش کاولکاریی چەند سەد ساڵەی ئاشووری و بابلییەکان هاتبوویە ئاراوە، ئاماژەی بە چەشنیک یەکیەتیی مرۆڤایەتیی پێشکەوتووتر لە بیروباوەڕی عەشیرەتی و هۆزایەتی دەکرد. هەخامەنشییەکان هیچ هەوڵێکیان بۆ سەپاندنی ئایینەکەی خۆیان بەسەر خەڵکدا، نەدا، بەڵکوو ئازادیی تەواو بۆ هەموو ئایینەکان لە ئارادا بووە، بەڵام بەهۆی ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئینسانییانەوە و هەروەها هاتنە ئارای ئیمکانی پەیوەندی گرتنی بەربڵاو لە نێوان هۆزە جۆراوجۆرەکاندا، کۆمەڵێک بیروباوەڕ هاتنە گۆڕی و گشتگیر بوونەوە و بناغەیەکی بەهێزی بۆ ئایینە جیهانییەکان دامەزراند.

ئەو ڕێسا نوێیانەی کە گشتگیربوونەوە بەم شێوەیەبوو:

١. یەکتاپەرستی، خواوەندی مەزن تایبەت بە هۆزێکی دیاریکراو نییە و تەنیا ئەوە کە هەموو جیهانی ئافراندووە و ئینسانەکان لەلای ئەو هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکتردا نییە.

٢. ئەستێرەناسی: هەسارەکان ڕواڵەتی خواوەندەکانیان بەخۆیانەوە گرتووە و یاسای ئەستێرە ناسی لە دیاریکردنی چارەنووسی ئینساندا ڕۆڵێکی مەزنی هەبووە.

٣. هەبوونی خێر و شەڕ، خێر سیمبولی خواوەندەو شەڕیش سیمبولی شەیتانە.

٤. سزای قیامەت بەپێی ئەو خێر و شەڕانەی کە ئینسان لەماوەی ژیانی خۆیدا کردوویەتی، بۆی لەبەر چاو دەگیرێت.

بۆ ناسینی بنەمای سەرەکی، باشتر وایە ئاوڕ لە ئایینی جوولەکە دوور خراوەکان بۆ بابل و گۆڕانکارییەکانی ئەو ئایینە بدەینەوە. دوور خرانەوەی جوولەکەکان بۆ بابل بووە هۆی ئەوە کە ئەو ئایینە بە شێوەیەکی بەرچاو لە بنەڕەتی کۆنی هۆزایەتیی خۆی بێتە دەرێ و لەگەڵ ئایینەکانی دیکە بەراوردی بکەن و ئاکامی ئەو ئاڵووگۆڕانە کە بەهۆی بەراورد کردن و هەڵسەنگاندنی پەیتڕەوانی ئایینی جەلەکە لە گەڵ ئایینەکانی دیکە هاتبووە گۆڕێ، لە چاخی عەتیق (دەق و نووسراوەکانی پێش مەسیح)دا بەرچاو دەکەوێت کە بەشێک لە بەشی دووەمی ئەشعیای نەبی وەک نموونە دێنینەوە: " ئەو ئامۆژگارییانەی کە بۆ ئەشعیای کوڕی ئامووس سەبارەت بە هۆزی جولەکە و ئورشەلیم هاتە خوارەوە، ئەوە بوو کە لە دوایین ڕۆژەکانی جیهاندا دەبیندرێت کە ماڵی خواوەند لەسەر لووتکەی چیاکان ئاوەدان دەبێت و سەرجەم هۆز و عەشیرەکان بەرەو لای ئەو دەڕۆن و لەوێ بانگ دەکەن کە ئێوەش وەرن بۆ سەر چیای خواوەند کە هەموومان بەرەو ماڵی یەعقوب بچین کە ڕێگەکانی نیشان ئێمە داوە، و بەو ڕێگەیانەدا هەنگاو دەنێین، چونکە ڕێگەی خواناسی لە ئامۆژگارییەکانی خواوەندەوە لە ئورشەلیم دێنە

گۆڕێ و لەم نێوانەدا کەسانی شیاو حکوومەت دەکەن، دەیان هۆز تەمبێ دەکەن و ئەوانیش شمشێرەکان دەکەنە گای ئاسنی و نێزەکانیشیان دەکەنە مشار، شمشێرەکەی لەسەر هیچ هۆزێک هەڵناکێشت، جارێکی دیکە فێری شەڕ کردن نابێت."

هەر وەک بەرچاو دەکەوێت، خواوەندی جوولەکەکان، لەم دۆخە تازە خوڵقاوەدا بە خواوەندی هەموو مرۆڤایەتی ئەژمار دەکرێت. ئەگەر جووەکان لەئۆرشەلیم دەر بکرابان، ئەشعیای پێغەمبەر نەدەهاتە سەر ئەو باوەڕە نوێیەو خواوەندی جوولەکەکانی بەخواوەندی هەموو جیهان لەقەڵەم نەئەدا.

لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا جیا لە ئایینی جوو، دەکرێ باس لە ئایینی بابلییەکان بکرێت. ئەم ئایینە پێشتر ئایینی فەرمیی بابلییەکان بووە و حکوومەت پشتیوانی لێکردووە. لەگەڵ هاتنی هەخامەنشییەکان و دامەزرانی فەرمانڕەوایی نوێ، حکوومەت پشتیوانیی لە ئایینەکان نەدەکەرد و ئایینە جۆراوجۆرەکانیش کە لەئەنجامی پەیوەندیی بازرگانی، نیزامی و سیاسی لە سەرتاسەری فەرمانرەواییدا بڵاو ببوونەوە، بەرەوڕووی هۆزە جۆراوجۆرەکان بوویەوە و لەم نێوانەدا ئایینێک دەیتوانی بمێنێتەوە کە بانگەشە بۆ مەزنترین بیروباوەڕە ئایینەکانی سەردەمی خۆی بکات. ئایینی بابلی کە لایەنگرێکی ئەوتۆی بۆ نەمابووەوە، گۆڕانکاریی بەسەر خۆیدا هێنا. خواوەند واتایەکی مەزن و تاق و تەنیای پێ بەخشرا، واتایەک کە پێشتر بەو شێوەیە نەبوو و بەتێپەڕبوونی زەمەن لە سەردەمی هێلێنیسمدا لە ئاسیای رۆژئاوا، سەرجەم توخمەکانی هێلێنیستی و ئاسیایی تیایدا رەنگیدایەوە و نەتەنیا بەرەو یەکتاپەرستی هەنگاوینا، بەڵکو ئەستێرەناسیی دێرینیش بەشێوەی زانستی ئەستێرەناسی تیایدا رەنگیدایەوەو تەنانەت هێلێنیسم لەو بوارەشدا پەرەیسەند.

ئایینی میترابیسم نموونەیەکیدیکەبوو کە سنووری نەتەوەکانی ئێرانی بەزاند و پەرەی بە کۆمەڵێک چەمکی تاک رەهەندی خێرو شەڕدا و ئایینی لەجیهاندا بەرجەستە و بێ هاوتا لەقەڵەمدا و ئەستێرەناسی و یاسای

ئەستێرەناسی تیایدا رەنگی دایەوەو بووە ئایینێک لەسەرتاسەری ئیمپراتۆریەتی رۆمدا وەربگیرێت و بەرەورووی پێشوازیی سەرجەم هۆزەکان ببێتەوە، ئەم وەرچەرخانە کاتێک هاتە ئاراوە کە ئایینی زەردەشت لەوڵاتی ئێران و لەسەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکاندا، لەژێر کاریگەریی چەندەها بیروباوەڕی کۆن و سەرەتاییدا مابووەوە و چەندین تاقمی زەردەشتی و زۆروانی بە نیوەچڵی سەرقاڵی چالاکی و بانگەشەبوون، تەنانەت هەر ئەو ئایینە خۆجێییەی ئێرانییەکان، کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا وەک ئایینی فەرمی ناسرا، لە بەرەورووبوونەوە لەگەڵ ئایینی مەسیحی و مانەویدا، ناچار کرا بە پێچەوانەی قۆناغی ئاڤێستای نوێ، بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئایینی زۆروانی و ئەستێرەناسی و یاسای ئەستێرەناسی تیایدا رەنگ بداتەوە. لەم سەردەمەدا چەندین ئایین لەشێوەی نەریتییەوە بۆ قاڵبی ئایینێک گۆڕانیان بەسەردا هات کە زانسی تۆکمەی خواناسییان تێدا هەبوو. لەراستیدا ئەم ئایینانەی کە لەحاڵی وەرچەرخان و گۆڕانکاریدا بوون، بنەما نەریتییەکانی خۆیان لە قاڵبی نیزامێکی هزریی نوێدا دەخستەوەڕوو. فەلسەفەی یۆنانی کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر ئەم وەرچەرخان و گۆڕانە هەبوو، بەڵام رۆژهەڵات بۆ خۆی لەسەرویەندی وەرچەرخاندابوو .

فاکتەری دووەم ئەستێرەناسی بوو. لە سەردەمی ساسانی - رۆمیدا زانستی ئەستێرەناسی بە باشترین زانست ئەژمار دەکراو بە باشترین و بەنرخترین هونەر لەقەڵەم ئەدرا. بەرەبەرە لە سەردەمی ئەسکەندەرییە بەدواوە، ئەم بیروباوەڕە لەرۆژئاوای ئاسیا و دەوروبەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەرەیسەند کە بە یارمەتیی رۆیشتن و راوەستانی هەسارەکان و هەڵاتن و داچوونی ئەستێرەکان، هەموو شتێک پێشبینی دەکرا.

پێشتریش بە یارمەتیی هەڵفڕینی باڵندەکان، یان شێوەی دانڕشتن بۆ باڵندەکان، پێشبینیی رووداو و پاشهاتەکان کراوە. هەروەها پیاوە ئایینییەکانی یۆنانیش پێشگۆیی یەکجار گرنگیان کردووە. بەڵام لەو سەردەمەدا، زانستی ئەستێرەناسی بەشێوەی زانستێک هاتبووە گۆڕێ کە

کەڵکی لە ئەزموونی چەندین سەدەی رابردووی وەرگرتبوو. بەپێی ئەو زانستە هاتنە ئارای هەر رووداوێک لەژیانی ئینساندا شیاوی پێشبینیکردنبوو، لەو سەردەمەدا ئەوەندە سەرنجڕاکێش و نوێ بوو کە هیچ ئایینێک لە ئاسیای رۆژئاوا، بە پێشکەوتووتر لەو ئایینە ئەژمار نەدەکرا.

زانستی ئەستێرەناسی لە ناوچەی میزۆپۆتامیا گەشەی کرد و سەردەمی فەرمانڕەوایی هەخامەنشییەکاندا تێکەڵ بە زانستی بیرکاری و ماتماتیکی میسری بوو، و بە شێوەیەکی فراوان پەرەی ستاند و لەنێو ئایینەکانی ئاسیای رۆژئاوادا جێگەی خۆی کردەوە و لەگەڵ ئەو ئایینانە گەیشتە رۆم و بەو هۆیەوە زانستی ئەستێرەناسیی یۆنان سەرلەنوێ بووژانەوەی دەست پێکردەوە. تەنانەت زانستی ئەستێرەناسی لەنێو ئایینی مەسیحی و ئیسلامدا وەک راستییەکی بێ ئەملاوئەولا چاوی لێکراوە.

فاکتەری سێیەم لە بیروباوەڕی ئایینیی ئاسیای رۆژئاوادا، دووفاقەیی (دوالیزم)ی ئێرانیی خێر و شەڕ بوو. لە بیروباوەڕی کۆنی ئاسیای رۆژئاوادا، هەبوونی دوو تاقمی خواوەندی خێر و شەڕ باو بووە، و لەنێو ئەم هۆزانەدا ئەم بیروباوەڕە لە گۆڕێدا بووە کە باوکی یەکەم یان دێو – باوک / دایکی یەکەمی دوو تاقمی خواوەندی خێر و شەڕ لە داوێنی خواوەند کەوتوونەتەوە. یەکەم جار ئەم چەمکانە لە ئایینی مەزدایی ئێرانی دایە کە ئەو چەمکە سەرەتایی و چەند فاقەییانە بۆ چەمکێکی نوێو تاقانە گۆڕانیان بەسەردا هات. لە گاتاکانی زەردەشتدا، دوو هێزی خێر و شەر ـ ئەشە (=راستی) و درۆ ـ سەرتاسەری جیهانیان تەنی کە سپەنتامینوو هێمای راستی و ئەهریمەن هێمای درۆ کردن، یەکەمین هێمای ئەو دوو هێزە بوون، بەڵام ئەو دوو هێزە هەردووکیان لە داوێنێک کەوتوونەتەوەو لە ئافراندنی ئوورمەزدیدا بوونیان هەیەو ئوورمەزدیش ئەهریمەن لەخۆی دوور دەخاتەوە.

لە قۆناغی ئاڤێستای نوێدا، ئوورمەزد لەگەڵ سپەنتامینو یەک دەگرن و ئەهریمەن لە هەمبەریاندا وەک هێمای شەڕ و خراپەکاری رادەوەستێ. کاریگەرییەکانی ئەم دوو هێزە لەنێو تاقمە گنووسی و ئایینەکانی ئاسیای

ڕۆژئاوادا بەرچاو دەکەون. لەنێو هیندێک لە ئایینەکاندا خواوەند بە یەکانە خوڵقێنەر دادەندرێت، و شەیتان یان هێمای شەڕ، کە مەخلووقی خۆیەتی، بە دژی ئەو خواوەندە ڕاپەڕینێک دەست پێ دەکەن، یان دوو جیهانی مادە و ڕۆح و خێر و شەڕ بوونی هەیە کە لەسەر یەکیان خواوەند و لەسەر ئەوی دیکەشیان شەیتان فەرمانڕەوایی دەکات (هاوچەشنی ئاڤێستای نوێ).

کاریگەریی ئەم جۆرە بیروباوەڕە ئێرانییە لەسەر جووەکان، بیروباوەڕی گنووسی و ڕێبازی نوێی ئەفلاتوون دەبیندرێت. هەروەها لە میترابییسمیشدا ئەم شێوە بیرکردنەوە ئێرانییە بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت. باوەڕمەندبوون بەپاداشتکردن و سزادانی دوای مەرگ لەسەر بنەمای خێر و شەڕ لەماوەی ژیاندا، بە دوایین قۆناغ دادەندرێت کە لەو سەردەمەداو لەبیروباوەڕی ئایینیی ئاسیای ڕۆژئاوادا گشتگیر بووەوە.

لە ئایینەکانی پێشتریشدا باوەڕیان بە زیندووبوونەوەی پاش مەرگ هەبووەو تەنانەت بەهەشت و جەهەنەم لەبیروباوەڕەکانیاندا بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە هیچ کام لەئایینەکاندا ژیانی پاش مەرگ پەیوەندیی بە خێر و شەڕی ئینسان لە ماوەی ژیانیدا نەبووە. لەمیسر کە بەشێوەیەکی یەکجار بەهێز باوەڕیان بەژیانی پاش مەرگ هەبووەو بەختەوەریی پاش مەرگ ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەڕاپەڕاندنی دروستی ئەرکە ئایینییەکان و خوێندنەوەی سروودە ئایینییەکانەوە هەبووە. تەنانەت دروست خوێندنەوەی ئەو سروودانە لەلایەن نزیکانی مردووەکەشەوە دەبووە هۆی بەختەوەریی کەسە مردووەکە لە قیامەتدا. ئەو شێوە بیروباوەڕە تەنانەت هەتا ئێستاش لە زۆربەی ئایینەکاندا بەرچاو دەکەوێت. لەهەمان کاتدا زەردەشت بەختەوەریی ئینسان بە بەرەوڕوو بوونەوەی ئینسان لەگەڵ هێزەی شەڕ و ناپاکی لە قەڵەم ئەدا و پێیوایە کە جەحەنەم شوێنی کەسانێکە کە لەماوەی ژیانیاندا زیاتر لە قاڵبی شەڕدا ژیاون.

کامڵبوونی هزر و تێگەیشتنی ئینسان لەنیوەی دووەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا، کەڵەکەبوونی ئاگایی و زانیاری و باوەڕە مەزنەکانی ئینسان

لەمەڕ ناسینی دروست و وردی ژیان، ئافرێنەر و ئافراندن، بواری بۆ چوونە نێو قۆناغێکی نوێی ئایینی، کە بەتەواوەتی لەگەڵ ئایینی چەند فاقەیی پێشتر جیاوازی هەبوو، خۆش کرد. مەسیحییەت باس لەهاتنی ئەو ئایینە دەکات و ئایینی ئیسلام بە دوایین رەوتی کامڵبوونی ئەو رەوتە ئایینییە لە قەڵەم ئەدات.

لەم بەشەدا، گۆڕانکاریی نێوان چوار ئایینی ئاسیای بچووک، سووریە، میسر و ئێران و ئەو کاریگەرییانەی کە لەسەر بیروباوەڕی ئایینی ئیمپراتۆریەتی رۆم هەیبوو، تاوتوێ دەکەین.

## رۆم و رۆژهەڵات

هەتا ئێستاش زۆر کەس لە ئەورووپا لەو باوەڕەدان کە گەورەیی و مەزنایەتیی رۆم، ئەنجامی ئاوێتەبوونی زانایی و لێوەشاوەیی یۆنانییەکان و رۆمییەکان لەگەڵ یەکتردا بووە و هەروەها دارمانی رۆمیش لە ئەنجامی کارتێکەریی فەرهەنگیی رۆژهەڵات لەسەر رۆم و ئیرادەی ئیمپراتۆریەتی رۆم بووە. ئەو کەسانە دواکەوتوویی هەنووکەیی ئاسیای رۆژئاوا لە کاروانی شارستانییەت بە دیاردەیەکی هەتاهەتایی چاو لێدەکەن و پێیانوایە کە ئەم ناوچەیەی ئاسیا لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە، لە وەها حاڵەتێکدا بووە.

لەراستیدا پێویستە بگوترێت رۆم تەنیا لە یەک بوارەوە هێزی ئیمپراتۆریەتی دابین دەکرد، کە ئەویش هێزی نیزامی بوو، کە بۆ پاراستنی ئاسایشی نێوخۆیی و پارێزگاریکردن لە سنوورەکان لەهەمبەر دوژمناندا بوو. سەرجەمی هێزی نیزامیی ئەو سوپایە، خەڵکی ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی بوون و خەڵکیدیکە لەو سوپایەدا بەشدار نەبوون. بە جەرگترین یەکەی سەربازیی ئیمپراتۆری ،کە لە کەنار ئاوەکانی چۆمی راین و دانووب جێگیر ببوون، یەکە سەربازییەکانی رۆم بوون. رۆمییەکان بە رادەیەک بەهێز ببوون کە ئیمپراتۆرییەت تەنیا لەسەر دەستی ئەوان دادەمەزرا، بەڵام ئیمپراتۆرییەت

نەیدەتوانی بەتەنیا پشت بەهێزی نیزامی ببەستێت. بۆیە هاوکات پشتی بە بەرهەم هێنانی وەرزێڕی و سەنعەتی ، توانایی تەکنیکی و ئافراندنی بەرهەمی هونەری و پاشەکەوت کردنی سامان و دارایی مەزن بەست، کە سەرجەمی ئەمانە بەرهەمی ماندووبوون، لێهاتوویی و لێوەشاوەیی خەڵکی میسر و ئاسیای رۆژئاوا بوو.

لە سەردەمانێکی یەکجار زووتردا، شارستانییەت لە رۆژهەڵات سەری هەڵدابوو، هاوکات زانست و تێگەیشتوویی پێشینەیەکی یەکجار دوور و درێژتری بە بەراورد لەگەڵ رۆم هەبووە. کاتێک کە کۆنستانتین لە ساڵی ٣٢٠ی زایینیدا، فەرمانڕەوایی بیزانسی لە یۆنان، ئاسیای بچووک، سووریا و میسر دامەزراند، بە ئاشکرا لە ئیمپراتۆریی رۆمی رۆژهەڵاتدا کەڵکی لە پێکهاتەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیی رۆژهەڵات وەرگرت، ئەوەش لە حاڵێکدا بوو کە مێژووی شارستانییەتی میزۆپۆتامیا و دامەزرانی یەکەم فەرمانڕەوایی بۆ ٢٨٠٠ ساڵ پێش زایین دەگەڕایەوە.

لەو سەردەمەدا، یۆنان ناو و ناوبانگی نەمابوو و بە کەڵکی نۆژەن کردنەوە نەدەهات، هەژاری باڵی بەسەردا کێشابوو، بەڵام ئاشتی و هێمنی لە ئاسیای بچووک، سووریە و میسر لە ئارادا بوو، خەڵک سەرقاڵی بەرهەم هێنان بوون و هەناردەی وڵاتانی رۆم، ئیتالیا، و یۆنان و وڵاتانی دیکەی ئەورووپایی و هەروەها هیند، ئێران و چینیان دەکرد.

ئەم پەرە گرتنە بەهێزە ئابوورییە لە ئاسیای رۆژئاوا و میسر بەرەو بزاڤی فەرهەنگی و هزری هەنگاوینا. رۆژهەڵاتییەکان لە هەموو بوارێکدا جیا لە بواری سەربازی، لە رۆمییەکان پێشکەوتووتربوون، تەنانەت رۆمییەکان بۆ خۆیان دانیان بەو پێشکەوتنەدا دەنا. سێزارییەکان لەژێر کاریگەریی رۆژهەڵاتییەکاندا لە سیستمی کۆماری دڵسارد ببوونەوەو بەچاولێکەریی ساسانییەکان و نەریتی رۆژهەڵاتی، خوازیاری دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەت بوون. ئانتۆنی قۆڵی لێهەڵکرد و لەبەرەبەری سەرکەوتندابوو کە شکستی خوارد (٣١ ساڵ پێش زایین). نیرۆن پێی وابوو کە دەتوانێ شاری

ئەسکەندەرییە کە گەورەترین شاری ئیمپراتۆرییەت بوو، وەک پایتەخت دیاری بکات. رۆم بە پشتبەستن بە سووپاکەی لەو پەڕی بەهێزی مابووەوە، بەڵام لە هەمبەر هزر، ئەخلاق و داب و نەریتی رۆژهەڵاتیدا چۆکی دادابوو. هاوکات رۆژهەڵاتییەکان شکستیان خوارد و سەرئەنجام ملکەچی رۆم بوون.

مێژووی رۆم لە سێ سەدەی یەکەمی زایینیدا، مێژووی کارتێکەریی ئاشتەوایی رۆژهەڵات، لەسەر رۆژئاوایە. دابونەریتی رۆژهەڵاتی، لەدامەزراوەکانی رۆمدا، پەیڕەویی لێدەکرا. پێکهاتەی دەوڵەت لە سەردەمی ئاگوستووس (٢٧ی پێش زایین) گۆڕانی بەسەردا هات و مێژووی سیستەمی کۆماری بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت و سیستەمی ئیمپراتۆرییەت لەسەروبەندی هاتنەگۆڕێدابوو.

لەسەردەمی سیستەمی کۆماریدا، زۆربەی ناوچەکانی رۆم لە هەموو بوارێکەوە سەربەخۆ بوون و حکوومەتی رۆم کەمترین دەستێوەردانی لە کاروبارییاندا دەکرد. تەنانەت خەرج و پیتاکیش هێزە حکوومەتییەکان کۆیان دەکردەوە. رۆم فەرمانڕەوایی دەکرد، بەڵام لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام لە سەردەمی ئاگوستووس بەملاوە حکومەت، هاوشێوەی رۆژهەڵات، بەرەو ناوەندگەرایی گۆڕانی بەسەرداهات و ئیمپراتۆر وەکو دەسەڵاتدارێکی رەها فەرمانڕەوایی دەکرد و هاوکات وەک خواوەندێکیش ستایش دەکرا. دیوەخانێکی مەزن پێکهاتبوو، شارەکان سەربەخۆیی بەڕێوەبردنیان لەدەستداو کوێخایەکی دەستنیشانکراوی ئیمپراتۆر دەسەڵاتی بە دەستەوە دەگرت، فەرمانڕەوا چەندین موڵک و زەویی بەرفراوانی هەبوو، وەرزێرەکان ملکەچی زەوییەکان ببوون. زۆربەی نیزامییەکانی سووپا لە سیخوڕ و بەکرێگیراوان پێکهاتبوو. سەردار و کوێخاکان دەسەڵاتی رەهایان هەبوو. رۆم لەژێر کاریگەریی میسردا بوو. ئاگستووس هاوشێوەی ئەسکەندەرییەی بتلمیووسەکان، شاری رۆمی دابەش کرد. نیزامی باج وەرگرتن لاسایی کردنەوەی سیستەمی رۆژهەڵات بوو. سیستەمی کشتوکاڵی لەسەر بنەمای کار کردنی کۆیلەکانی رۆژهەڵات

داڕێژرابوو. کاری ئەو مووچە و مەزرایانە هاوشێوەی ڕۆژهەڵاتییەکان، لەژێر دەسەڵاتی کوێخا و دەرەبەگەکاندا بوو.

ڕۆم کۆمەڵێک یاسای داڕشت کە دواتر سەرجەم وڵاتان لەسەر بنەمای ئەو یاسایە، یاساکانی خۆیان بنیات نا. لێکۆڵینەوەکان دەریدەخەن کە ڕۆژهەڵاتییەکان لە سەردەمانی دێرینەوە خاوەنی یاسا و ڕێسا بوون و تەنانەت کۆمەڵێک یاسای سەردەمی هەخامەنشییەکان لەژێر ناوی "دادشاه"دا مابوونەوە، کە لەنێویاندا یاساکانی حامورابی بە ناسراوترینی ئەو یاسایانە ئەژمار دەکرێت. تەنانەت زۆربەی مافناسانی ڕۆم، خەڵکی ڕۆژهەڵات و ئیمپراتۆرییەتەکانی ئاسیابوون. لەشاری بەیروت خوێندنگەی مافناسی لێبووە کە لەسەدەی پێنجەمی زاییندا بەباشترین و ناسراوترین خوێندنگەی مافناسی ئەژمار کراوە. ڕۆمییەکان گرنگییەکی ئەوتۆیان بە کاری لێکۆلینەوە نەداوە. ئەستێرەناسانی مەزن، ماتماتیکوان، فیزیکزان و تەنانەت زانایانی میتافیزیکیش ڕۆژهەڵاتی بوون. بتلمیووس و فلووتین خەڵکی میسر بوون. زۆربەی زاناکان خەڵکی سووریە و ئاسیا بوون. سەرجەم ڕشتەکانی خوێندن لەژێر تەئسیری قووڵی ڕۆژهەڵاتدا بوو. تەنانەت ئەدەبیات لەژێر دەستی ئەو ڕۆژهەڵاتییانەدا بوو کە خۆیان بە زمانی هێلێنی دەیاننووسی. سەرجەم مێژوونووسەکانیان خەڵکی ناوچەکانی ئاسیا بوون.

بەرەبەرە زمانە ئاسیاییەکانیش لە دژکردەوەیەکدا بە نیسبەت فەرهەنگی هێلێنیسم، چوونە قالبی زمانی ئەدەبییەوە. زمانی سریانیک ە بە لقێک لە ئارامیی کەونارا ئەژمار دەکرا، بووە زمانێکی ئەدەبی. زمانی قیبتی کە زمانێکی میسری بوو لەگەڵ زمانی ئەرمەنی بوونە زمانی ئەدەبی، تەنانەت مەسیحی و مانەوییەکانیش بە زاراوەی خۆیان بەرهەمە ئایینییەکانی خۆیان وەرگێڕا و دەیانووسینەوە.

هەنووکە ڕوون و ئاشکرایە کە هوونەری سەردەمی ئیمپراتۆری لەنێو خۆی وڵاتی ڕۆمدا لەژێر کاریگەریی قووڵی یۆنانی دێریندا بووەو ڕۆمی ڕۆژهەڵات لەسەر ڕێچکەی هونەری کۆنی خۆی ڕۆیشتووەو کاریگەریی ڕۆمی پێوە دیار نییە، بەڵام هەر لە وڵاتی ڕۆم کە سێزارییەکان دەیان بینای مەزنیان دروست

کرد، تەلارسازەکانیان بەگشتی خەڵکی ئاسیا بوون. بۆ نموونە تەلارسازی بەناوبانگی سەردەمی تراژان کەسێکی سووریایی بەناوی ئەپلۆدرووسی دیمەشقی بووە، کە چۆنییەتیی دروست ردنی گومبەز و شێوەی جوانکاریی نێو کۆشکەکانی لەگەڵ خۆیدا لە رۆژھەڵاتەوە بردبووە رۆم. لەو سەردەمەدا سەنعات و ھونەر تەواوکەری یەکتر بوون، جوانکاریی وێنەی سەر دیوارەکانی لە شێوەی ھونەرەکانی ئەسکەندەرییە و سووریە دەردە ھیندران. ھەموو زێڕ و زێوکاریی نێو کۆشکەکان لەسەر رێچکەی ھونەریی ئەسکەندەرییە بووە، ئەمانەش دەرخەری ئەوەن کە سەرەڕای کاریگەریی قووڵی ھونەری یۆنان لەسەر رۆم، ھاوکات ھونەری رۆژھەڵاتیش ھاوتەریب لەگەڵ ھونەری یۆنان کاریگەریی لەسەر ھونەری رۆم ھەبووە، بەڵام رەنگە لەھیچ بوارێکدا کاریگەریی رۆژھەڵات لەسەر رۆم ھاوشێوەی کاریگەرییە ئایینییەکان بەرچاو نەبێت. لەم پەیوەندییەدا، سەرئەنجام ئایینە رۆژھەڵاتییەکان ئایینی سەرەتایی یۆنانی – رۆمییان لەناو برد و لە پاش ھەموویان ئایینی مەسیحییەت بەسەر ئەورووپادا زاڵ بوو کە بۆ خۆی ئایینێکی ئاسیایی بوو. ئەم وەرچەرخانە لەوڵاتی رۆم، بەشێوەیەک جێگەی سەرنج و بایەخ بووە، کە سەرجەم نووسەر و مێژوونووسانی ئەو سەردەمە، شتیان لەسەر ئەو گۆڕان و وەرچەرخانە نووسیوە.

ئەم وەرچەرخانە ئایینییە بەرێکەوت نەبووە، بەڵکوودوابەدوای وەرچەرخانێکی گشتی لە قاڵبێکی یاساییدا ئەنجام درا و بواری بۆ کارتێکەریی فاکتەرە رۆژھەڵاتییەکان خۆش کرد. ھاوکات لەگەڵ ئەم وەرچەرخانە ھزری و بیروباوەڕییە، حکوومەتی لە کۆمارییەوە بۆ سیستەمی دەسەڵاتداریەتیی ئیلاھیی رۆژھەڵات گۆڕانی بەسەردا ھات و وەرچەرخانی ھونەر، وەرچەرخانی ویستی فەلسەفی، ھزریی بەدوای خۆیدا ھێنا. لەم پەیوەندییەدا پێویستە ئایینەکانی میسر، سووریە، ئاسیای بچووک و ئێران بەباشی روون بکرێنەوە کە بە چ شێوەیەک بتپەرستی و بیروباوەڕی فرە خواوەندی و ھۆزایەتیی ئەو وڵاتانە گۆڕانی بەسەردا دێت و لەگەڵ دۆخی نوێی ئیمپراتۆتیدا، خۆ دەگونجێنن.

**چەند زانیارییەك**
**سەبارەت رۆمی دێرین**

رۆم لە سەرەتادا (سەدەی شەشەمی زایینی)، لە کۆمەڵێک گوندی پێکەوەلکاو پێکهاتبوو و لەژێر گوشاری دەرەبەگەکانی ئەترۆسکیدا بوون. رۆمییەکان ٥١٠ ساڵ پێش زایین، ئەترۆسکەکانیان وەدەر نا و نیزامی کۆماریی خۆیان دامەزراند و بەرەبەرە پەرەیان پێدا. رۆمییەکان لە ٢٦٤ ساڵ پێش زاییندا، کۆنفێدراسیۆنێک پێکهێنا کە تیایدا هەموو ویلایەتاکان بەشدار بوون. سەدەیەک دواتر دەستیان بەسەر هەموو دەریای مەدیترانە و وڵاتانی دەوروبەری خۆیاندا گرت و لەژێر کاریگەریی بیروباوەڕی فەلسەفیی هێلێنیدا، تەنانەت لە رۆمیش ئەو باوەڕە هاتە گۆڕێ کە "کۆمەڵگەی مرۆیی یەکیان گرتووە."

لەساڵەکانی ٢٣٨ و ٢١٨ی زایینیدا دوو شەڕی گەورەیان لەگەڵ کارتاژ (قرتاجە = وڵاتی تونسی ئێستا)دا کرد. لەو شەڕانەدا هانیباڵ ژنێراڵی کارتاژییەکان شکستی خوارد و رۆم بەتەواوەتی بەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زاڵ بوو. رۆمییەکان لە ١٩٠ ساڵ پێش زاییندا هاتنە ئاسیا. لەرەهەندی یاساییەوە لە ٨٩ هەتا ٩٠ی زایینیدا هەموو خەڵکی رۆم مافی بەرانبەریان هەبوو و ساڵی ٢١٢ی زایینی، سەرجەم چین و توێژەکانی خەڵکی رۆم مافی بەرانبەریان هەبوو.

دوابەدوای شکستی ئانتۆنی و کلئۆپاترا بە دەستی ئەکتاڤین لە ٢١٢ی زایینیدا، سەردەمی سیستەمی کۆماری کۆتایی پێهات و ئەکتاڤین دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت و سەردەمی ئیمپراتۆرییەت دەستی پێکرد. ئەکتاڤین خۆی بە ئاگوستووس ناودێر کرد و گۆڕانی مەزنی بەسەر رۆمدا هێنا و یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆ سەقامگیریی رۆم.

لەو سەردەمەوە کە بە دەسپێکی سەردەمی ئیمپراتۆریەت دێتە ئاژمار، پەرەگرتنێکی فەرهەنگیی یەکجار مەزنی رۆژهەڵاتی لەرۆم دروست بوو. بەهۆی ئەو پەرەسوندنەوە حکومەتی سەرەڕۆی رۆژهەڵات دامەزرا. شاری

بیزانتیوم (بیزانس) ، قوستەنتەنییە (ئەستەمبوولی ئێستا)، ناودێـر کـرا و وەک پایتەختی رۆم دیاری کرا.

هۆزە ئەڵمانییەکان لە ٤٩٢ی زایینیدا هێرشیان کردە سەر رۆم و توانیـان ئیتالیـا کـۆنترۆڵ بکـەن. ئیمپراتـۆریی بیـزانس کـە بـۆ مـاوەی دوو سـەدە پارێزگاری لە پێکهاتەی رۆمـی دەکـرد و زمـانی لاتینیـی وەک زمـانی فـەرمی خۆی پەسند کردبوو، سەرەنجام زمانی یۆنانیی جێگرەوەی زمانی لاتینی کرد و زیاتر رەنگی هێلێنی و رۆژهـەڵاتی بەخۆیـەوە گـرت و لـە ئەنجامـدا ئـایینی مەسیحیی وەک ئاینی فەرمیی رۆم پەسند کرد. سەدەی ١٥ی زایینـی لەگـەڵ هێرشـــی ســـوڵتان محەممـــەدی دووەم (پاشـــای عوســـمانی) بـــۆ ســـەر قوستەنتینییە، دوایین ئاسەواری ئیمپراتۆریەتی رۆم لەبن هـات و چـووە نێـو لاپەڕەکانی مێژووەوە (١٤٥٣ی زایینی).

## ئاسیای بچوک

یەکەم ئایینی رۆژهەڵاتی کە لە رۆم بە فـەرمی وەرگیـرا، ئـایینی فریجیـی (بەشێک لە تورکیای ئێستا) بـوو کـە دانیشـتوانی پسـینووس و چیـای ئیـدا پەیڕەوییان لەو ئایینە دەکرد کە لـە رۆم بـە نـاوی ئیلاهـەی مـەزنی مادرایـدا ناوبانگی دەرکرد. ئەو ئایینە بۆ ماوەی شەش سەدە لە رۆم دەوامـی هێنـا و بەردەوام لە حاڵی گۆڕانکاریدا بوو. ئەو ئایینە بە رێکەوت گەیشـتبووە رۆم. کاتێک کە هانیباڵ لە ٢٠٥ی پێش زاییندا شکسـتی خـوارد (هێشـتا جێگـەی مەترسـی مـابوو)، دەوڵـەتی رۆم هانـای بـۆ پێشـگۆییکاران بـرد و ئـەوانیش گوتیـان کـە ئەگـەر ئیلاهـەی مـەزنی ئەیـدا بهێنرێتـە رۆم، هانیبـاڵ هـیچ مەترسییەکی نامێنێت. سیبۆل واتە ئەو کەسانەی کە پێشگۆییان دەکـرد بـۆ خۆیان لە ئاسیای بچووکەوە چووبوونە رۆم و ئەوانیش خواوەندەکەی خۆیـان بە کارسازی کاران دەزانی. پاشای فریجیە بـە نیشـانەی نیازپـاکی خـۆی بـۆ رۆم، نوێنەرەکانی خۆی هـاوڕێ لەگـەڵ بـەردی رەشـی ئاسـمانی، کـە پێیـان وابوو ئەو بەردە لە ئاسمانەوە کەوتووەتە سەر زەوی و هەر کات کـە ئیلاهـە

حەزی کرد لەسەر زەوی بمێنێتەوە، لەسەر ئەو بەردە دابنیشێت، رەوانەی رۆم کرد. رۆمییەکان پێشوازییەکی گەرم و گوڕیان لەو بەردە رەشە کرد و لە پالآتین دایان نا و لەوێش خەڵک بە تەدارەکێکی تایبەتییەوە پێشوازییان لێکرد. بە تێپەڕبوونی کات چەندین چیرۆکیان بۆ هەڵبەست و کۆمەڵێک پەرجووی سەیروسەمەرەیان بۆ دروست کرد و لە چیای پالآتین پەرستگەیەکی تایبەتییان بۆ چێ کرد کە خەڵک بچنە زیارەتی و وەڵامی چاکەکەی بدەنەوە. چونکە لە راستیدا لەگەڵ هێنانی بەردی رەش بۆ رۆم، هانیباڵ بە تەواوەتی شکستی خوارد و رۆم لە کێشە و مەترسی رزگاری بوو. هەموو ساڵێک جێژنێکی تایبەتی بۆ بیرئانینی هاتنی ئیلاهەی بچووک لە ئاسیای بچووکەوە بۆ رۆم بەڕێوە دەچوو (لە چواری ئاپریل هەتا دەیەمی ئاپریلی هەموو ساڵێک).

ئەو ئایینە ئاسیاییە پێش ئەوەی بگاتە رۆم، ماوەی چەندین سەدە بوو کە لە ئاسیای بچووک گشتگیر ببووەوەو خەڵک ستایشیان دەکرد، کە بۆ خۆی تێکەڵێک لەچەندین بیروباوەڕی جیاواز بوو، لەگەڵ ئەو ئایینانەی کە لە ئانادۆڵ برەویان هەبوو، تێکەڵاو ببوو. هەتا ئێستاش کۆمەڵێک لە ئایینەکانی ئەو سەردەمە لە ئاسیای بچووک، سەرەڕای هاتنی ئیسلام و مەسیحییەت، وەک خۆیان ماونەتەوە. لەسەردەمانی زۆر دێرێندا خەڵکی ئەو ناوچانە لەسەر لوتکەی چیاکان، کە لێرەوارێکی تایبەتیی هەبوو، کۆدەبوونەوەو رێورەسمەکانی جەژنیان بەڕێوە دەبرد. ئەوانە پێیانوابوو سیبۆل ئیلاهەی مەزنی دایک، لەسەر لوتکەی چیاکانی ئەیدا و برسیتنووس لەنێو دار بادام و لێرەوارەکان، کە دارە پیرۆزەکانی خواوەند بەناوی ئەتیس بوون، ژیاوە. خەڵک سەرەڕای پەرستنی دارە پیرۆزەکان، هاوکات ستایشی بەرد، گاشە بەردەکان و ئەو بەردانەی کە لەئاسمانەوە کەوتبوونە سەر زەوی، دەکرد. هەروەها سوژدەیان دەبرد بۆ ئاژەڵەکانی وەکو شێر کە بەهێزترین ئاژەڵ بوو. پێدەچێ شێر تەوتم (خواوەند، یان ئایینی بنەماڵەیی)ی ئەو هۆزانە بووبێت. لەئەفسانەکانی فیرجیدا شێر ئاژەڵێک بوو

کە سیبۆل سواری دەبوو، یان ئەرابەکەی خۆی پێڕادەکێشا. ئەو خەڵکە سیبۆلیان بە ئیلاهەی زەوی ئەژمار دەکرد کە بە Ma دایک ناسرابوو و بە سالاری ژنی سروشت کە لەنێو دارو دەوەندا دەژیا، دادەندرا. خواوەندێکی نێرینە بەناوی ئەتیس، یان پاپاس هاوسەری ئەوبوو، بەڵام ژنەکە پێگەی بەرزتر بوو کە ئەوەش بەرهەمی سەردەمی ژن سالاری بوو، کە بە میرات مابووەوە.



سیبۆل بە سواری شێرەوە

فرجییەکان کە بۆ خۆیان خەڵکی تراکیەبوون و چووبوونە وڵاتی رۆم، خواوەندی گژوگیای خۆیان بەناوی دیونیسووس، لەگەڵ خواوەندی خۆجێیی رۆم بەناوی ئەتیس بە یەک خواوەند ئەزانی بەبێ ئەوەی کە بزانن ئەمانە دوو خواوەندی لەیەک جیاوازن. دیونیسووس لە بنەڕەتەوە تراکیەیی بوو کە سروشتێکی کێویلەی هەبوو. ئەو لەسەر لوتکەی چیا سەربەرزەکان کە پراوپڕی لێڕەوار و دارو درەخت بوون، دەژیا. ئەو کەسانەی کە خوازیاری ئەوە بوون ئەم خواوەندە بەهێزەی کە لەنێو لێڕەوارەکاندا فەرمانڕەوایی دەکرد، بناسن، دەبوا دۆخی ژیان و ئەو پەسەن بکات و هەبوونی خواوەند،

که هێماکانی سروشت لێکبداتەوە، که نوێنگەی هێزی ئەو بوون. دەنگی ئەو جۆگە ئاوانەی که بە خوڕ دەهاتن و لە بەردەکانەوە شۆڕ دەبوونەوە، یان ئەو کەڵە کێوییانەی که دەنگی بۆڕە بۆڕیان دەهات، یان هاژە هاژی با که لە نێو گاشە بەردەکاندا دەنگی ئەدایەوە، هەموویان بە دەنگی دیونیسووس دادەندران و خواوەندێکیان لە مێشکی خۆیاندا وێنا دەکرد، که هۆگرییەکی لەرادەبەدەری بە وێڵبوون لە نێو چیاکاندا هەبوو، ئەگەریش کەسێک پێی خۆش بووایە بکەوێتە بەر رەحم و بەزەیی ئەو خواوەندە، دەبوا هاوشێوەی ئەو، رووی لە ژیانی نێو گاشەبەرد و لێڕەوارەکان بکردایە. بەم شێوەیە تراکیەییەکان هەوڵیان ئەدا بەم شێوەیە جەوهەری خواوەندی بەدەست بێنن و هاوڕێ لەگەڵ خواوەندی نەدیتراوی خۆیان بەردەوام لە نێو چیاکاندا بگەڕێن.

ئایینی دیونیسووسی بە هەمان شێوە لە فریجیە مایەوەو تەنیا گۆڕانێک که بەسەریدا هات ئەوە بوو که دیونیسیووس لەژێر ناوی ئەتیس، خواوەندی تەنیایی، لەگەڵ ئیلاهەی زەوی هاوسەرگیری کرد و لە تەنیایی رزگاری بوو. کاتێک که تۆفان هەڵی ئەکرد و رووی لەنێو لێڕەوارەکانی چیای ئەیدا و برسینتووس دەکرد و هاژەی دارستانەکە هەڵدەستا، ئەوان پێیان وابوو که ئەوە نەڕە نەڕەی ئەو شێرانەن که عەرابەکەی سیبۆل رادەکیشن و لەبەر مردنی هاوسەرەکەی (ئەتیس) دەستیانکردووە بە نەڕە نەڕ. شوێنکەوتوانیشیان بە دوای ئەو عەڕابەیەدا روویان لە دارستانە تۆفانلێدراوەکان دەکرد و دەستیان بە تەپڵ لیدان و هات و هاوار دەکرد و تێکەڵ بەسیبۆل دەبوون و نوقمی جۆرێک سەرخۆشبوونی پیرۆزی خواوەندی دەبوون. پێدەچێ لە ئایینی فریجیدا رێژەی درندەیی و توندوتیژی یەکجار زیاتر لە ئایینی ترکیاییەکان بووبێت. شوێنی ژیانی فریجییەکان زستانی سارد و هاوینی گەرم، گژوگیایەکەی یەکجار زۆر، بەڵام کەم تەمەنی لێ بووە و خەڵکەکەی هیندێک جار خۆشحاڵ و هیندێک جاریش هەتا سنووری شێت بوون بە خەم و پەژارەدا رۆدەچوون. خەڵکی فریجی بۆ ویشک بوونی

گژوگیاکانی سروشت بەرگی رەشیان دەپۆشی و بۆ ژیانەوەی گژوگیا شایی و خۆشیان دەکرد و بە کۆمەڵ (orgy) دەستیان دەکرد بە کەیف و رابواردن. پاش شایی و خۆشییەکی یەکجار زۆر، هەندێک لە پیاوە ئایینییەکانیان خۆیان بریندار دەکرد و خوێنی خۆیان بەسەر پەرستگەکاندا دەڕژاند و لەکاتێکدا کە بەهۆی خوێن لەبەر رۆیشتنەوە تووشی سەرە گێژە دەبوون، خۆیان لەلای خواوەند ئەدیتەوە. هەندێک جار لەم جۆرە حاڵەتانەدا چەند کەسێکیان ئەندامی نێرینەی خۆیان دەبڕی و راستەوخۆ دبوونە پیاوە ئایینییەکانی سیبۆل کە بە گالی ناوبانگیان دەرکردبوو. تەنانەت هەتا سەردەمی مەسیحیەت ئەم جۆرە نەریتە ئایینییە لەنێو ئەو خەڵکەدا مابووەوە و هەوڵیان ئەدا ئەم جۆرە نەریتە بهێننە نێو ئایینی مەسیحییەوە.

ئەم جۆرە خواپەرستی و نزاکردنی دڕندانەیە، ئەم جۆرە سەرخۆش بوونە خواوەندییە، خۆ بریندارکردن و بڕینی ئەندامی نێرینەی خۆیان، سەلمێنەری ئەوەیە کە ویستوویانە لەدەست حەزە سێکسی و جەستەییەکان رزگاریان ببێت و رۆحی خۆیان لە یەخسیریی مادە ئازاد بکەن، ئەم جۆرە بیروباوەڕە بەشێوەیەک پەرەیستاند کە زۆرەبەی کەسەکان بوونە پیاوی ئایینی و خەریکی سواڵ کردن بوون و لەگەڵ ئەوەی کە فەلسەفەی یۆنان ئاشنا بوون، ئەو باوەڕەیان لەلا دروست بوو کە ئەشێ پشت لەهەموو خولیاکانی خۆیان بکەن، تەنانەت سەرنجی پەیڕەوانی پیاوە ئایینییەکانی یۆنانیشیان بۆ لای خۆیان راکێشا.

بەم شێوەیە رۆمییەکان لە پاش شەڕ لەگەڵ هانیباڵ و رزگاربوون لە مەترسییەکانی هانیباڵ، ئەو ئایینەیان پەسەند کرد.

ئەم ئایینە بە رواڵەتی خواناسانە و جیهانبینییەکی دروستەوە، ئایینێکی یەکجار سەرەتایی و کۆن بوو، کە تیایدا تەنانەت دار، بەرد و ئاژەڵەکانیش ستایشکراون، ئەم ئایینە جیا لە بت پەرهستی، بەچەشنێک توندوتیژ و دڕندە بوو، کە چەند ساڵ دواتر لێپرسراوانی حکومەتیی رۆم بە ناچاری ئەو ئایینەیان قەدەغە کرد. بەڕێوەبردنی رێوڕەسمەکانی ئەو ئایینە دڕندەیە،

بەپێچەوانەی ئاسایش و هێمنایەتیی ئایینی رۆمییەکان بوو، گالی یان هەمان پیاوە ئایینییەکانی سیبۆل کە بەهۆی برینی ئەندامی نێرینەیانەوە هیچ منداڵێکیان لێ نەکەوتبووەوە، ئەکەوتنە بەر گاڵتە و فشەی خەڵک. هەرچەند گالیبوون بەباشترین پلەی پیرۆزی ئایینی دادەندرا، بەڵام بەپێی یاسا قەدەغە کرا. دەوڵەتی رۆم کە منەتباری سیبۆل بوو، راستەوخۆ نەیدەتوانی ئەو ئایینە یاساغ بکات، بەڵام چالاکییەکانی لێسنووردار کردن. هەروەها پەیوەستبوونی خەڵک بە ئایینی سیبۆلەوە قەدەغە کرا و چیدیکە ئیزنی بەشداری کردنیان لە رێورەسمی خۆش رابواردنی ئایینیی بە کۆمەڵی (orgy)یان پێ نەدرا. تەنیا ژنان و پیاوانی ئایینی فریجی بۆیان هەبوو کە ئەو رێورەسمە ئایینییە بەرێوە بەرن. ئەو جێژنانەی کە دوبوا خەڵک بۆ یادی سیبۆل بەرێوەی بەرن، کە بە مگالنزیا ناودێر کرابوو، هەموو ناوەرۆکی رۆژهەڵاتیی خۆی لەدەست دا و نەریتە رۆمییەکان باڵی بەسەردا کێشا.

ئایینی فریجی لە رۆم، هەتا سەردەمی ئیمپراتۆریی رۆم لە وەها حاڵەتێکی سنوورداردا مایەوەو تەنیا لە یەک حاڵەتدا سەرنجی خەڵکی رۆمیان بۆلای خۆیان رادەکێشا، ئەویش ئەوە بوو کە لە هەندیک رۆژی پیرۆزی ئایینی فریجیدا، رۆحانییەکان بەشێوەی گرووپی و بەجلوبەرگی تایبەتییەوە، کە هەمووی بەزێر و گەوهەر رازێندرابووەوە، بە نێو شەقامەکانی رۆمدا دەگەڕان و دەستیان بەلێدانی تەپڵ دەکرد. خەڵک تەنیا لەو رۆژانەدا، لەسەر ئیزنی دەوڵەت، دەیانتوانی ماڵەکانیان بەجێ بهێڵن و روو لەپەرستگەکان بکەن، لە رۆژەکانیدیکەی ساڵدا هەموو رێورەسمە ئایینییەکان، بەبێ ئامادەبوونی خەڵک لەنێو پەرستگەی پالاتین بەرێوەدەچوو.

لەگەڵ هەموو ئەم بەربەستانەدا، هاتن و مانەوەی ئەم ئایینە لە رۆم، ئایینی رۆمی بەرەوڕووی وەرچەرخان کردەوەو ئەمەش راستەوخۆ بووە هۆی ئەوە کە هەندێک لەئایینەکانی دیکەی رۆژهەڵات روو لە رۆم بکەن. پاش رووخانی سیستەمی کۆماری و جێگیر بوونی ئیمپراتۆرییەت، ئیلاهەیەکی

دیکە رووی لە رۆم کرد کە پەیوەندی بە ئیلاهەی مەزنی دایکی یەکەمەوە هەبوو. لەماوەی ئەو شەڕانەی کە لەنێوان رۆمییەکان و پاشای پونت لە باکووری ئاسیای بچووکدا هاتنەئاراوە، سەربازە رۆمییەکان لەگەڵ ئایینی "ما (Ma) "، ئیلاهەی مەزن، ئاشنا بوون، کە لەلایەن خەڵکێکەوە، کە خۆیان بە خزمەتکار و کۆیلەی خواوەند لەقەڵەم ئەدا، لەپێدەشتەکانی چیای تووروس، لەرۆژهەڵاتی ئاسیای بچووک، ستایش دەکرا. ئەو بەهێمای زاوزێی سروشت دادەندرا، بەڵام نەکەوتبووە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی دیونسیوسی تراکییەکانەوە، بەپێچەوانەوە، بیروباوەڕی سامی و ئێرانی تیایدا رەنگیدابووەوە، کە دەکرێ لەگەڵ ئاناهیتا بەراورد بکرێت.

داب و نەریتەکانی ئەو ئایینە، لە داب و نەریتی ئایینی فریجی یەکجار توندوتیژتر بوو، "ما (Ma) "بە ئیلاهەی جەنگاوەر لەقەڵەم ئەدرا و بەهاوتای بلوونا ئیلاهەی جەنگاوەری رۆمییەکانیان ئەژمار دەکرد. سۆلا پاتشای سەرەڕۆ و ملهوڕی رۆمییەکان ( ١٣٨ ساڵ پێش زایین) کە خەونی بە ئیلاهەی جەنگاوەرەوە بینیبوو، بەهۆی بیروباوەڕی بێ بنەماوە ئیلاهەی جەنگاوەری هێنایە رۆم. پەیڕەوانی داخ لە دڵی ئیلاهەی جەنگاوەر جلی رەشیان پۆشی و بەتەپڵ و زوڕناوە دەهاتنە نێو کۆڵان و بازاڕەوە بە قژی درێژەوە خەریکی زیکرکردن و سەرڕاوەشاندن و خۆجەزمکردن بوون. کاتێک سەریان لە گێژەوە دەهات و حاڵەتی سەرخۆشبوونیان بە خۆوە دەگرت، بە تەور و تەشوێ وخەنجەر لە گیانی خۆیان بەر دەبوون، کاتێکیش کە خوێن لە جەستەیان دەهات زیاتر جەزم دەبوون و خوێنەکەی خۆیان بەسەر پەیکەری ئیلاهەی جەنگاوەڕدا دەکرد، یان تەنانەت خوێنی خۆیان دەخواردەوەو سەرئەنجام لەو حاڵەتی بێهۆشبوونەدا پێشکۆیی و بەربێژییان دەکرد.

بە تێپەڕبوونی زەمەن، ئیلاهەی "ما" لە رۆم لە قاڵبی ئیلاهەیەکی سەربە ئیلاهەی دایکی مەزن خۆی دیتەوە. خۆشەویستبوونی کورتخایەنی ئیلاهەی

"ما" له ساڵەکانی سەرەتای زایینیدا، ئاماژە بە بڕشتی بیروباوەڕی ڕۆژهەڵات له ڕۆمدا، دەکات .

لەگەڵ دەسپێکی سەردمی ئیمپراتۆری، ئایینەکانی ئاسیای بچووکیش بەهێز بوون و سیبۆل و ئەتیس بە ئازادی ستایش دەکران و ڕۆمییەکان دەیانتوانی ببنە گالی و تەنانەت زۆربەی ڕێورەسم و داب و نەریتە ئایینییەکان بەو پەڕی وردە کارییەوە جێبەجێ دەکران. ئەم وەرچەرخانە لەسەر دەستی ئیمپراتۆر کلۆدیۆس ڕووی دا. لەسەر داوای ئیمپراتۆری ، کالیگۆلا، پەرستنی ئیلاهەی میسری بەناوی ئیزیس بە فەرمی پەسندکراو ڕێورەسم و بۆنەکانی ئەو ئایینە لایەنگرێکی یەکجاری زۆری لەدەوری خۆی کۆکردەوەو پاشان پەیڕەوانی سیبۆل توانیان بەئازادی چالاکی و بانگەشە بۆ خۆیان بکەن، کە ئەم دوو ئایینە لە ڕۆم بەردەوام لەململانێ و مشتومڕدا بوون. بەڕێوەبردنی ئەو جۆرە ڕێورەسمانە خەڵکێکی یەکجار زۆری بەخۆوە سەرقاڵ دەکرد و بیروباوەڕی بێ بنەمای لەنێو خەڵکدا پەرەپێئەدا کە تەنیا سیستەمی دەسەڵاتدار قازانجی دەکرد.

کلۆدیۆس پەرەی بە بەڕێوەبردنی ئەو ڕێورەسمانەدا کە لە ١٥ هەتا ٢٧ی مارس، لە دەسپێکی بەهارو ژیانەوەی گژوگیا، بەردەوام دەبوو، کە هێمای گەڕانەوەی ئەتس بوو. لە دەسپێکدا، ڕێپێوانێکی گشتی (نێی = براکان) بەڕێوە دەچوو، کە پێدەچێ نیشانەیەک لە بوون بە ئەفسانەی ئەتیس، لە قۆناغی منداڵی و لە نزیک چۆمێک لە فریجیە بووبێت، یان ڕەنگە قامیش هێمای ئەندامی نێرینە بووبێت، کە لە ڕێورەسمی تایبەت بەزاوزێی زەویدا بەکارهێندراوەو زامنی زیادبوونی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بووە، ڕێورەسمی سەرەکی لە دەسپێکی ساڵدا بەڕێوەچووە. دار کاجێکیان لەبن و ڕەگەوە دەردێناو بۆ پەرستگەی پالاتینیان دەگواستەوە. ئەو کەسانەی ئەو دارەیان دەردێنا و دەیانبردە پەرستگەی پالاتین، پێکەوە پەیمانی برایەتییان دەبەست، کە بە دندرفری (دار هەڵگرەکان) ناودێرکرابوون. ئەو دارەیان وەکو تەرمێک بە پەشم دادەپۆشی و چەندین بازنەی گوڵە وەنەوشەیان

تێدەناڵاند. ئەم دار کاجە هێمای ئەتیس بوو کە لەبەر یەک هەڵوەشابوو. ئەتیس لە بنەڕتدا هێمای رۆحی گژوگیا بوو و (داری مانگی مارس = کاج) کە بەرەوڕووی کۆشکی ئیمپراتۆر دادەندرا، بە هێمای وەرزێری ئەژمار دەکرا کە بۆ فریجییەکان بە میرات مابوویەوە. رۆژی دواتر رۆژی شین و گریان و رۆژوو گرتن بوو و ئەو خەڵکە بە رۆژووە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ بە بانگ و سەڵا دەگریان. رۆژی بیست و چوارەم رۆژی ناشتنی ئەتیس بوو، خەڵکەکە لەگەڵ سۆزی نەی دەیاننالاند، گالییەکان بەزنجیر لەخۆیان ئەداو بەخەنجەر گۆشتی جەستەی خۆیان لێئەکردەوە و تازە لاوەکان بە برینداركردنی جەستەی خۆیان و بەڕێوەبردنی نەریتە ئایینییەکانیدیکە، لەکاتێکدا لەسەر هۆش نەبوون، هێلکە گونی خۆیان بە بەردێکی تیژ لەناو دەبرد. پاشان رێوڕەسمێک بەڕێوەدەچوو کە هەمووی شاراوەو نهێنی بوو، ئەگەری ئەوەش لە ئارادابوو کە تیایدا پەیڕەوانی ئەو ئایینە لەقاڵبی ئەتیسێکی نوێدا ئاوێتەی ئیلاهەی سیبۆل ببن. رۆژی بیست و چواری مانگی مارسی هەموو ساڵێک، لە پڕێکدا شادی و خۆشی جێگەی شیوەن و گریانی دەگرتەوە، ئەتیس لەگەڵ هاتنەوەی بەهار زیندوو دەبوویەوە و بە بۆنەی ئەو ژیانەوەیە جێژنیان بەڕێوە دەبرد و رۆژی بیست و حەوتەم ئەو جێژنە بە رێپێوانێک لەنێو شەقامەکانی رۆمدا کۆتایی پێدەهات و بە تەدارەک و گوڵبارانەوە پەیکەری سیبۆلیان دەبردە سەر چۆم و بەئاو دەیانشۆردو خاوێنیان دەکردەوە.

رێوڕەسمی ستایش کردنی ئیلاهەی دایک بەر لەوەی بگاتە رۆم، لە ناوچە هێلینییەکان برەوی هەبوو، بەڵام ئەو رێوڕەسمە درندەیی و توندتیژییەی نەمابوو، جۆری رۆمیی ئەو ئایینە لە وڵاتانی ئیسپانیا، بریتانیا، وڵاتانی دەوروبەری دانووب، ئەفریقا و وڵاتی گۆل (فرانسە و بەلجیکای ئێستا) بڵاو بووەوە. تەنانەت لەسەدەی چوارەمی زایینیدا، عەرابەکەی سیبۆل لەنێو مووچە و مەزراکانی وڵاتی گۆل یان گالدا بیندرابوو کە بە هاوڕێ و یارمەتیدەری وەرزێرەکان لە قەڵەم ئەدرا. چیرۆکی کوژران و پارچە پارچە

کرانی جەستەی هاوسەری ئیلاهەی مەزنی دایک لە هەرەتی لاویەتیدا و ڕێورەسمی ناشتنی تەرمی خوێناوی و ماتەمبارییی پەیڕەوانەکەی چێن و توێژە جیاجیاکانی خەڵکی لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوە. شادی و خۆشیی ڕۆژەکانی دواتر غەم و پەژارەی لەیاد دەبردەوە. بەرەدوامیی ئەم ڕەوتە، بەرینبوونەوەی ئەم مەسەلەیە و هەروەها ماتەمباربوون بەهۆی کوژرانی هاوسەری ئیلاهەی مەزنی دایکەوە، جۆریک سەرخۆشبوونی تایبەتیی دەبەخشییە پێڕەوانی ئەو ئایینە، بەتایبەت کە ژنان خۆیان بە هاوتای سیبۆل لەقەڵەم ئەدا. بە بۆنەی مردنی هاوسەری ئیلاهەی مەزنی دایکەوە شین و واوەیلایان بوو و لەگەڵ ژیانەوەی هاوسەری ئیلاهەی مەزنی دایک، لە خۆشیاندا گەشکەیان لێدەهات.

هەر وەک ئەوەی کە ئەتیس هەموو ساڵێک دەمرد و دەژیایەوە، شوێن کەوتووەکانیشی پاش مەرگ دەژیانەوە: " ئیمان و براواتان هەبێ ئەی پەیڕەوانی ئایینی نهێنی، چونکە خواوەند ڕزگاری بووە، ئێوەش لە پاش ئەو هەموو ئێش و ئازارێک، ڕزگارتان دەبێت". پەیکەرەی سواڵەتیی ئەتیسی شوانکارەیان دەخستە نێو گۆڕەوە. لەسەر بەردی کێلی ئەو گۆڕانە وێنەی لاوێکیان لە مێشکی خۆیاندا وێنا دەکرد کە گۆچانێکی بەدەستەوە و جلوبەرگی ڕۆژهەڵاتیشی لەبەردا بوو کە بە هێمای ئەتیس ئەژمار دەکرا. ئایینی ئەتیس و سیبۆل لە ڕۆم، سەرجەم ئایینەکانی دیکەی ئاسیای بچووکی لە خۆیدا کۆ کردبوویەوە و توانی ببێتە هێمای بیروباوەڕی سەرجەم ئەو کۆیلە، بازرگان، سەرباز، مەئموور و توێژەرانەی کە لە ئاسیای بچووکەوە ڕوویان لە ڕۆم کردبوو و بە خواوەندی هەموویان ئەژمار دەکرا. ئەتیس لە سەدەی چوارەمی زایینیدا بە هاوتای خۆر ئەژمار دەکرا کە لە دەسپێکی بەهار و لە بورجی کاوڕدا خۆی دەنواند، تەنانەت ئەو بەهاوتای مانگ و هەروەها خواوەندی مردووەکان و جیهانی ژێر زەویی لەقەڵەم ئەدرا.

ئەتیس ئەوەندە گەورە کرایەوە کە تەنانەت ناسناوی خواوەندی مەزنی لەسەر داندرا. ئەو بە فەرمانڕەوایی هەموو شتێک ناسرابوو. پێدەچی

یەکتاپەرستیی جوولەکە، کاریگەریی لەسەر پەیڕەوانی سیبۆل و ئەتیس دانابێت. لەو سەردەمەدا، جوولەکەکان کە روویان دەکردە هەر شوێنێک، لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شوێنانە رێک دەکەوتن، هەت بتوانن بە ئارامی بژین. پێدەچی کە یەکتاپەرستیی ئاسیای رۆژئاوا کاریگەریی لەسەر ئەتیس دانابێت.

بە هەر جۆرێ بووبێت، لە سەردەمی ئیمپراتۆریدا، ئەتیس و سیبۆل بوونە خواوەندی مەزن، ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە کە کاریگەریی یەکتاپەرستیی رۆژئاوای ئاسیا و هەندێک بیروباوەڕی جوولەکەییان لەسەر بووە. تەنانەت ئایینی میترەی ئێران کاتێک کە گەیشتە رۆم، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر ئایینی سیبۆل و ئەتیس دانەنا. لەم ئایینەدا میهر و ئاناهیتا لە ئاستێکدا بوون. ئاناهیتا لە ئاسیای بچووک لەگەڵ ئیلاهەی مەزنی دایک تێکەڵی یەکتر بوون و لە سەرتاسەری ئاسیا رۆژئاوادا ستایش دەکرا. کاتێک کە ئەم ئایینە لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەمی زایینیلە وڵاتانی لاتیندا بڵاو بووەوە، پیرەوانی ئەم ئایینە توانییان لەژێر زەویداو لە دەوروبەری پەرستگەی مەزنی دایک، کۆمەڵێک پەرستەگەی بچووک دروست بکەن. هاوکات لە سەرتاسەری ئیمپراتۆرییەتیشدا پەیوەندییەکی نزیک لەنێوان ئەو دوو ئایینەدا دروستبوو. بە هۆی ئەم پەیوەندییانەوە، ئایینی سیبۆل بناغەیەکی هزریی بەهێز تیایدا رەنگیدایەوەو تەنانەت نەریتی سەربڕینی گا، کاریگەریی لەسەر ئایینی مەزنی دایک هەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر، ئەوەیش ئەوەبوو کە پەیڕەوی راز لەنێو چاڵێکدا رادەوەستا و پاشان، گایەکیان سەردەبڕی و خوێنەکەی دەڕژا بە سەریداو ئەویش خوێنەکەی دەخواردەوە، کاتێکیش لەنێو چاڵەکە دەهاتە دەرەوە، لەلایەن پەیڕەوانییەوە ستایش دەکراو سوژدەیان بۆ دەبرد. ئەو لەو باوەڕەدابوو بەم کارە لەسووچ و تاوان پاکبووەتەوەو بە غوسل دەرکردنی خوێن، ئاوێتەی خواوەند بووە. ئێرانییەکان بیروباوەڕی ژیانی هەتاهەتایی نێو بەهەشتیان بردە رۆژئاوا و لەژێر کاریگەریی بیروباوەڕی ئێرانیدا، سەربڕینی گا و هەڵقوڕاندنی

خوێنەکەی واتای ئایینی بەخۆوە گرت، ئەمەش هۆکاری ژیانەوەی ڕۆح لەپاش مەرگ بوو و بە پاک و خاوێنی بەرەو ئاسمان دەڕۆیشت بە هاوتای خواوەند دادەندرا. بەرەبەرە ئاینی سیبۆل و ئەتیس بۆ ئاینێکی ڕۆحانی گۆڕانیان بەسەردا هات. خوانی پیرۆز کە بۆ ئەو کەسانەی تازە ئیمانیان بەو ئایینە دەهێنا، ساز دەکرا، گەرم و گوڕیی خۆی لەدەستدا و ڕەنگی ڕۆحانی بەخۆوە گرت.

تەنانەت ئەتیس بووە خواوەندێکی ئاسمانی کە بە هاوتای خۆر ئەژمار دەکرا و جۆرێک یەکتاپەرستیی حاشا هەڵنەگری خواوەندەکانیدیکە، جێگەی بەئایینی سەرەتایی فریجی لێژ کردو ئەتیس بووە شوانی ئەستێرەکان و لەگەڵ ئەدینووس، باکووس، ئۆزیریس و میهر (میترە) بوو بە برا، ئەتیس کۆمەڵێک شکڵی بەخۆوە گرت و هەمووی هێزە ئاسمانییەکان بە نۆرە خۆیان لەودا دەبینییەوە. ئەو بووە "هام ئیزەد" (هەمووی ئیزەد) و لە هەمان کاتیشدا تاجی هەتاو و مانگی لەسەر نابوو و هاوکات کۆمەڵێک ئەرکیشی لەسەر شان بوو.

کاتێک کە ڕێبازی نوێی ئەفلاتوونی پەرەیستاند، ئەفسانەی فریجیی ئەتیس بووە هەوێنی شوبهاندنە فەلسەفییەکان، کە بەو پێیە ڕۆح لەگەڵ ئەوەی کە ئاوێتەی مادە بوایە پاکیی خۆی لەدەست ئەدا و پاشان ڕزگاری دەبوو، ئایینی مەسیحیش هەتا ڕادەیەک لەگەڵ غوسڵ شۆردن بە خوێن، ئەو خوانانەی کە بۆ تازە بڕواکان ساز دەکراو هەروەها لەگەڵ دایکی خواوەندەکان کە هاوسەرەکەی زیندووبوونەوەیەکی هاوشێوەی عیسا مەسیحی هەبوو، پەیوەندی هەیە. پەیڕەوانی ئەتیس و سیبۆل غوسڵ دەرکردنیان بە خوێن لە غوسڵدەرکردن بە ئاوی ڕەوان و خاوێنی مەسیحییەکان بە باشتر دەزانی، هەروەها پێیان وابوو مەسیحییەکان لە خواردنەکانی خۆیاندا کە نان و شەراب دەخۆن، لاسایی ئەوان دەکەنەوە. تەنانەت حەفتەی پیرۆزی مەسیحی لە دەسپێکی بەهاردا، بە لاساییکردنەوەی ڕێوڕەسمی دەسپێکی بەهاری خۆیان لەقەڵەم ئەدا. لە

ئـاييني مەسـيحيدا، عيسـا مەسـيح شۆڕشـێک دەکـات و لەسـەر گـۆی زەوی نامێنيت.

دروست ئەو شوێنەی کـە لـەکۆتايي سـەدەی چـوارەمی زايينـی، ناوەنـدی ئـاييني فريجـی بـوو و هاوکـات ڕێـوڕەسـمی سـەربڕينی گـا و غوسـڵدەرکردن بەخوێن بەڕێوەدەچوو، لە ئێستادا کەنيسەی گەورەی کاتۆليکەکانی ڕۆمە.

واتـای فەلسـەفی و خواناسـی لـەبيروباوەڕی تونـدوتيژ و دڕندانـەی ئـەو ئايينەدا ڕەنگيدايـەوە، بـەڵام نـەيتوانی بەتـەواوەتی بيگـۆڕی يـان ئـەو جـۆرە باوەڕانە لەناو ببات و هيچ کاتێکيش لە هەزارەی يەکـەمی مەسـيحدا لـەنێوان بيروباوەڕی سەرەتايي و پاک بوونەوەی ڕۆحی ئينسـان لـە سـووچ و گونـاح، هاوئاهەنگی و لێکتێگەيشتنێک نەهاتە گۆڕێ.

لەهەمان کاتدا ئاييني فريجی بـوو کـە ڕێگـەی بـۆ ئايينـە ئاسـياييەکانی وەکـو مەسـيحی بـەرەو ئـەورووپا خۆشـکرد و بيروبـاوەڕی يەکتاپەرسـتيی ڕۆژهەڵاتييـەکان، بەهەشـت و جەهەنـەم و ياسـای ئەستێرەناسـی و مـەرگ و ژيانەوەی بەرۆمييەکان ناساند.

ڕۆمييەکان بەبێ ئەوەی ئەم ئايينەو ئايينـە ڕۆژهەڵاتييەکانيدیکە بناسـن، نەياندەتوانی لەگەڵ واتا و چەمکی مەسيحی ئاشنا ببن.

## ميسر

زانيارييـەکانی ئێمـە لەسـەر ئـاييني چاخـە دێرينـەکانی ميسـر بەبـەراورد لەگـەڵ ئـاييني هۆزەکانيدیکـە يـەکجار زيـاترەو سـەبارەت بەوەرچـەرخان و گۆڕانکارييەکان دەتوانين بۆ سێ چوار هەزار ساڵ پـێش ئيسـتا بگەڕێينـەوە. دەقە پيرۆزە ئايينييەکان، چيرۆکە ئەفسانەييەکان، سـروودە مەزهەبييـەکان، ئـايين و کتێبـی مردووەکـان بەدەسـت لێنـەدراوی ماونەتـەوە، کـە ئامـاژە بەبيروباوەڕی ميسرييەکان، سەبارەت بەهێزی خواوەندی و ژيان پـاش مـردن دەکەن. بەرهەمـە نيگارکێشـييەکان و وێنـەی هەڵکەنـدراوی سـەر بـەردەکان، دەرخــەری هێـزی خواوەنـدی و چۆنييـەتيی بـەڕێوەبردنی ڕێوڕەسـمەکانن.

نووســـراوەکانی پــاپیروس و بــەردە نووســـراوەکان، ئامــاژە بــەرێکخراوی سیحربازیی پەرستگە مەزنـەکانی میسـر دەکـەن. لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا، هەتا ئێستا سـەرچاوەی سـەرەکی و چۆنییـەتیی ئـەو ئایینـەی کـە یۆنـانی و رۆمییەکان، کە لە سەردەمی بتلمیوسیدا لەمیسر بۆیان بە میـرات مـابووەوە، روون نییــە. لەکاتێکـدا روون و ئاشـکرایە کـە ئـایینی ئیـزیس و سـراپیس لەئــەورووپا، لــە میســـرەوە ســـەرچاوەیان گرتـــووە، بــەڵام ســـەرچاوەی سەرهەڵدانەکەی روون نییە.

بەدڵنیاییەوە ئـەم ئایینـە، لەپەرسـتگەی سـراپیس، لـە ئەسـکەندەرییەوە سەریهەڵداوە و لەمیسر و ئەورووپا بڵاوبووەتەوەو بتلمیووس ناسراو بە سووتر (رزگاریدەر) پشتیوانیی لێکردووە، بەڵام مێژووی ئەو پرستگەیەو بنەچـەی و سەرچاوەی ناوی ئەم خواوەنـدە (سـراپیس) ناڕوونـەو لەئەفسـانەکاندا نـوقم بـووە. پێـدەچێ کـە نـاوی سـراپیس لـەناوی ئـۆزیریس - ئـاپیس خواوەنـدی میســرییەکان وەرگیرابێــت. ئــەوەی روون و ئاشـکرایە، یــان لــە دەسـپێکی سەردەمی بتلمیووسییەوە سراپیس و ئۆزیریس هاوتای یـەک لەقەلەمـدراون و بەخواوەندێکی یەکتا ئەژمار کراون.

سـراپیس، خواوەنـدی نـوێی سـەردەمی بتلمیووسـی هـەمان فـەرمانڕەوای جیهانی مردووەکـان، واتـا ئـۆزیریس بـوو، کـە بەخۆشەویسـتترین خواوەنـدی دۆڵی نیل ئەژمار دەکرا.

هیـرۆدۆت دەڵـێ هـەموو خـەڵکی میسـر ستایشـی ئیـزیس و ئۆزیریسـیان دەکـرد و ئـەو رۆژە پیرۆزانـەی کـە پەیوەنـدی بـەم دوو ئایینـەوە هـەبوو، کۆمەڵێک رێورەسمی پڕ رەمز و رازیان بەڕێوە دەبرد.

بـەهۆی ئـەو لێکچوونـەی لـەنێوان ئۆزیریسـی کـۆن و سراپیسـی نـوێ و بتلمیوسـیدا هەیـە، میسـرییەکان بەئاسـانی پـەیڕەوییان لەسـراپیس کـرد. سەرەڕای ئەمانـە میسـرییەکان عادەتیـان وابـوو لەگـەڵ هاتنەسـەرکاری هـەر خانەدانێکی نوێ، بانگەشە بۆ خواوەندێکی نوێ بکەن، هاوکات گرینگییـەکی باشتریان بەخواوەندی ویلایەتی ئـەدا، چونکـە خانـەدانی دەسـەڵاتدار لـەوێوە

هاتبوون ( کاریگەریی سیاسەت لە سەر وەرچەرخانی ئایینە دێرینەکان).

بەم شێوەیە لەسەردەمی بتلمیووسییەکاندا، سراپیس وەک یەکێک لەگرینگترین خواوەندەکان بۆ بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکان ئەژمار دەکرا. ئامانجی سەرەکیی بتلمیووسیەکان تەنیا زیادکردنی ناوی خواوەندیکیدیکە بە ریزی خواوەندەکان یان گۆڕینی ناوی ئەو خواوەندانە نەبوو، بەڵکو ئەوان دەیانویست بە فەرمی ناساندنی ئایینێکی نوێ، یەکگرتوویيەک لەنێوان یۆنانییەکان و میسرییەکاندا پێک بێنن، چونکە تاقمی دەسەڵاتدار لەمیسر بۆ خۆیان یۆنانی بوون، کەمینەیەک لە خەڵکی یۆنان لە دۆڵی نیل دەژیان، بۆیە ئەگەر بڕیار بوو فەرمانڕەوایی بتلمیووسیەکان لە دۆڵی نیل بمێنێتەوە، پێویست بوو ئەو یەکگرتوویيە لەئارادابێت.

تێکەڵبوونی ئەم فەرهەنگە میسری و یۆنانییە، ئایینێکی نوێی بنیاتنا، کە تێکەڵاوێک لە بیروباوەڕی کۆنی فیرعەونییەکان و یۆنانییەکان بوو، تەنانەت زمان و ئەدەبیاتی ئایینی، کە لە ڕێوڕەسمەکاندا بەکاردەهێنران، یۆنانی بوون. پەیکەرو بتە پیرۆزەکانی میسر، کە بەدەستی یۆنانییەکان دروستکرابوون، یۆنانییەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو هاوتای خواوەندەکانی خۆیان ستایشیان دەکردن. شێوەو سیمای ئیزیس بەجلوبەرگی سپییەوە دەچووەوە سەر هێرا (هاوسەری زێئووس) و ئافرۆدیت، ئیلاهەی ئێڤین. هەروەها پەیکەری سراپیس لە پەرستگەی ئەسکەندەرییە کە هەتا سەرکەوتنی مەسیحییەت لەسەر ئایینە کۆنەکان مابووەوەو بەشاکارێکی هونەری ئەژمار دەکرا و بە وردی ئاماژە بە کەسایەتیی سراپیس دەکات کە خواوەندی خێر و بەرەکەت و خواوەندی جیهانی مردووەکان بووە، وەها ئایینێک بە تایبەتمەندییەکانی یۆنانی بوونەوە دەیتوانی خەڵکی یۆنان لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، چونکە ئەم جۆرە خواوەندە بۆ یۆنانییەکان نامۆ نەبوو، تەنانەت بەر لە هیرۆدۆتیش ئۆزیریس لەگەڵ دیونیسووس و هەروەها ئیزیس لەگەڵ دمتر بە هاوتای یەکتر دادەندران.

دەکرێ بیسەلمێنین لەسەردەمانی یەکجار پێشتردا، ئاپینی ئیزیس و ئۆزیریس گەیشتوونەتە یۆنان و بە هاوشان و هاوتای دیونیسووس و دمتر ئەژمار کرابوون. ئۆزیریس و دیونیسووس فەرمانڕەوایی گژوگیا و جیهانی مردووەکان بوون. هەر دووکیان دەکوژرێن و ئەنجن ئەنجن دەکرێن و دواتر ئیلاهەیەک دێت و تەرمی کوت کوتکراویان کۆدەکاتەوەو خواوەندی کوژراو زیندوو دەبێتەوە.

لایەنی هاوبەشی ئاپینی یۆنانی میسری لە زاتی ئیزیس، ئۆزیریس، منداڵەکانیان، هارپوکراتیس (Harpocrates) و نۆکەرەکانیان واتە ئانووبیس خۆی دەبینێتەوە. سەرجەم خواوەندەکانی دیکەی میسر بۆ یۆنانییەکان نامۆ بوون، بەلام لەو ڕێورەسمانەی کە لەماوەی ساڵێدا بەڕێوە دەچوون، یۆنانی و میسرییەکان هاوئاهەنگ و یەککگرتوو بوون.

ئەو ڕێورەسمە تایبەتییانەی کە لەپەرستەگەکانی میسر بەڕێوە دەچوون، یۆنانی و میسرییەکانی تووشی سەرسوڕمان دەکرد، بەلام بت پەرستیی میسرییەکان، ناڕەزایەتیی دەستەی چاوکراوەو تێگەیشتووی یۆنانییەکانی لێدەکەوتەوە. سەرەڕای ئەمانەش، پەرستنی ئاژەڵ و گژوگیا، کە لە ئاپینەکانی میسردا پێشینەیەکی دوور و درێژی هەبوو، نەیدەتوانی ڕەزامەندیی یۆنانییەکان بەدەست بێنێت. شاعیرێکی ڕۆمی دەڵێت: " ئەی خەڵکینە، کە باخچەکانتان بەرهەمی زاوزێی خواوەندەکانن!" گژوگیای وەکو کەوەر و سیر لەلایەن ئەو خەڵکە شوکرانەبێژێرییان بۆ کراوە. بەم شێوەیە بتلمیووس کۆمەڵێک ڕێسای تایبەت بەئاپینی میسریی وەلانا و تەنیا بەچەند لایەنێکی هاوبەشی ئاپینی میسری و یۆنانی، پابەند مایەوە.

ئەم ئاپینە هاوڕێ لەگەڵ سیاسەتی بتلمیووسییەکان، لە دەرەوەی ولاتی میسر، بەشێوەیەکی بەرین بلاوبووەوەو هەتا قوبرس، سیسیل، ئەنتاکیە و شام ڕەگاژۆی کرد و هەموو ڕۆم، ئاتن و ئاسیای بچووکی تەنی و سەرئەنجام، لە سەرتاسەری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بلاوبووەوە. فەرهەنگی

هێلێنــی لەسیســیل و باشــووری ئیتالیــا جێگیــر بــوو، هاوکــات بازرگانــە میسرییەکانیش هاتووچۆی ئەو ناوچانەیان دەکرد.

لەدەقێکدا کە مێژووەکەی بۆ ١٠٥ ساڵ پـێش زایـین دەگەڕێتـەوە، باسـی سراپیوم (پەرستگەی سراپیس) شاری پوزولی کراوەو هـەر لـەو سـەردەمەدا لەشاری پەمپی پەرسـتگەیەکی تایبـەت بـۆ ئیـزیس دروسـتکراوە. لەمـەودوا، ئایینی میسر کـە لەباشـووری ئیتالیـا هێـز و دەسـەڵاتی بەدەسـت هێنـابوو، بـەرەو بـاکوور رەگـاژۆی کـرد و لـەنێو کۆیلـە و جوامێرەکـانی رۆم لایـەنگری باشی لە دەوری خۆی کۆکردەوە. لە سەردەمی سیسـتەمی کۆماریـدا زۆریـان هەوڵدا بەر بە پێشکەوتنی ئەم ئایینە بگرن. سەنای رۆم لـە ٤٨، ٥٢، ٥٨ و ٥٩ی پێش زایین، بڕیاریان دەرکرد کە سەرجەم پەرستگەکانی سراپیس تێک بروخێنن، بەڵام نەیانتوانی رێگری لەبڵاوبوونەوەی ئەو ئایینـە بگـرن. ئـایینی میسری یەکەم ئایینی بێگانەبوو، کە لەرۆم پەرەیستاندو رەگاژۆی کرد.

کۆمـاری رۆم بـەهۆی لاوازیـی بەڕێوەبـەری و هـەروەها بـەهۆی بنـەڕەتی میســری - بتلمیووســی بــوونی ئــەو ئایینــە، دەیەویســت رێگــری لــە سـەقامگیربوونی بکـات. هـەتا ئـەو کـاتیش ئیمپراتۆریـەتی بتلمیـووس بـە رکەبەری رۆم لە قەڵەم ئەدراو شـاری ئەسـکەندەرییە بەپێشـکەوتووتر لـەرۆم ئەژمار دەکرا. رۆمییـەکان ئاگـاداری ئـەم فاکتەرانـەبوون و ترسـێکی یـەکجار زۆریـان لـێ نیشـتبوو، بـەڵام پـاش کـوژرانی سێزار، لـە ٤٢ی پـێش زایـین، دەسـەڵاتدارانی رۆم بـۆ بەدەسـتهێنانی متمانـەی خـەڵک رەزامەنـدیی خۆیـان لەگەڵ دروستکردنی پەرستگەیەک بـۆ ئیـزیس دەربـڕی. ئـایینی بتلمیووسـی بـەخێرایی لـەناوچوو و دەسـەڵاتدارانی رۆمـی کەوتنـە دژایـەتیکردنی ئـایینی میسری و زۆربـەی رۆحانییـە میسـرییەکانیان کوشـت، بـەڵام ئـایینی میسـری تەنیا بـە رواڵـەت لەگەشـەکردن کـەوت، چونکـە لـەنێوان چـین و توێژەکـانی خەڵکدا بـڵاو ببـووەوەو تەنانـەت بەخێراییـەکی یـەکجار زۆر بـاکووری وڵاتـی ئیتالیای تەنی و بۆ نێو ویلایەتەکانیدیکەی رۆمیش رەگاژۆی کـرد. هـەروەها هـەبوونی بازرگـان، دەریـاوان، کۆیلـە، سـەنعاتکار، ئـەدیب و تەنانـەت ئـەو

سەربازانەش کە خەڵکی دەرەوەی میسر بوون و لە دۆڵی نیل نیشتەجێ بوون، هۆکاری سەرەکیی بڵاوبوونەوەی ئاینی میسری لە ئەورووپای رۆمیدا بوون و تەنانەت ئەو ئاینە لەزەوییە داگیرکراوەکانی ئەفریقای باکووریشدا رەگاژۆی کرد.

لەنێوان ساڵەکانی ٣٧ هەتا ٤١ی زایینی، کالیگۆلا، ئیمپراتۆری رۆم، پەرستگەی مەزنی ئیزیسی لە بنەڕەتەوە دروستکردەوەو لەو سەردەمەوە بەدوا، ئاینی ئیزیس و سراپیس لە رۆم بەبێ لەمپەر بڵاوبووەوە. ساڵی ٢١٥ی زایینی، لە نێو جەرگەی شاری رۆم، پەرستگەیەکی یەکجار مەزن بۆ ئیزیس دروستکرا. خواوەندی میسری بەتەواوەتی ببووە رۆمی و لە دەسپێکی سەدەی سێیەمدا گەیشتە لوتکە. لەمەو بەدوا، خواوەندە ئاسیاییەکانیدیکەی وەک : بەعلەکانی سووریا و میهری ئێرانی جێگەی ئەو ئاینەیان گرتەوەو سەرئەنجام مەسیحییەت جێگەی بەهەموویان لێژکرد. تەنانەت هەتا کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی زایینی، رێورەسمە میسرییەکان لە رۆم بەڕێوەدەچوون. لەو ساڵانەدا بوو کە مەسیحییەکانی رۆم پەرستگەی سراپیسیان لەئاگردا سووتاند (٣٩١ی زایینی) و پەیکەری سراپیسیان بە تەور وردوخاش کرد. لەو سەروبەندەدا میسرییەکان، ئاینە دێرینەکانی خۆیان لەبیرکردبوو.

ئاینی میسری بەردەوام لەحاڵەتی وەچەرخان و پەشۆکاویدا بوو. تێکەڵێک لەخواوەندی ویلایەتەکان و ئاوێتەبوونی ئاینەکانی سەربەخواوەندەکان، کە هەر کاتێک بایەخی هەرکام لە خواوەندەکان، یان ئاینەکان، بە سەرنجدان بەوەی کە چ خانەدانێک دەسەڵاتدار بێت، گۆڕانی بەسەردا دەهات، هیچ ئاینێک بە تەواوەتی باڵی بەسەر خەڵکی میسردا نەکێشا. نەریت و بیروباوەڕی جیاواز لە ئارادا بووە و کۆمەڵی رۆحانییەکانی میسر هیچ کاتێک هێچ هەوڵێکیان بۆ پێکەوە سازانی بیروباوەڕ و نەریتە جیاوازەکان نەخستۆتە گەڕ. ئاینی میسر لە دەرەوەی میسریش هەر هەمان بارودۆخی هەبووە و خەڵک لەسەر رێچکەی ئەو نیزامە ئاینییە پەروەردە

نەكراون. بیروباوەڕی رواقی و هەروەها هزری فەلسەفیی یۆنانییەكانیش پەلی هاویشتە نێو ئەو ئایینە و كاتێكیش بیرۆكەی نوێی ئەفلاتوونی هاتە گۆڕێ زۆر بەهاسانی ئایینی میسری - رۆمییەكانی خستە ژێر كاریگەریی خۆیەوە. هەر كەسێک لە رۆم بە هەر ئاینێكەوە كە هەیبوو، ئەگەر سەرنجی ئایینی میسری بدایە كۆمەڵێک لایەنی هاوبەشی لەنێوان ئایینەكەی خۆی و ئایینی میسریدا بەدی دەكرد. لە ئەنجامدا، خواوەندەكانی میسر لەرۆم هەمەكارە بوون، بەڵام پرش و بڵاوی لەنێوانیاندا حاكم بوو. تەنانەت یەكتاپەرستی لەنێو ئەو ئایینەدا بانگەشەی بۆ دەكرا و لەهەمان كاتیشدا لەنێوان خەڵكی ئاساییدا بانگەشەیان بۆ فرە خواوەندی دەكرد. ئیزیس بە رابردوو، ئێستا و داهاتوو ئەژمار دەكرا، ئەو بە سروشت و دایكی هەموو بوونەوەرەكان لەقەڵەم ئەدرا. ئەو نەمر و ئەزەلی بوو، هەزاران ناو و لە هەزاران شێوەدا خۆی دەنواند. هەزاران خەسڵەتی بێ كۆتای هەبوو. هەموو شتێک لە وجوودی ئەودا كۆببووەوە.

سراپیس بەكەمتر لەو ئەژمار نەدەكرا. ئەو بەخواوەندێكی مەزن و بێ هاوتا لەقەڵەم ئەدرا. هەموو هێزەكان لەودا كۆببووەوە. بەسەرنجدان بەوەی كە لەسەردەمانی پێشووترەوە ئۆزیریس لەگەڵ هەتاو كەسایەتییەكی هاوتایان پەیداكردبوو (چونكە هەردووكیان بەخواوەندی بەرەكەت و جیهانی ژێر زەوی ئەژمار دەكران)، هەروەها سراپیس، جێگرەوەی ئۆزیریس، بەهاوشانی هەتاو دادەندرا و لەگەڵ دوایین ئایینی رۆمی پێش مەسیحییەت، هاوتەریب بوو.

رەوشتی ئایینی میسری لە رۆم كەوتە ژێر ركێفی رەوشتی باو. ئایینی خۆجێی میسر رەوشتێكی جوانی نەبوو و لە كاتێكیشدا گەیشتە ئەوروپا كە بیروباوەڕی رواقی لەزنجیرە یاسایەكی رۆمیدا بەسەر ئەوروپادا زاڵ بوو، كە چەندین قات لە رەوشتی ئایینی، میسری پێشكەوتووتر بوو كە لایەنگریی لە هەموو جۆرە رابواردن و كەیف و خۆشییەكی پێش مردن دەكرد. تەنانەت ئیزتس كاتێک كە گەیشتە ئیتالیا لەگەڵ ئافرۆدیت، و هارپووكراتیس لەگەڵ

ئەرووس، خواوەندی ئەڤین بەراورد دەکرا و بەتایبەت لە قەحبەخانەکان زۆر خۆشەویست و جێگەی بایەخ بوون. ئیزیس لەرۆم وەکوو لاوازیی نەفسی ئینسان ئەژمار دەکرا.

کاتێکیش کە ئەخلاق لەنێو ئایینەکاندا هاتە ئاراوەو داوێن پاکی و کاری چاکە بە بنەمای رزگاربوونی لەقەڵەم درا، ئیزیسیش گۆڕانی بەسەر خۆیدا هێنا، داوێن پاکی، خۆ پاراستن لە پەیوەندیی سێکسی لە نێو ئایینەکاندا گشتگیر بوو و کۆمەڵی رۆحانییەکانی میسر بە ئاسانی خۆی لەگەڵ ئەم وەرچەرخانە نوێیە گونجاند. پاکبوونی جەستە هۆکاری بەختەوەری و پاکیی رۆح بوو و خراپیی ئەخلاق پاک بکاتەوە. ژنانی پەیڕەوی ئیزیس لە رۆم، لەم چاخە نوێیەدا، زستانان سەهۆڵی سەر چۆمەکانیان دەشکاند و غوسڵیان دەر ئەکرد و بۆ پاکبوونەوە لە گوناح و تاوان بەجەستەی تەڕەوە چۆکیان دائەداو داوای لێخۆشبوونیان دەکرد.

بەرەبەرە غوسڵدەرکردن کەمڕەنگ بووەوەو چلەکێشی و تەرکەدنیایی بوون جێگەی غوسڵدەرکردنی گرتەوەو بە یەکێک لە مەرجەکانی ناسینی خواوەند ئەژمار دەکرا. ئیزیس چیدیکە لایەنگری پەیوەندی و سۆز و ئێڤینی ئازادانە نەدەکرد و تەنیا پشتیوانیی لەو کچانە دەکرد کە بەرەوڕووی بێ ئەخلاقی دەبوونەوەو رزگاریدەکردن.

ئایینی میسریش پێویستی بەپێداچوونەوە هەبوو شۆڕشی ئایینی و شۆڕشی ئەخلاقیی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، لەو سەردەمەدا گەیشتبووە ئەنجام و ئەو ئازادی و چێژ و خۆشرابواردنەوەی کە لە ئایینی چاخەکانی پێشتریشدا گشتگیر ببووەوە (بۆ نموونە لە ئایینی میسری)، لەو سەردەمدا بەرەو پاکی و چلەکێشی هەنگاوینا.

## سووریا

ئایینەکانی سووریا بەشێوەی ئایینەکانی میسر، یان ئاسیایی و رۆم یەکگرتوو نەبوون و لەچەندین سەردەمی جیاواز، لە وشکاییەکانی فینیقیە و چۆڵگەکانی لوبنان، هەروەها کەناراوەکانی فورات و گوندە بچووکەکانی نێو بیابانەوە وەکو شەپۆلی دەریا گەیشتنە رۆم و لەوێش لەپەنا یەکتردا

مانەوەو هیچ یەکگرتنێک لەنێوانیاندا نەهاتە ئاراوە، هەرچەند کێشەکانیان لەبنەڕەتەوە لەسەر ناوەڕۆکی ئایینەکان نەبوو، بەڵکو کێشەکان لەسەر ناوی خواوەندەکان بوو. لاوازبوونی هەر یەک لەئایینەکان و هەروەها ئیمانی شوێنکەوتووانی ئەو ئایینە پەیوەندیی بەپرش و بڵاویی هۆزەکانی سووریاوە هەبوو، کە هەتا ئەو کاتیش بەشێوەی عەشیرەتی و هۆزایەتی دەژیان. چەندین هۆزی جۆراوجۆر، کە لە ناوچە جیاجیاکانی سووریادا دەژیان، تەنانەت هەتا سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی رۆم بەهەمان شێوەی سەرەتایی مابوونەوەو لێبڕاوانە پارێزگارییان لەخواوەند، هۆز و زاراوە جۆراوجۆرە ناوچەییەکانی خۆیان کردبوو.

ئەترگەتیس بەیەکەم خواوەندی سووریایی ئەژمار دەکرێت، کە لە ئیتالیا پێشوازی لێکرا، کە زۆرکەس لەگەڵ ئیلاهەی فینیقی بەناوی عستارت جیایان ناکەنەوە. ئەترگەتیس پەرستگەیەکی بەناوبانگی لە هیراپولیس لە نزیک فورات هەبوو، کە هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەی لەلایەن خەڵکەوە ستایش دەکران. یۆنانییەکان هیراپولیسیان بەمەزنترین ئیلاهەی سووری لەقەڵەم ئەدا و لە وڵاتانی لاتین بە (dea Syria) ناودێریانکردبوو، کە لە ئاخاوتنی ئاساییدا بۆ (Istura) گۆڕدرابوو.

نووسەرانی رۆمی باسیان لە ئەترگەتیس و پەیڕەوانی کردووە. لەرێورەسمێکی تایبەتیی ئەودا، پیاوێکی نەزۆک بوو بەپێشەوای خەڵک. کۆمەڵێک کوڕی گەنج و لاو کە دەم و چاوی خۆیان لە رەنگ هەڵکێشابوو، لە کاتێکدا پەیکەرێکی ئیلاهەیان سواری کەرێک کردبوو، دوند بەدوند و گوند بە گوند بەدوا ئەو پیاوە نەزۆکەدا دەگەڕان. کاتێکیش کە دەگەیشتنە گوندێک، کۆمەڵێک نەریتی ئایینییان بەڕێوە دەبرد : لەگەڵ ژەنینی نەی، بەشێوەی بازنەیی، لەدەوری یەک کۆدەبوونەوەو دەستیان دەکرد بە زیکرکردن و سەر سوڕدان هەتا گێژ و خول دەبوون. پاشان بەخەنجەر و چەقۆ یەکترییان بریندار دەکرد، بەم شێوەیە سەرنجی خەڵکی دەوروبەریان بۆلای خۆیان رادەکێشا. سەرئەنجام کاتێک نەریت و رێورەسمەکەیان کۆتایی

پێدەهات، بە دەوری خەڵکەکەدا دەسووڕانەوە، هێندێک دەستخۆشانە و پێشکەشی و پارەیان کۆدەکردەوە. هێندێک لە نووسەرانی رۆمی تەنانەت ئەو کەسانەیان بە دزی کردن لەکاتی بەڕێوەبردنی رێوڕەسم و نەریتەکان تاوانبار کردووە. پێشگۆیی کردن بەشێک لەو کارانە بوون کە پەیڕەوانی ئەترگەتیس ئەنجامیان داوە.

گومانی تێدا نییە کۆیلەکان لە وڵاتی لاتین، یەکەمین پەیڕەوانی ئیلاهەی سوورییایی بوون. لەکاتی شەڕی رۆمییەکان لەگەڵ ئانتیخووس پاشای گەورەی سلووکییەکان، رێژەیەک کۆیلەی سوورییایی رەوانەی ئیتالیاکران کە بە کلدەیی ناودێرکران. کلدەییەکان لەئیتالیا خۆیان بە پێشگۆی بەتواناو خاوەن زانستی ئەستێرەناسی ناساندو لەنێو کرێکارو وەرزێراندا لایەنگری باشیان لەدەوری خۆیان کۆکردەوە.

لەدەسپێکی سەدەی دووەمی پێش زایین، بازرگانانی رۆمی روویان لە هێنانی کۆیلەی سوورییەیی کرد و لەگەڵ هاتنی کۆیلەکان بۆ رۆم و یۆنان، پەرستنی ئەترگەتیس پەرەی ستاند و خەڵکێکی یەکجار زۆری رۆمی و یۆنانی بۆ لای خۆی راکێشا. لەکۆتاییەکانی سەردەمی سیستەمی کۆماری، پەیڕەوانی ئەترگەتیس دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت. لە سەردەمی ئیمپراتۆریدا، هێنانی کۆیلە سوورییەکان بۆ رۆم پەرەی گرت و لە هەمبەر دابەزینی رێژەی حەشیمەتی رۆمییەکان لە ئیتالیا، هاوکات کۆیلە ئاسیاییەکانیشیان بەمەبەستی کار پێ کردن، بۆ رۆم دەبرد. ئاسیاییەکان بەتایبەت سوورییەییەکان، سەرەڕای کار کردن لە مووچە و مەزرا و کۆشکی دەوڵەمەندەکان، لەنێو کانگەکانیشدا کاریان دەکرد و پەیڕەوانی ئەترگەتیس لەبەشی ئەورووپایی ئیمپراتۆری رووی لەزیاد بوون کرد. سەردەمانێک نێرون، ئیمپراتۆری رۆم، ئاشقی ئەم ئیلاهەیە ژبوو کە بەو هۆیەوە، لەیەکێک لە گەڕەکە پڕ دانیشتووانەکانی رۆم، پەرستگەیەکی بۆ سازکرد.

لە سەردەمی ئیمپراتۆریدا کە هەموان مافی بەرانبەریان بەدەست هێنا، سوورییەکان لە قاڵبی بازرگان و مامەڵەچیدا گەڕانەوە بۆ رۆم و بەشە

ئەورووپاییەکانی ئیمپراتۆریی رۆم، و جیا لە ئەترگەتیس، خواوەندی هۆزەکانی سیکەی سووری و رۆژئاواش لە رۆم ستایش دەکران. سووریەکان بەشێوەی بازرگانێکی لێزان و سەرکەوتوو لە سەرتاسەری کەناراوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا نیشتەجێ بوون. هەروەها لە بەندەرە بازرگانییەکانی ئیتالیا کۆمەڵێک گروپی گەورەی سووری جێگیر بوون کە بۆ کاسبیکردن و بەدەستهێنانی داهاتی زیاتر روویان لە ناوچەکانیدیکەی ئیمپراتۆری کرد.

ئەم درزەکردنەوەی سوورییەکان بۆ نێو خاکی ئەورووپا، هەتا سەدەی شەشەمی زایینی بەردەوام بوو. ئەوان هەموو جۆرە کالایەکی دەرەکییان هاوردە دەکرد. تەنانەت لەسەردەمی مەسیحییەت، لەسەر ئایینی مەسیحی کاریگەرییان هەبوو. حەشیمەتی مەسیحییەکان بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەژێر کاریگەریی ئایینی سووریاییەکاندا پەرەیستاند.

لەماوەی پێنج سەدەی یەکەمی مەسیحییەت، مەسیحییەکان ترسیان هەبوو کە باسی ئەوە بکەن و بلێن عیسای مەسیح، رزگاریدەری هەموو جیهان، ئەو کەسە بووە کە لە خاچدراوەو لەژێر کاریگەریی سووریاییەکاندابوو کە نەیاندەتوانی بە روونی باسی لە خاچدرانی عیسا بکەن و خاچیش وەک هێمای مسیحییەکان لە قەڵەم بدەن.

باسکردنی جیهانی خواوەندەکان و تاوتوێکردنی جیهان لەنێوان سووریاییەکاندا یەکجار بەهێز بوو. ئەوان لە سەردەمی مەسیحیەتیشدا هاوشێوەی سەردەمی بتپەرستی سەرقاڵی بازرگانیکردن و کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی بوون و لەهەمان کاتیشدا بانگەشەیان بۆ ئایینی مەسیحی دەکرد. هەروەها چەند زانیارییەک لەسەر هۆزە عەرەبە سووریاییەکانیدیکەی سەردەمی ئیمپراتۆری و هەروەها خواوەندەکانیان بەردەستن. فنیقییەکان خواوەندێکیان بەناوی ئادوونیس هەبوو کە لەکاتی کوژرانیدا ژنانی شاری جبیل شین و رۆرۆیان بۆ دەکرد. بەعل مرقووس (خواوەندی هەڵپەرین) لە بەیروت، مەرنە، خواوەندی باران لە غەزە و میوومە بە بەشێک لەو خواوەندانە دادەندرێن، کە هەموو ساڵێک جەژنێکیان بۆ بەرێوە دەبردن .

لەگەڵ ئـەوەی کـە رۆمییـەکان دەسـتیان بەسـەر کـەناراوەکانی سـووریادا گـرت و پەنابـەرە سـووریاییەکان روویـان لـە ئـەورووپا کـرد، خواوەنـدە سـووریاییەکانیش رێیـان کەوتـە ئـەورووپا. هێلێنیسـم یـەکجار بـە کـەمی کاریگـەریی لەسـەر ئـەو ناوچانـە دانـابوو و خواوەنـدە سـەرەتاییەکان بەشێوەیەکی بەرین ستایش دەکران و رمێنیان مابوو. ستایش کردنـی بـەعلی دیمەشـقی، حـەداد هلیپولیسـی بەعلبـەک کـە هـەتا ئێسـتاش ئاسـەواری پەرستگەکەی مـاوەو بـە یـەکێک لـە ئاسـەوارە سەرنجڕاکێشـەکان لـە قەڵـەم ئـەدرێت. هـەروەها بەعلـە (ئیلاهـەی مـن) لـەو بـەری کـەناراوەکانی فـورات وەمەلەک بەعل (فریشتەی بەعل لە پاڵمیر، کە پشتیوانی سـەربازەکان بـوو)، لەرۆم و ناوچەکانیدیکەی ئیمپراتۆری ستایش دەکران.

ئـەم خواوەندانـە سـەرجەمیان لـە ناوەڕۆکـدا خواوەنـدی فـەزایی، یـانی خواوەنـدی هەورەتریشـقە و بـاران بـوون. گرینگتـرین خواوەنـدەکان لـە ویلایەتەکانی رۆمیی ژێر دەسەڵاتی کوماژن لە ئاسیای بچووکدا بوون. بەعل (خواوەند) تەورێکی بەدەستەوەیە، خواوەنـدی بـاران، و لـەرۆم بەخواوەنـدی پشتیوانی سەربازەکان دەناسرێت.

لە سەدەی دوەمی زایینییەوە، کارتێکەریی خواوەنـدە سـووریاییەکان لـە رۆم زیاتر بوو و لە سەدەی سێیەمدا گەیشتە لوتکە. لەو سـەدەیەدا، نیـوەی دیوەخانییـەکانی رۆم سـوریایی بـوون بەتایبـەت دیووەخانـەکانی سـێرووس (٢١١ — ١٩٣ی زایینـی)، خواوەنـدە سـووریەییەکان بـە ئاشـکرا رێزیـان لـێ دەگیردرا و ستایش دەکـران و شـازادە رۆمییـەکان کـە بـە رچەڵـەک سـووری بوون، بانگەشەیان بۆ ئاینی خۆجێی خۆیان دەکرد. لەساڵی ٢١٨ی زایینی، ئمپراتۆر هیلیۆگابالووس کە تەمەنی ١٤ ساڵ بوو و پەیڕەوی لـە خواوەنـدی شـاری ئەمسـا دەکـرد، دەسـەڵات و فـەرمانڕەوایی بـە دەسـتەوە گـرت. ئـەو هەوڵەکانی خۆی خستەگەر کە خواوەندی خۆی بکاتە خواوەندی مەزن و بـێ هاوتای رۆم. نیو سەدە دواتر کاریگەریی هەوڵەکانی هیلیۆهابالووس لە قاڵبی ستایش کردنی (هـەتاوی نەبـەزیو) خـۆی نوانـد و بـە یـەکێک لەپشـتیوانانی

ئیمپــراتۆر لەقەڵــەم درا. ئوورلیــان ئیمپراتــۆری رۆم کــە بانگەشــەی بــۆ ئــەو ئایینــە دەکــرد، پەیکــەری بــەعل و هلیووســی ۸٦ لەپەرســتگەی پــالمیرەوە هێنابووە نێو پەرستگەی نوێی خواوەنـدەکان و وەک هێمـای خواوەنـدەکانی خۆی ستایشی دەکردن.

ئەم ئیمپراتۆرانە پشتیان لە بتپەرستیی کـۆی رۆمییـەکان کـردو پـەرەیان بـە یەکتاپەرسـتیی سـوورییایدا کـە لەسـەر بنـەمای ستایشـکردنی خواوەنـدە سوورییاییەکان گەیشتبووە لوتکە.

هەنووکــە بــا بــزانین ئایینــە ســوورییاییەکان چ بنەمایــەکی هــزری و بیروباوەڕیان هەبوو کە لەسەدەی سێیەمی زایینیدا بەو شێوەیە پەرەیانسـەند و بڵاوبوونەوە. هەر ئەوەندە زانیاری لەبەر دەستن کە پەرسـتنی ئـاو، چیـای بـەرز، بـەرد، کـانی و چۆمـاو وەک بیروبـاوەڕی سـەرەتایی نێـو ئایینـەکان ئەژمار دەکرێن، بەدەست لێنەدراوی مابووەوە، ئـەو بیروبـاوەڕە، تەنانـەت لـە سەردەمی مەسیحییەت و ئیسلامیشدا، رمێنی هەبوو.

گاشە بەردەکان، کە بە بەیتئێل (خانووبەرەی خواوەند) ناودیر کرابـوون، بە شێوەیەکی بەرین ستایش دەکران، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە خواوەنـد لەنێو ئەو گاشە بەردانەدا ژیاوە.

ئافرۆدیــت — عســتارت (عشــترووس) لــە قــاڵبی گاشــە بەردێکــدا کــە شێوەیەکی کەلـلە قەندی هەبوو لەشاری پافووس ستایش دەکرا، و بـەردێکی رەش کە کۆمەڵێک چاڵوچۆڵی پێوەبوو، کۆمەڵێک واتای تایبەتییان بۆ سـەر ئەو چاڵوچۆڵیانەی سەربەردەکە تەرخان کردبوو، کە ئاماژەی بە ئەلگە بەعل دەکرد، کە لە شاری ئەمسای سوورییەوە بردرابووە رۆم.

لەم قۆناغەدا ئاژەڵەکانیش ستایش دەکـران، کـە لەسـەردەمانی دێرینـەوە بەمیرات مابووەوە. زۆربەی خواوەندەکان بەسەر ئاژەڵێکەوە پیشـان ئـەدران. بــەعل ســواری گــا، هاوسەرەکەشــی ســواری شــێر بــووە. لەدەوروبــەری پەرستگەکان کۆمـەڵێک بـاخی پیـرۆز بوونیـان هـەبوو، کـە تیایانـدا ئاژەڵـە کێوییـەکان بـە ئازادانـە دەسـوورانەوە، کـە ئەمـە پەیوەنـدیی بـە سـەردەمی

پەرستنی ئاژەڵە کێوییەکانەوە هەبوو. لەو سەردەمەدا ماسی و کۆتر بایەخێکی تایبەتییان هەبوو. لە عشقلوون (فەڵەستین) هەزاران کۆتر لە دەوروبەری پەرستگە بوونیان هەبووە، بەتایبەت لە پەرستگەی عستار (عشترووس) بوونی کۆتر یەکجار بەرچاو بووە. کۆترەکان پەیوەندییان بە ئیلاهەی ئێڤینەوە هەبوو و بەهێما و سیمبولی ئیلاهەی ئێڤین ئەژمار دەکران، هەروەها ماسی پەیوەندیی بە ئەترگەتیسەوە هەبوو و پێدەچی ئەو لەشێوەی ماسیدا خۆی نواندبێت. لە حەوزو ئاوگیرە بچووکەکاندا پارێزگارییان لەماسی کردووە. کەس نەیدەوێرا دەست بۆ ماسییەکان بەرێت، چونکە ئیلاهە ئەو کەسانەی سەرزەنشت و تەمبێ دەکردو ئەو کەسانەش جەستەیان دەماسی و تووشی شێرپەنجە دەبوون! سەرئەنجام لە بۆنەیەکی تایبەتیی ساڵدا بەبڕیاری یەکێک لەپیاوە ئایینەکانی پەرستگەوە ماسییەکانیان دەخوارد.

جیا لەمانەش هەر هۆزێک، بەعل (خواوەند)ی تایبەت بە خۆی هەبوو کە هەمیشە هاوسەرەکەی لە تەنیشتی داندرابوو. ئەم دوو خواوەندە پارێزەری هۆزەکەی خۆیان بوون و تەنیا کەسانی ئەو هۆزە دەیانتوانی خواوەندەکەی خۆیان ستایش بکەن. چەمکی بەعل بە واتای "گەورەیی" دێت کە ئاماژە بە پەیوەندیی نێوان خواوەند و ئینسانەکان لە نێوان هۆزە سوورییاییەکاندا دەکات. بەعل فەرمانڕەوا بووەو خەڵکیش رەعیەتی ئەوبوون و بەخزمەتکار و کۆیلەی ئەو ئەژمار دەکران. ئەو خواوەندی هۆزەکان و خاوەنی وڵات بوو، لەوێ فەرمانڕەوایی دەکرد. هەڵقووڵینی کانیاوەکان و هەڵزنینی گژوگیا هەمووی لەسەر ویست ئەو بوو. ئەو خواوەندێکی ئاسمانی بوو کە باران بە ئیرادەی ئەو دەباری و هەورە تریشقە بە بڕیاری ئەو لێ ئەدرا. بەعل بە سەرچاوەی دروست بوونی نێرینە و هاوسەرەکەشی بە سەرچاوەی دروست بوونی مێینە دادەندران. هەموو ئاوس بوونێک بە یارمەتیی ئەوان ئەنجام ئەدرا. خەڵکی لەگەڵ ستایش کردنی ئەمانە هاوکات خۆش رایان بواردووە و سێکسیشان کردووە. واتە جندەبازیی پیرۆز لەنێو پەرستگە سوورییاییەکاندا

گشتگیرو باو بووە، بەڵام لەوڵاتی رۆم تەنیا لەنێو پەرستگەی فینیقییە سوورپاییەکاندا ئەو نەریتە باو بووە. مێژووی رێورەسمی بەعل بۆ سەردەمانی کۆنی فەرهەنگی سامی و هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانی غەوارە دەگەڕێتەوە، کە ژنی ناچار دەکرد لەگەڵ کەسێکی بێگانە بخەوێت و دەستی تێکەڵاو بکات.

قوربانیکردنی مرۆڤ لەنێو ئایینە سوورپاییەکاندا باو بووە. ئەم ئایینە بۆ ماوەیەکی یەکجار دوور و درێژ لەنێوان سوورپاییەکاندا بەردەوام بوو. ئەخلاق لەسەر ئەو رێچکە کۆن و نەریتە مابووەوە. داب و نەریتەکانیان بەپێچەوانەی کۆمەڵگەی پێشکەوتووی مرۆڤایەتی بوو، بەڵام ئایینی سوورپاییەکانیش هاوشێوەی ئایینی میسرییەکان توانییان لەگەڵ ئەو دۆخ و سەردەمە نوێیە خۆیان بگونجێنن و دەستبەرداری ئەو رێچکە دەشتەکی و رەمەکییە بن و تەنانەت لە رێورەسمێکی نهێنیدا زانستێکی تایبەتیی کە لە سەرووی نەریتەکانی خۆیانەوە بوو، فێری لایەنگرانی خۆیان دەکرد. نهێنیپارێزی لەنێو سامییەکاندا یەکجار بەهێز بوو. ئەوان لە هاموشۆکردن ترسیان هەبوو. ئەگەر کەسێک، یان شتێک سەرپێچی لەو نەریتە بکردایە دەستبەجێ دەبوو بەبەرد، یان لە کۆمەڵگە و رێورەسمە ئایینییەکان دەردەکرا، چونکە بەکەسێکی گڵاو لەقەڵەم ئەدرا. ئەو کەسە بۆ داماڵینی ئەو ناپاکییە لەخۆی، پێویست بوو غوسڵ لە خۆی دەربکات و کۆمەڵێک نەریتی تایبەتی بەڕێوە ببات. ئەم پاکیی جەستەیە لە ئەنجامدا پاکبوونەوەی رۆحی کەسەکەی بەدواوە دەبوو. تۆبەکردن و خۆ پاککردنەوە لەتاوان کە پێشتر پرسێکی رۆژانەبوو، هەموو خەڵک بەردەوام لەحاڵی داماڵینی سووچ و تاوان لەخۆیان بوون و پێویست بوو هەر کەسێکیش کارێکی نەشیاوی ئەنجامبدایە، دەبوا دەستبەجێ بگەڕایەتەوە سەر دۆخی پێشووتری خۆی. ئەم نەریتە هەر سەردەمەی بەشێوەیەک ئەنجام دراوە، تەنانەت ئەو پیرۆزییەی کە پەیوەندی بە جندەبازیی پیرۆزی نێو پەرستگەکانەوە هەبوو، لە سەردەمانی دواتردا بەشێوەیەک گۆڕانی بەسەردا هات کە دەبوا هیچ

پیاوێک تـوخنی هیچ ژنێـک نەکـەوێت. باوەڕمەنـدی بـە بـەعل و بەعلە ـش، بەهەمان شێوە وەرچەرخانی بەخۆیەوە بینی. بەگشتی ئەم ئایینە لە سووریە بەهۆی کاریگەرییەکانی ئەو دۆخە، کاریگەریی یۆنانی و ڕۆمییەکان و چەندین هۆکاری دیکە کە هێچ زانیارییەک لە چەندی و چۆنییان لەبەر دەستدا نییـە، گۆڕانی بەسەردا هات. تەنانـەت یەکتاپەرسـتیی جوولەکـەکان بـە یـەکێک لـە هۆکاری ئەو وەرچەرخانە لەقەڵەم ئەدرێت .

ڕەنگە کاریگەریی فەرهەنگی بابلییەکان لەسەرجەم ئـەو هۆکارانـە گرنگتـر و بـەرچاوتر بێـت، کـە ڕۆژئـاوای ئاسـیای خسـتەژێر ڕکێفـی خـۆی. خـەڵکی سـووریا زیـاتر لەهـەموو وڵاتـانی ڕۆژئـاوای ئاسـیا، کەوتنـە ژێـر کاریگـەریی فەرهەنگی بابلییەکان، چونکە چەندین لایەنی هاوبەش و هاوشێوەیان پێکەوە هەبوو. تەنانەت پاش ئەوەی لـە سـەردەمی ئەشـکانییەکاندا میزۆپۆتامیـا لـە سووریا جیابووەوە، ئەم پەیوەندییە بەردەوام بوو .

لە ئەسڵدا، بەعل و ستایش کردنـی بـەعل لـە بابلـەوە گەیشـتە پـالمیر و لەوێشەوە بەرەو سووریە ڕۆیشت و دواتـر لـە سەرتاسـەری ئـەو وڵاتـەدا بـڵاو بوویەوە. هاوکات زانستی ئەستێرەناسی لە بابلەوە سەریهەڵدا و لەنێو هەموو ئایینەکانی ئاسیای ڕۆژئاوادا بڵاو بوویـەوە. هـەروەها بـە تێپـەڕبوونی زەمـەن چۆنییەتیی ژیانی پاش مردن لـەنێو ئایینـەکانی سووریەدا گـۆڕانی بەسـەردا هات. ئەگەر کەسووکاری مردووەکە خێر و خێراتیـان نەکردایـە و ئـەو کەسـە مردووە لەو جیهان بەبێ شێو و بە برسیەتی سەری دەنایەوە. مردووەکـە بـە بـەردەوامی پێویسـتی بـە خێـر و خێراتـی کەسـوکارەکەی بـوو. ئـەم ڕوانگـە سەرەتاییە لە کاتێکدا بوو کە هێشتا باوەڕمەندبوون بە جەهەنەم و بەهەشـت لە پەیوەندی لەگەڵ گوناهباری و کاری چاکەدا نـەهاتبووە گـۆڕێ، کـە هـەتا ئێسـتاش لـەڕۆژئاوای ئاسـیا بەشـێوەی بـەرین پـەیڕەو دەکرێـت. ئایینـەکانی سووریا بۆ ڕکەبەری لەگەڵ ئایینی میسری، کە باسی ژیانی ئاسوودەیی پاش مردنی دەکرد، هاوشێوەی ئایینی میهری، کـە باسـی بەهەشـت و جەهەنـەمی دەکرد، بەناچاری گۆڕانێکی بەرچاوی لەخۆیدا پێکهێنا.

ئایینەکانی سووریا لەژێر هەژمونی زانسی ئەستێرەناسیی بابلییەکان، پێیان وابوو ڕۆح لەپاش مەرگ دەچێتە ئاسمان و لە دیوانی خواوەندەکان، کە هەمان هەسارە و ئەستێرەکان بن، ژیان بەسەر دەبات. هەروەها ڕۆح هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، بەهۆی سووڕانەوەی ئەستێرەکان بەیەخسیری دەمێنێتەوە، بەڵام کاتێک کە بەرەو ئاسمان هەڵزنی، لەو یەخسیرییە رزگاری دەبێت و لەگەڵ ئەستێرەکان بە نەمری دەمێنێتەوە. ئەم جۆرە تێڕوانینە لەسەردەمی ئێمپراتۆریدا گشتگیر بووەوەو جیهانی ژێر زەوی بەجەهەنەم ئەژمار دەکرا.

بەعل، خواوەندی هەور و باران، بۆ خواوەندی یەکتا و مەزن گۆڕانی بەسەردا هات، ئەمەش بەهۆی ئەو وەرچەرخانە گشتییەوە بوو کە لە ڕۆژئاوای ئاسیا لەگۆڕێدا بوو کە لە سەردەمی هەخامەنشییەوە لە شارستانییەتی ڕۆژئاوای ئاسیادا گشتگیر ببوو.سووریەییەکان بیرۆکەی خواوەندێک کە نە لەدایک بووە و نە دەشمرێ، بردە یۆنان و ڕۆم. لەوێ بەعل بەخواوەندی جیهان و خواوەندی هەتاهەتایی ناودێرکرا.

**لەئەنجامدا دەکرێ بڵێین ئایینی سوورییایی لە ڕۆم، لەسەر ئەم چەند بناغەیەبووە:**

١ .خواوەندی یەکتا و مەزن.

٢ .هاوسەری خواوەند واتە (بەعلە).

٣ .خۆ پارێز گرتن و داوێن پاکی.

٤ .پاداشتکردن و سزادان.

٥. بەهەشتی بەرین لەجیهانی هەسارەو ئەستێرە ئاسمانییەکاندایە.

٦. جەهەنەمی ژێر زەوی.

٧. گرێدراویی چارەنووسی جیهانیان و بوونەوەرانی سەرزەوی بەسووڕانەوەی هەسارەکان لە هەڵاتن و داچوونی ئەستێرەکان.

## ئێـــــــران

دژایـەتی و بەرەوڕووبوونـەوەی ئێرانییـەکان و ڕۆمییـەکان لـە ڕۆژئـاوای ئاسـیا، بـەرووداوی سـەدەکانی سـەرەتای مەسـیحییەت ئـەژمار دەکرێـت. شارستانییەتی ڕۆمی- یۆنانی و ئێرانی سەرتاسـەری ناوچەکـەیان خستبووە ژێـر ڕکێفـی خۆیانـەوە. بەرەوڕووبوونـەوەی فەرهـەنگ و شارسـتانییەتەکان لەگەڵ یەکتر، دژبە یەکبوون و تێکەڵبوون وەک یەک لەقەڵەم ئەدران. لەیەک کاتدا هەم تێکەڵ بەیەکتر دەبوون، هەم لە یەکتر دوورکەتنەوە لەگۆڕێدابوو. هەنـدێک فاکتـەر وەلا دەنـدرێن و هەنـدێک فاکتـەریش لـە یـەکـەتر بەقـەرز وەردەگرن، هەتا بەتێپەڕبوونی کات هاوئاهەنگییـەک لەنێوانیانـدا دێتـەئاراوە. ڕووبەڕووبوونەوەی ئێرانییەکان و ڕۆمییەکان لە ڕۆژئاوای ئاسیا، بـە بەشێک لە بەرەوڕووبوونەوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەقەڵەم ئەدرێت. سەرەنجام لەو سەردەمەدا فەرهەنگی ڕۆژهەڵات بەسەر ڕۆژئاوادا زاڵ بوو.

دەوڵـەتی ساسـانی لەسـەدەی سـێیەمی زایینـی، لـەئێران دامـەزرا و سیستەمێکی شێلگیر و یەکێتییەکی ئایینی و دەوڵەتیی لەسەرتاسەری وڵاتدا جێگیـر کـردو ئـەم فەرهەنەگـە ئێرانییـەش ڕاسـتەوخۆی کاریگـەریی زیـاتری لەسـەر فەرهـەنگی ڕۆژئـاوای ئاسـیا و ڕۆم دانـا. مشـتومڕی فەرهـەنگی ئێرانییەکان لەگەڵ ڕۆمییەکان لەڕۆژئاوای ئاسیا، لەماوەی ئەو چوارسەد ساڵ دەسەڵاتدارییەی ساسانییەکان، لەئارادا بوو. پاشـان ئـەم ئەرکە بـەرەوڕووی ئیسـلام بـووەوە و ئیسـلامیش تـوانیی هـەتا ڕادەیـەکی زۆر کاریگـەریی ڕۆم لەسەر ئاسیا و ئەفریقا کەمڕەنگ بکاتەوە.

ئەو هەلومەرجـەی کـە ڕۆم لـە ئـەورووپا هـەیبوو، ئێـرانیش لـە ڕۆژئـاوای ئاسیا بە هەمان شێوە بوو. ڕۆم بە تاکە هێـزی کـارای ئـەرووپا دادەنـدرا و تەنیا دەوڵەتەکانی ئەشـکانی و ساسـانیش لـەئێران نەکەوتنـە بـەر هـەژمونی فەرهەنگی هێلێنیسم و ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و توانییان خۆیانی لەبـەر بگـرن و بەپێچەوانەوە کاریگەرییان لەسەریان دانا.

هەر لەسەردەمی هەخامەنشییەکانەوە، نەک تەنیا ئایینی مەزدایی ئێرانییەکان کاریگەریی لەسەر دراوسێکانی خۆی دانابوو، بەڵکو هەتا ئەو کاتیش لە رۆژئاوای ئاسیا، یۆنان و رۆم و باکوری ئەفریقا باسی حکومەتی هەخامەنشی و شێوەی بەڕێوەبردنی وڵات بەشێوەی هەخامەنشییەکان دەکرا، کە جێگەی لەنێو حکوومەتەکانیاندا کردبووەوە. دەوڵەتی پونت، کاپادوکیە (لە بەردەنووسراوە هەخامەنشییەکاندا Katapatuka )و کماژن لەئاسیای بچووک لەژێر هەژمونی فەرهەنگی ئێرانیدا بوون و تەنانەت خانەدانە ئێرانییەکان لەوێ بڕیاردەرو فەرمانڕەوابوون. دەوڵەتی یۆنانی سلووکی کە جێگەی هەخامەنشییەکانی گرتەوە، بە تێپەڕبوونی کات رەنگی رۆژهەڵاتی – ئێرانیی بۆخۆیەوە گرت. تەنانەت بتلمیووسییەکانیش لەمیسر، کە بەسەر بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی ئەفریقای ئیمپراتۆری هەخامەنشییەکاندا فەرمانڕەواییان دەکرد، لەژێر فەرهەنگ و نەریتە ئێرانییەکانی باو لەمیسر و رۆژئاوای ئاسیادا بوون .

دامەزراوەی "Amic Augusti" یەکێک لەو نەریتە ئێرانیانە بوو کە لە رۆژئاوای ئاسیاو میسرەوە گەیشتە رۆم، کە بەمەکۆی دۆستان و راوێژکارانی نزیک فەرمانڕەوا دادەندرا. ئەم مەکۆیە لەبنەڕەتدا نەریتی هەخامەنشییەکان بوو، تەنانەت لەنێو دیوەخانی سلووکی و بتلمووسییەکانیشدا باو بووە. هەڵگرتنی ئاگر لەپێش ئیمپراتۆرەکانی رۆم، وەک نیشانەی هێزی پاشا، یەکێکی دیکە لەو نەریتانە بوو، کە مێژووەکەی بۆ سەردمی داریووش دەگەڕایەوە. سێیەمیش دەکرێ ئاماژە بەسەرەرۆیی و ئیمپراتۆرەکانی رۆم بکرێت، کە لەژێر کاریگەری و هەژمونی پاتشاکانی ئێراندابوو. هەڵبەت پاتشاکانی رۆم، لەپاش مردن، بە خواوەند ئەژمار دەکران، کە پێدەچێ لەژێر تەئسیری میسر و فیرعەونەکانی میسردابوو.

چوارەم، دەتوانین باسی ئەو کەسانە بکەین کە لەکاتی چاوپێکەوتندا تەوقەیان کردووە و یەکتریان ماچ دەکرد، کە ئەم دوو نەریتە لە بنەرەتدا ئێرانی بوون. پێنجەم، پێوستە باسی ئایینی مەزدایی لەرۆژئاوای ئاسیا و

دەوروبەریدا بکەین. باوەڕمەندی بە شەیتان (ئەهریمەن)، هەبوونی دوو ئەسڵی خێر و شەڕ و هەروەها باوەڕمەندی بە جەحەنەم و بەهەشت کە پەیوەندی بە ناپاکی و داوێن پاکییەوە هەبوو، سەرجەمیان لەگەڵ ئاپینی مەزدایی سنوورەکانی ئێرانیان بەزاند و لەنێو ئایینەکانی دیکەی ئەو سەردەمەدا جێگەی خۆیان کردەوە. شەشەم، ئەشێ باسی تەئسیری هزریی ئێرانییەکان لەسەر وەرچەرخانی هزری فەلسەفیی یۆنانییەکان بکرێت. دەگوترێت کە، فیساغورس، دێمۆکریتووس و تەنانەت ئەفلاتوونیش قوتابیی مجووسەکانی ئێران بوون (مجووس بە پەیڕەوانی زەردەشت گوتراوە)، یان لەگەڵ بیروباوەڕی مجووسەکان پەیوەندیی نزیکیان هەبووە. لەگەڵ هاتنی یۆنانییەکان بۆ ئێران، زیاتر لەگەڵ فەرهەنگ و هزری ئێرانی ئاشنابوون و بەچاولێکەریی ئەرستۆ، تاوتوێکردنی بەرهەمە ئێرانییەکان بایەخێکی تایبەتیی پێدرا. زانیاریی ورد لەبەر دەستدایە، بەرهەمێک کە لەژێر ناوی زەردەشت لەنێو پەرتووکخانەی ئەسکەندەرییەدا هەبوو، دوو ملیۆن دێڕی لەخۆ گرتووە. کۆچ و کۆچبەریی ئێرانییەکان بۆ رۆژئاوای ئاسیا، بە یەکێک لەسەرەکیترین هۆکارەکانی بووژانەوەی فەرهەنگی لەو ناوچانە دادەندرێت.

کاتێک ئیمپراتۆریی رۆم گەیشتە ئاسیا و ئەفریقا، لەهەموو شوێنێک پەیوەندییان لەگەڵ فەرهەنگی کۆچبەرە ئێرانییەکان هەبوو، پاش ئەوەی لەگەڵ ئێران بوونە هاوسنوور، ئەم پەیوەندییە قووڵتر بووەوە. تێکهەڵچوونی نێوان رۆمییەکان لەگەڵ خانەدانی میترداتی پونتی، بەیەکەمین پەیوەندیی هزریی ئێرانی لەگەڵ رۆمییەکان دادەندرێت، بەڵام مێژووی پەیوەندیی راستەوخۆی نێوان ئەم دوو هزرە بۆ سەدەی یەکەمی زایینی و سەردەمی تراژان (ئیمپراتۆری رۆم، ٩٨ هەتا ١١٧ی زایینی) دەگەڕێتەوە.

مێژووی کۆنترین نیشانەکانی هەبوونی بیروباوەڕی میهری — مەزدایی ئێرانی لەرۆم، بۆ سەردەمی نرون (یەکێک لە ئیمپراتۆرانی رۆم، ٦٨ ساڵ پێش زایین) دەگەڕێتەوە. ئەو کاریگەرییانە لەو سەردەمەوە و بەردەوام

لەحاڵی پەرەسەندندا بووەو بەرەبەرە بووە ئایینی رۆمی رۆژهەڵات، هەتا کۆتایی سەدەی چوارەمی زیینی لەلوتکەدا مایەوە.

لەکاتی بەهێزبوونی دەسەڵاتی ساسانییەکان، کاریگەری ئایینی ئێرانی لەسەر رۆمییەکان گەیشتە ئەوپەڕی خۆی و رۆم بەرەورووی ناکۆکی و دووبەرەکی بووەوە، کە دەکرێ ئاماژە بە دیوەخانی دیوکلیسین (٣٠٥ هەتا ٢٨٤ی زایینی) بکرێت. ئەو بە هاوتای خواوەند ئەژمار دەکرا و لەنێو دیوەخانەکەیدا کۆمەڵێک پیاوی نێرەمۆکی لێ بوون و کەسانی نێو دەربار سوژدەیان بۆ ئیمپراتۆر دەبرد و ئەویش بەو پەڕی سەرەڕۆییەوە فەرمانڕەوایی دەکرد. ئەمەش هەمان نەریتی نێو دیوەخان و فەرمانڕەوایی لە سەردەمی ساسانییەکاندا بوو. ئیمپراتۆر گاکریووس (٣٠٥ هەتا ٣١١ی زایینی) رایگەیاند کە شێوەی فەرمانڕەوایی ئێرانی دەبێ لە ئیمپراتۆریدا پەیڕەو بکریت. پاتشا هەڵبژێردراوەکانی رۆم باویان نەمابوو تەنەنات لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا رێبازی هونەریی ئێرانییەکان کاریگەریی قووڵی لەسەر یۆنان و بەشی رۆژئاوای ئاسیا دانابوو. بەم پێیە دەبینین فەرهەنگی ئێرانییەکان نەک تەنیا کاریگەریی لەسەر پێکهاتەی سیاسی – کۆمەڵایەتیی رۆمییەکان دانابوو، بەڵکو تەئسیری راستەوخۆی لەسەر بیروباوەڕی ئەوانیش دانا. سەرئەنجام دیووکلسین بەشێوەی فەرمی ئیزەدمیهر(میترە)ی وەک پشتیوانی ئیمپراتۆرییەکەی خۆی لەقەڵەمدا. لەو کاتەدا ئایینی میهر، هەموو جیهانی، لەسنوورەکانی سێندەوە هەتا سنووری چۆمەکانی سەیحوون و جەیحوون و لەوێشەوە هەتا ئۆقیانووسی ئەتڵەسی خستبووە ژێر رکێفی خۆیەوە. ئایینی میهر لەهەر دوو وڵاتی ئێران و رۆم، بەخۆشناوترین ئایین ئەژمار دەکرا. هەر چەندە لەو کاتەدا ئەهوورامەزدا ( = ژووپیتێر) لەنێو جیهانی خواوەندە مەزداییەکاندا جێگە و پێگەیەکی تایبەتیی هەبوو. پێدەچێ ئایینی میهر لەئاسیای بچووکەوە روویکردبێتە ئەورووپا و دەوڵەتەکانی ئێران لەئاسیای بچووک بەڵگەی سەرلمێنەری ئەم راستییەن. پاتشا و جوامێرانی وڵاتانی ئاسیای بچوک، خواوەند و ئایینی میهریان

بەپشتیوانی هێزی خۆیان ئەژمار دەکرد. دواتر ئەم بیروباوەڕە گەیشتە ڕۆم و وەک خواوەندی هێزە جەنگاوەرەکان لەقەڵەم درا.

لەپەنا دەوڵەتانی ئێرانی لەڕۆژئاوای ئاسیا، بەتایبەت لە ئاسیای بچووک، مووبدە ئێرانییەکان (پیاوە ئاینییەکانی زەردەشت) کە ئەرکە ئاینییەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد، لەو ناوچە کۆچبەرنشینانەدا نیشتەجێبوون، کە بە مۆغ، یان هەڵگیرسێنەری ئاگر ناودێر کراون. ئەو پیاوە ئاینییە زەردەشتییانە پارێزگارییان لەنەریتی کۆنی خۆیان کردووە، کە لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خۆیاندا ناوبانگێکی تایبەتییان هەبووەو هەر ئەو ئەرکەیان بەڕێوەبردووە، کە پەیڕەوانی ئاینی مەزدایی لە ئێران بەڕێوەیان بردووە. هەمان ئەو نزاکردنە لەبەردەم ئاگردانەکاندا ئەنجام ئەدرا، لەحاڵێکدا کە مووبدەکان چەند لقێک گوڵی (بەرەسەم)یان بە دەستەوە بوو، هەمان خواردنەوەی تێکەڵکراوی شیر، ڕۆن و هەنگوینیان خواردۆتەوە، بەهەمان شێوە بەپەنچکێک پەڕۆ بەناوی (پەنام) زاری خۆیان گرێداوە، کە هەناسەکەیان ئاگرەکە پیس نەکات.

هاوکات ئەهوورامەزداو خواوەندەکانیدیکەش ستایش دەکران. ئەهوورا مەزدا لەسەروو هەموو خواوەندەکانەوە بوو، دواتر ئەمشاسپەنتان (حەوت فریشتەی پیرۆزی ئاینی زەردەشتی) بەپلەی دووەم دادەندران، پاشان خواوەندەکانیدیکە لەپلەی سێیەمدا دەهاتن. ئیزەد میهر لە هەموو خواوەندەکان گرینگتر بووەو قوربانییەکی یەکجار زۆری بۆ کراوە. زمانی ئەو کۆچبەرانە لەئاسیای بچووک، زمانی ئارامی بوو.

ئاینی میهر کاتێک کە گەیشتە ڕۆم، تەنیا ئاینێکی ئێرانی نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی قووڵ کەوتبووە ژێر کاریگەریی میزۆپۆتامیا. خواوەندە ئێرانی و میزۆپۆتامیاییەکان، چەندین لایەنی هاوشێوەیان هەبوو. یاسای ئەستێرەناسیی بابلی لەئێران ڕمێنی باشی هەبوو. ئەهوورامەزدا کەوتبووە ژێر کاریگەریی بەعل، ئاناهیتا لەگەڵ ئیشتر وێکچووی یەکتربوون و میهریش ئاوێتەی کۆمەڵی مەردۆک (مەردۆخ) ـ شەمش (بەعل) ببوو. ئەهوورامەزدا لەڕۆم بە "هەتاوی نەبەزیو" ناودێر کرابوو. بەهۆی تێکەڵبوونی فەرهەنگی ئێرانی، یۆنانی و خۆجێیی لەنێو کۆماژن ( = بنەماڵەی یۆنانی ـ ئێرانی)

بووه کە پاش سەردەمی هەخامەنشییەکان، لەسەر بەشێک لەناوچەکانی ئەنادۆڵدا فەرمانڕەوایان کردووە، بەعل بەشێوەی سوارچاکێکی تەور بەدەست نیشاندراوە، ئەهوورامەزداو زێئووسیان لە یەکتر جیا نەکردووەتەوەو بە زێئووس — ئوورمزدس ناودێرکراوە، کە لەئاسمانەکاندا ژیاوە. ژووپێتێری مەزن، لە ئایینی میهری رۆمیدا، بە هاوشانی و خواوەندی مەزنی ئایینی میهر دادەندرا. لەهەموو ویلایەتەکانی رۆمدا پەرستگەی ژووپیتێر (ئەهوورامەزدا و میهر لە تەنیشت یەک) بوون. یۆنانییەکان ناوی رۆمییان بۆ ناوی خواوەندە ئێرانییەکان دۆزییەوەو تەنانەت هەندێک نەریتی ئایینیی خۆیان تێکەڵ بەئایینی میهر کرد، بەگشتی ئایینی میهری بە نیسبەت ئایینەکانیدیکەی ئاسیای رۆژئاوا، زۆر بەکەمی تەئسیری لەرێبازی هێلێنیسم وەرگرت و بەم هۆیەوە لەلایەن یۆنانییەکانەوە سەرنجێکی ئەوتۆی پێنەدرا، بەڵام رۆمییەکان راستەوخۆ روویان لە ئایینی میهر کرد .

ئایینی میهری زیاتر لەرێگەی ئەو سەربازانەی کە لەسنوورەکانی نێوان ئێران و رۆم سەرقاڵی سەربازیکردن بوون، لە رۆمدا بڵاوبووەوەو بەرەو دانووب و راین، سنوورەکانی سکۆتلەندو باکووری ئەفریقا رەگاژۆی کرد.

لەلایەکیدیکەوە ئایینی میهری، لەرێگەی دیلەکانی شەڕەوە، کە وەک کۆیلە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا، گەیشتە رۆم و بەهۆی ئەوەی کە ئێران دوایین وڵاتی رۆژهەڵاتی بوو کە رۆم پەیوەندی لەگەڵی هەبوو، بەهەمان شێوە ئایینی میهری ـ مەزداییش دوایین ئایین بوو، کە لەرۆژهەڵاتەوە بۆ نێو رۆم، رەگاژۆی کرد.

رێورەسم و نەریتەکانی ئایینی میهری لەنێو ئەشکەوت و شوێنە تاریکەکاندا بەرێوەدەچوو. پەیڕەوانی ئەو ئایینە لە میوانییەکی ئایینیدا لەسەر یەک سفرە دادەنیشتن. یەک جۆر غوسڵکردن لەنێویاندا باو بوو، کە بە شۆردنی لەش و جەستەی خۆیان، تاوانەکانی رۆحیان پاکدەکردەوە. لەیەکێک لەئایینەکاندا مانگایەکیان سەردەبڕی و پێیان وابوو ئەو مانگایە کەسانی مردوو، گەنج و جوان دەکاتەوە. زۆربەی نەریتەکانی وەک غوسڵ، دانیشتن لەسەر یەک سەفرەو سەربڕینی مانگا، لەنێو ئایینەکانیدیکەی

ڕۆژئاواشـدا بـاو بـووه، بـەڵام ئـەوەی لـە ئـایینی میهـر و ئایینەکانیدیکـەی ئێرانەوە بۆ نێو ئایینەکانی ئاسیای ڕۆژئاوا ڕەگـازۆی کـرد، دووفاقـەیی بـوو. لەکاتێکدا ئـەم حاڵەتـە لـەنێو ئایینـەکانی دیکـەی ڕۆژئـاوای ئاسـیادا بـوونی نـەبوو، ئـەم ئایینـە ڕوانینێکـی نـوێی بـۆ جیهـان هـەبوو و ئامـانجێکی نـوێی بەژیان ئەبەخشی.

لەنێو فەلسەفەی یۆنانییەکانـدا، عەقڵانییـەت و ئیلهـام لەهەمبـەر مـادە و ڕۆحدا خاوەن پێشینەیەکی دوورو درێژ بوون، بەڵام خێر و شەڕ دیاردەیـەکی نوێ بوون. لە ئایینی میهریدا، ڕێـز لەو دوو ئەسڵە گیراوە، کەبە دوو ئەسڵی ڕاستەقینەی جیهان دانراون. یەکـەم، لەبـەر پیرۆزیـی (خێـر)، پاشـان لەبـەر بەڵاگێڕەوەی لەهەمبەر شەڕدا بووە. خێر واتـای ئوورمـەزد (ئـەهوورا مـەزدا)، شـەڕ واتـای ئەهریمـەن ( ئـەنگرە مئینـوو = لـەئایینی زەردەشـتیدا یـانی سەرچاوەی ناپاکی) بووە.

لـەپاش ئـەهوورا مـەزدا، ئەمشاسپەنتان، دواتـریش خواوەنـدەکان، یـان فریشتەکان بە پلەکانی دواتر ئەژمار دەکران. لەهەمبەریشدا دێوەکان بوونیان هەبوو، کە لەنزیک زەوی دەژیان و هـەموو خراپەکارییـەکیان دەکـرد، هـەموو دەردو بەڵایەک، هەواو هەس و سـووچ و تاوانێـک، بەرهـەمی کـاری دێوەکـان بوو، ئەم بیروباوەڕە هەتا ئێستاش لەنێو کوردە ئێزەدییەکاندا ماوەتەوە.

گومانی تێدا نییە شەیتانی نێو ئایینی مەسیحی پەیوەندیی بەئەهریمـەنی ئێرانییەکانـەوە هەیـەو ئیلهـامی لـەو وەرگرتـووە. ئـایینی میهـری لەسـەر دوو بنـەمای تایبـەت، گرینگیـی بـە ئـەخلاق داوە. خێـرو شـەڕ لـەنێو دەروونـی ئینساندا بەچاکە و خراپە دەگۆڕدران. پەیڕەوانی ئایینی میهر، کـە هیوایـەتی گەیشتن بە بەهەشتیان هەبوو، هـەموو تەمـەنی خۆیـان تـەرخانی پاڕانـەوە و نزاکـردن دەکـرد و ئـەخلاق بەمەسـەلەیەکی بنـەڕەتی لـەژیانی ئـایینی ئـەوان ئەژمار دەکرا.

لەخۆڕا نەبووە کـە تـەنیا ئێرانـی و ڕۆمییـەکان توانیویانـە ئیمپراتۆریـەتی مـەزن و بـەربڵاو دابمـەزرێنن. ئـەم دوو هـۆزە پابەنـدی بـەها ئـەخلاقی و ئینسـانییەکان بـوون و هاوکـات بەڕێوەبەرایەتییـەکی شـیاویان هـەبووە، لەکاتێکدا هیچکام لەهۆزەکانیدیکـە وتەنانـەت یۆنانییـەکانیش ڕەچـاوی ئـەم خاڵانەیان نەکردووە.

میهر خواوەندی راستی و دادپەروەر، خواوەندێکی جیدی بووە. خەڵک، لەئایینی میهریدا، بەهزری خواپەرستی و گیانبازی پەروەردە کراون. هەموو پەیڕەوانی ئایینی میهر بەبراو کەسوکاری یەکتر ئەژمار دەکران. تاقیکردنەوەیەکی دژوار لەسەر ئەم جیهانە لەئارادابووە و ئینسانەکان دەبوا بە داوێن پاکی و خۆپارێزی لە سووچ و خراپە، لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتوو بێنە دەرێ.

هاوسەرگیریی خواوەندەکان، پرسێکی دیکەبوو کە لەنێوان ئایینی میهری و ئایینەکانیدیکەدا کێشەی دەخولقاند. لەهەموو ئایینەکانی ئاسیای رۆژئاوا، میسر و یۆنان، خواوەندەکان لەگەڵ یەکتردا هاوسەرگیرییان کردووەو پەیوەندیی سۆزدارییان بەیەکەوە هەبووە، بەڵام لەئایینی میهردا، هاوشێوەی ئایینە مەزداییەکان، هاوسەرگیرییەک لەگۆڕێدا نەبوو، ئەمەش نیشانەی کامڵبوونی خواوەندەکان بووە، کە جیهانی خواوەندەکانی لەگەڵ جیهانی ئینسان جیاکردۆتەوە.

مەسەلەیەکیدیکە بەهەشت و جەهەنەمی ئێرانییەکان بووە، کە سەرئەنجام لەنێو سەرجەم ئایینەکاندا گشتگیر بوو. لەهەموو ئایینەکانی دیکەی جیهاندا، مردووەکان شوێنیان ژێر زەوی بووە. لەبەهەشتی سراپیسی میسر، رۆح لەژێر زەویدا ژیاوەو لەنێو ئایینەکانی ئاسیای بچووکیش، وەک ئایینی جوولەکەکان، بەهەمان شێوەبوو، بەڵام ئایینی میهری لەژێر تەئسیری زانستی ئەستێرەناسیدا، لەو باوەڕەدابوو کە بەهەشت لەوپەڕی رووناکییەکانی ئاسماندایە. ئەگەر ئینسان کاری چاکە بکات، رۆحی ئەو ئینسانە، لەماوەی چەند قۆناغدا، کە هەتا دەگاتە بەهەشت، لەخراپەکاری و تاوان پاکدەبێتەوەو بەنێو ئەستێرەکاندا تێدەپەڕێ، سەرئەنجام دەگاتە بەهەشت و چیدیکە تووشی چارەنووسی رەشنابێتەوە. لەکۆتایی جیهاندا، جەستەی ئینسانیش، ئەم رەوتە تێپەڕ دەکات و ئینسان بۆ هەتاهەتایە، بەبەختەوەری دەمێنێتەوە.

ئەم ئایینە روانگەیەکی نوێی خستە بەردەم رۆمییەکان و بەنیسبەت ئایینەکانی پێشووتری ئاسیایی و میسری، یەکجار پێشکەوتووتر بووە.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

1. Sophists

٢ : Cynics. وشەیەکی یۆنانییە "Kynikos" بەواتای "هاوشێوەی سەگ" دێت Kyon و Kyons ، سەگ.

٣ Hellēnios : Hellenic .یان ، Helen کە لەبنەڕەتدا ناوی کوڕی Deucalin، نوحی یۆنای، بووە.

4. barbarous

٥ : Stoics. یۆنانیStōikos ، لە وشەی Stoa بەواتای "بەر هەیوان".

6. Cosmopolitan

7. Logos

8. Hellenism

9. Zeno

١٠) : Plotinus. ٢٠٥ – ٢٧٠، زایینی فەیلەسووفی نوێ ئەفلاتوونی ڕۆمی و بەرەگەز میسری. لەو پەیوەندییەدا چاو لە: کارل یاسپرس، فلوتین، وەرگێڕانی محەممەد حوسێن لوتفی، تاران، خارەزمی، چاپی ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی، بکەن.

11. Neo – Platonism

12. Augustus

١٢ : Serf. کرێکار، یان ڕەعیەتی مشەخۆر.

14. Etruscan

١٥ : Carthage. شارێکی دێرینی فینیقی لە باکووری ئەفریقاو لە کەناراوەکانی مەدیتەرانە.

16. Octavian

17. Byzantium

18. Constantinople

19. Phrygia

20. Pessinus

21. Ida

22. Magna Mater Deum Ida

23. Hannibal

٢٤ : Sibyls .سیبول بەو پیاوە ئایینیانە دەگوترێت، کە لەرۆم و یۆنان پێشگۆییان دەکرد. بە لاتینی Sibyllya : ئەم وشەیە لەگەڵ ناوی ئیلاهەی ئاسیای بچووک، واتە Cybole جیاوازییەکی یەکجار زۆریان هەیە.

25. Palafîn

26. Cybele

27. Berecyntus

٢٨ Attis . خواوەندی زاوزێ و لە ئەفسانە فریجییەکاندا بەهاوسەری Cybele دادەندرێت.

29. Papas

٣٠ : Thraee . بەشێک لە باشووری شێوە دوورگەی باڵکان.

٣١ : Dionysus .خواوەندی گژوگیا و شەراب، هاوشانی باکووسی رۆمییەکان.

32. Coalli

33. Metragyrtes

34. Renunehism

35. Fetichism

36. Magalensia

37. Pontus

٣٨ : Hierodulus .تێکەڵێک لە hier یانhiero ، سەرچاوەی یۆنانییەکەی Hierosبە مانای "پیرۆز"، و "dulus" و سەرچاوەکەیdoulos ، لەیۆنانیدا مانای کۆیلەی هەیە.

39. Taurus

40. Bellona

41. Sulla

٤٢ archi : archigalli .یان arch لە زمانی یۆنانیدا دوو واتای "سەرۆک، مەزن" و "کۆن، سەرەتایی" هەبوو، بەڵام لێرە بەواتای سەرۆک، یان مەزن دێت، واتە سەرۆکی گالییەکان.

43. Claudins

44. Caligula

٤٥ : Isis .خاتوونی میسری، هاوسەرو خوشکی ئۆزیریس، دایکی هورووس، ئەو لەشی کوت کوتکراوی مێردەکەی خۆی، ئۆزیریس، کۆدەکاتەوە.

46. Cannophori

47. Pallephori

48. Dandrophori

49. Hilaria

50. Almo

51. Hypsistos

52. Omnipotentes par exeellenee

53. Mystic

٥٤ : taurobalium .بەمانای زەوتکردنی گا، هەروەها بە مانای "کەمەند"یش دێت.

55. Henotheism

٥٦ : Adonis .لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، خواوەندێکی گەنج و جوانە کە ئافرودیت ئاشقی سەوداسەری ئەو بووە. ئەو لەئەسڵدا خواوەندی فینیقی بووە.

٥٧ : Bachus .لە ئەفسانە رۆمییەکاندا خواوەندی شەراب بووە.

٥٨ : Osiris .لە ئەفسانە میسرییەکاندا خواوەندی جیهانی مردووەکان بووە.

59. Polymorphous

60. Panthes

61. Isis, Serapis

62. Soter

63. Osiris – Apis

٦٤ :Demeter .لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، خاتوونە خواوەندی وەرزێری، زاوزێ و هاوسەرگیری بووە. هێندێک جار لەگەڵ سرس، خاتوونە خواوەندی رۆمی لێک جیا نەکراونەتەوە.

٦٥ : Harpoctaes .هورووس یەکێکیدیکە لە ناوەکانی بووە.

66. Anubis

67. Pozzouli

68. Eros

69. Atargatis

70. Astarte

71. Hirapolis

72. Chaldaei

٧٣ :Byblos .بەندەرێکە لە لوبنان، یەکێک لەکۆنترین شارەکانی جیهان.

74. Balmarcodes

75. Marna

76. Maiuma

77. Jupiter Damascenus

78. Hadad
79. Baltis
80. Malakbel
81. Severus
82. Heilog abalus
83. Emesa
84. Sol invietus
85. Aurelin
٨٦ : Helions .خواوەندی هەتاو.
87. Paphos
88. Elagabal
89. Exogabal
90. Diocletian
91. Galerius
92. Magousaioi
93. Sol Inuictus
94. Zeus – Oromasdes
95. Jupiter Caelus

## سەرچاوەکان


محەممەد عەلی فرووغی، رەوتی فەلسەفە لەئەورووپا، چاپی تاران سالی ١٣٣٢ی هەتاوی.

برتاند راسل، مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوا، وەرگێرانی نەجەف دەریابەندەری، چاپی پێنجەم، تاران سالی ١٣٥٥ی هەتاوی.

Franz Cumont, The Orintal Religions in Roman Paganism, New York 1956.

Hans Jonas, The Gnostic Religion, Boston 1963.

# ئایینە ئاسیاییەکان

بۆ خوێندنەوەی بەرهەمە کۆنە ئایینییەکان پێویستە ئەم خاڵە لەبەرچاو بگیردرێت، کە ناکرێ بە چەشنی بیرکرنەوەی ئینسانی ئەمڕۆوە، چۆنیەتیی بیرۆکەی ئایینیی سەردەمانی کۆن بناسینەوە. چونکە دەبێ بۆ ئەم مەبەستە خۆمان بێنینە سەر شێوەی بیرکردنەوە و ژیان ئەو سەردەمە و تایبەتمەندیی ئەو سەردەمە بناسین.

هەرچەند ئێستاش زۆر کەس هەن کە دەتوانن وەك سەردەمانی کۆن بیر بکەنەوە، لە هەمان کاتیشدا ناتوانن پرسە هەنووکەییەکانی دەورووبەری خۆیان لەم سەردەمەدا تاوتوێ بکەن، چونکە دەستیان بە ئامراز و بنەما زانستی و عەقڵانییەکانی سەردەم ڕاناگات. کەوابوو هیچکات بە بەرچاوتەنگیی زانستییەوە ناتوانین بنیاتی عەقڵی و تیگەیشتنی سەردەمانی ڕابردووی مرۆڤایەتی بناسین و بە هەمان شێوەش بە بەرچاوتەنگیی ئایینیشەوە ناکرێ شێوەی ژیان و عەقڵییەتی ئەمڕۆیی بناسرێت. بە دڵنیاییەوە بەرچاوتەنگی لە زانستدا تەنیا بە واتای ناشیرین کردنی زانستە، دەنا لە زانستی ڕاستەقینەدا بەرچاوتەنگی مانایەکی نییە.

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی مێژوویی جەمیل ڕۆژبەیانی ٢٠١٥
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسوڵ) چاپکراوە